پرۆفیسۆر دکتۆرناووک. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ



# بەشێک لە یاداشتەکانم

(بەرگی یەکەم)








ناوی کتێب، بەشێك لە یادداشتەکانم
نووسینی. پ. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ
بابەت، یادداشتنامە
بەڕێوەبەری هونەری، شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەر، جەمال حسێن
بەرگ، قادر میرخان
سەرپەرشتیاری چاپ، فەرهاد رەفیق
تیراژ، ٧٥٠ دانە
نرخ، ٣٥٠٠ دینار
ژمارەی سپاردن، ٢٠٧ ی ٢٠٠٥
چاپی ، یەکەم ساڵی ٢٠٠٦
چاپ، دەزگای حەمدی
کوردستان -سلێمانی
www.sardam.info

# بەشێك

# لە یادداشتەكانم

پ. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ

سلێمانی ٢٠٠٦

# بەشێك لە یادداشتەکانم

بۆ دڵبەرێ رەعنا لە حەرەمخانەیی نەسرار

خۆی و قەڵەمی ماوە (حەریق) ئێستێ بە مەحرەم

حەریق

لە بەیانی ڕۆژی ٣ی نیسانی ١٩٩١ پاش شەوو ڕۆژێکی سەختو پڕ لە ئەندێشەو ئازاری مێژووی کورد، کە منو خێزانو منداڵەکانیشم بەشێکی گەورەیمان پێ بڕا، یا خێزانێك بووین لەو هەزارەها خێزانە کوردە ئاوارانەی بەشێکمان پێ بڕا. ئەو بەیانی‌یە لە گوندی (قەسڵان)ی ئەوبەری سیروان لە خەو هەستامو ووتم با ئەمڕۆ دەست پێ بکەم.

کە دەستم دایە قەڵەم دێڕێکی شوومی، ڕەش بین هاتە سەرکاغەز:

کوردە پیرۆزت نەبێت وا ئاش بەتاڵی تازەیە.

خێرا قەڵەمم دانایەوەو هیچی ترم نەنووسی، شەرمم لە خۆم دەکرد کە قەڵەمێك نزیکەی ٤٥ ساڵە لە گەشبینیو ووشەی پڕ لە هیواو باوەڕ بەولاوە هیچی تری نەنووسیوە، یەکەم دێڕی گەشتنامەی ژیانی پانی خاوەنی بەو چەشنە دەست پێبکات. کە تینم دایە خۆم لە دەروونو لەشی بیمارەوە گەشەو بریسکەی هیواکەی جاران تینی بە خامە نەئەدا ووتم: بێدەنگ بم باشە.

وا ئەمڕۆ ١٩٩١/٦/١٣ پاش گەشتێکی درێژی پڕ لە یادگاری حەفتا ڕۆژە، لە گوندی (بۆڵێ) هەر لەژێر سایەو سێبەری ئەو برایانەدا کە چەند شەوێ لە (قەسڵان) داڵدەیان داینو لە مەترسی پاراستیاذین[1] دەست دەکەمەوە بە نووسینو دەڵێم: پیرۆزت بێ کوردە، ئاشبەتاڵ نەبوو، نەخشەدار بێ یا بێ نەخشە ڕووداوو تەجروبەیەکی تازە بوو کە تا ئێستا بۆ کورد بە خێر گەڕاوەو هیواداریین ئەوەندە ووردو زیرەكو یەکگرتووبین کە هەر بەخێری بگێڕینو لاپەڕەی تازەی گەشی سەرکەوتنو دەسەڵاتی پێ بنووسین.

---

١-گەلێك یەیکەر لە دڵمدایە. بۆ ڕۆژانی قەسڵان یەیکەری شەهید مەنسووری فەتتاحیو یەکێك لە یەیکەرەکانی شەهید غەفووری هەمزەیی هەر لە دڵدانو لە ڕێڕەوی ئەو گەشتەدا باسیان دێتە سەر.

کەواتە با بێینەوە سەر سەرەتای ئەم گەشتەو ڕووداوی ئەم حەفتا ڕۆژەو دواییەکانی بخەمە خانەی دووابەدووا هاتنی خۆیەوە. کە ئەم نووسینەش بوو بە کتێب نازانم بەرگی چەندەم بەر ئەو حەفتا ڕۆژە گرنگە دەبڕێ.

## بۆچی ئەم گەشتی ژیانە دەنووسم؛

بە ووتەی خەڵك بیری تیژ، یا خۆم بڵێم شت لە بیر مان یەکێك بوون لەو خاسیەتانەی هانی زۆر کەسیان دەدا کە هانم بدەن بۆ تۆماری ناوەو ڕووداوی ژیانی تایبەتیو گشتی. بە مەبەستی بلاوکردنەوەی ڕیزە ووتارێك لەو بارەیەوە لە ڕۆژنامەیەکی عەرەبیی بەغدادا (العراق) دەستم دایە نووسین.

بەڵام من ووتاری یەکەمم تەواو نەکردبوو بیستم سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامەیە (١٩٨٣) کە فڕی بەسەر هەچ شتێکەوە بووبێ بەسەر کوردییەوە نەبووە، ووتبووی ئەو ناوە —واتا ناوی من- بە خراپ نەبێ لەم ڕۆژنامەیەدا نایەت. منیش لە نووسین سارد بوومەوە. چونکە بەزەییم بە گەلێك نووسینی بێ نازی خۆمو باوکمدا دەهاتەوە کە یان لە بەر باری سیاسی، یا لەبەر بێ دەرامەتی، هەر چاپ نەکرانو هەمیشە لەبەر مەترسیی فەوتاندان. بەڵام تاقە کەڵکی ئەو دەست بە نووسین کردنە ئەوە بوو کە تا ئێستا یەکەم دێڕیم لەبیرە، کە هەر ناوەڕۆکی ئەو دێڕە خۆی دەبێتە بیانووی یادداشت نووسین.

لەوێدا بە عەرەبی نووسیبووم:

(لم اكن على راس الحوادث، ولم اكن على هامشها، بل كنت في خضمها). واتە: من سەرکردەی ئەو ڕووداوانە نەبوومو لە کەنارێشدا نەبووم، بەڵکو لەناو جەرگەیدا بووم.

بەڵێ- تا ئێستا لەناو جەرگەی ڕووداوەکانی ژیانوووڵاتدام. سامانێکی کۆنی یادگاری تایبەتیو گشتی لام کۆبوونەتەوە، کە ڕەنگە تۆمارکردنیان سوودێك ببەخشێو لەناوچوونیان هەندێ لایەن بە تاریکی بهێڵێتەوە.

زۆرجار ئەوانەی سەردارو سەرکردەن بە باوەڕەوە یادداشت دەنووسنەوە خەڵکیش تەواو باوەڕیان پێ دەکەن.

زۆرجاریش کەسانێکی کە لە کەناری مەسەلەدا بوون بۆیان دەلوێ بنووسن‌و بڵاوبکەنەوەو ئەگەر نووسینەکانیان ڕاستیش نەبن، یا قووڵ نەبن، ئەوە هەر هەندێ کەس دەیانکەن بە بەڵگە. بەڵام ئایا کەسێك بە بچووکی‌و بەشداری لەناو جەرگەی کارو ژیاندا بووبێ، ناتوانێ شتێکی تر ببەخشێ هەندێ لایەن ڕوون بکاتەوە؟ ئەمە مەبەست‌و هیوامەو ناشزانم پێی دەگەم یانا؟

## منداڵی:

کە ئەم گەشتە یادداشتی تایبەتی‌و گشتی بێ دەبێ وەك زۆربەی یادداشت نووسان لە باسی لەدایکبوون‌و منداڵی‌یەوە دەست پێ بکەم‌و بڵێم نازانم کەی لەدایك بووم؟

جارێك شەڕی ئەوەم پێ فرۆشرابوو کە چۆن نازانم باوکم کەی لەدایکبووە —بەڵام بۆ خۆشم بە ڕاستی هەر ئەوەندە دەزانم کە لە دەفتەری نفووسەکەمدا نووسراوە لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٤. کە بە کتێبەکانی باوکمدا گەڕام لە شوێنێکدا نووسیبووی ٢٢ی ذیلقەعدەی ١٣٥٣ کە ئەمەیان بە پێی بەراوردەکەی ئۆربیللی کۆتایی شوباتی ١٩٣٥ دەکات.

لە کتێبێکدا ئەمەی دووایی‌یم نووسیبوو، بەڵام نووسیبووشم ساڵی ١٩٥٠-١٩٥١ خوێندنی ئامادەیی‌یم لە سلێمانی تەواوکردووە، مامۆستای گەورە برایم ئەحمەد بە ئامۆزای جوانەمەرگم فوئادی ووتبوو:

پێی بڵێ — یا نەنووسێ ١٩٣٥ لەدایکبووم یا ئەو ساڵی ئامادەیی تەواوکردنە نەنووسێ. چونکە بەو پێیە دەبێ بە ٤-٥ ساڵی چووبێتە قوتابخانە. بە قسەم کرد، هەرچەند خۆ هەر بە ڕەسمیش ساڵی ١٩٣٩-١٩٤٠ لە قوتابخانە وەرگیراوم‌و وەکو لەمەودووا دێمە سەر باسکردنی ئەو وەرگرتنە زووە خاترانەیەکی

پیاوانەی تێدا بووە. لەبەر ئەو دەفتەرەوەو وەك منیش بۆ شەڕ فرۆشتن یا تورەکردن (بەرق) لە جێی (بەرد) هاویشتن نووسیم- چونکە ساڵی ١٩٢٤ یا ڕۆژی ١٩٢٤/٣/٢١ ڕۆژی یادگارێکی پیرۆزە لام ئەوا ساڵی ١٩٣٤م بە ساڵی لەدایکبوونم جێگیر بوو[٢].

لە گەڕەکی دەرگەزێنی شاری سلێمانی لەدایکبووم وەك کە گەورە بووم بیستم، ئەو دەمەی منیان بووە باوکم هەر مەلای گەڕەك بووە، خانووی خۆی نەبووە ئەم ژوور یان ئەو ژووری چەندماڵێکی گەڕەکی بە کرێ گرتووە. من کە سێیەم منداڵی باوکمو چوارەم منداڵی دایکمم لە کاتێکدا بووم کە حاڵیان کەمێك باشتر بووە. ئەو سەردەمە دوو ژووریان لە حەوشەی ماڵی وەستا ساڵحی ناڵبەندا گرتووە، کە خانووەکەیان بە بیرەوەری منیش دوو حەوشەی جیای هەبوو، ئەو جێگەیەی ئێمە دوو ژووری سەر حەوشەی یەکەم بووە- کە دوایی بەرجادە کەوتووەو ئێستا ڕێك بەشێکە لە شەقامی (نالی).

کە من هۆشم کردەوە باوکم هەر بە مەلایەتییەوە خەریکبوو، لایەنی تەسەوفە پێشووەکەی دابووە سەر لایەنی بیرو خوێندنەوەی کتێبی هەمەڕەنگی (تەسەوف)، هەرچەندە بە ڕاستی هەمەڕەنگ شتی تریشی دەخوێندەوە. کە گەورەتر بووم لەوە گەیشتم کە چونکە من لەدایکبووی ئەو سەردەمەی ژیانی بووم، لەبەرە ئەوە بە ناوی (عز بن عبدالسلام) یا (عزالدین)ەوە ناوی نام عیزەدین. ئەوانەی ئاگاداری تەسەوفو هاتووچۆین لە نێوان غەرق بوون لە ئایدلیالیزمو بەرەو مەتریالیزم چووندا، لە خۆشەویستیی ئەو سۆفییە مەزنەوە لە بیری ئەوسای باوکمو هاتوچۆی بیری –تامردنی- لە نێوان ئەو دوو ڕشتەیەی فەلسەفەدا باش تێ دەگەن.

---

٢-ساڵی ١٩٩٧ هاوڕێی شیرینم کاکە عومەر شێخمووس لە بەڵگەیەکی ڕەسمیی وڵاتی سویدا ١٩٣٤/٣/٢١ی بە ڕۆژی لەدایکبوونم چەسپاند.

وابزانم -حاجی مەلا ڕەسووڵی باپیرم هەر بە منداڵی هاتۆتە شاری سلێمانیو دەستی بە خوێندن کردووە یا هەر لە سلێمانی لەدایکبووە، بەڵام چ ئەو چ نەوەکانی پێوەندیمان لەگەڵ گوندی (دێلێژە)ی گەرووی دەربەندی باسەڕەی سەر بە ناحیەی قەرەداخ نەبڕاوە بێجگە لەوەی کە تا تێکدانی ئەو گوندە لە ئەنفالی ۱۹۸۸دا هەموو خەڵکی دێ بە یەك (زا) یادوو یا سێ -واتە. لە پورزاوە بگرە، هەر خزممان بوون، لە ڕاستیدا لە هاتووچۆو پێوەندیی ئەو دێ شیرینە نەکەوتینو خۆمان بە (دێلێژە)یی دەزانین ئێستاش کە ئەم چەند دێڕە دەنووسم ۱۹۹۱/٦/۱٥ دوورم لە کەسو کار، نازانم خزمەکانم چوونەتەوە سەر گوندی وێرانیان یانا، بەڵام ئاواتم ئەوەیە لە دروستکردنەوەی دێدا ئەو شوێنەیان لەبیر نەچێ کە ساڵی ۱۹۸۳ شێخ ڕەشیدی پورزام -کە پار کۆچی دوایی کرد- بۆئەوەی دانا کە من دوو ژووری تێدا بکەمو هاوینو کاتی پشوو لەوێدا ببەمە سەر.

(دێلێژە) گوندێکی خنجیلانەو جوان بوو بە پاڵ چیاوە، ژێری باخی میوە بوو، لەبەردەمی دێلێژەدا دوو ڕووباری (تلێ) و (باسەڕە) لەیەکیان دەدا بە دەربەندا بە ناوی (ڕۆخانە)وە ڕووی دەکردە گەرمیان[۲].

هەموو کەس مەڵبەندی خۆیو باوكو باپیری لا جوانە. بەڵام زۆر کەسی جیا لە ئێمە کە لە ساڵانی دەربەدەریو پێشمەرگەییدا ڕوویانکردۆتە دێلێژە، باسی جوانیو خۆشیی ئەو گوندە دێرینە بەناوبانگە دەکەن. من لێرەدا زنجیرەی بیرم لە بارەی ئەو مەڵبەندە شیرینەوە بڕرا. بێگومان لە ڕێڕەوی ئەم

---

۲-تا ئێرەم لەو ڕۆژەی ۱۹۹۱/٦/۱٥دا نووسی. ئیتر سەرقاڵ بزون بە هەموو ڕووداوەکانی پاش ڕاپەڕینی ۱۹۹۱ەوە کۆمەڵێك ئەرك گرتنە ئەستۆ بە ئەرکی هەندێك نووسینی تریشەوە دەستی لەم یادداشت نووسینە پێ هەڵگرتم. بەڵام چەند هۆیەك پاش چەند ساڵ دەستیان پێ دامەوە نووسین. ۱۹۹٥/۱/۲۱ لە ژوورەکەی خۆم لە پەرلەمانی کوردستان. کە مانگێکە تیایدا پەناگیرین دەستم پێکردووە.

یادداشتانەدا جاریتر باسی هەر دێتەوە پێشەوە. لەبەر ئەمە سەرەتای باسی ئەو گوندە بەم چەند دێرە دەبڕێنمەوە:

دێلێژە وەك ووتم: هەموو خزمی یەکن، یا چەشنە دابەشکردنێکیش لە نێوانیاندا بووبێت، شێخ، مەلا، کەسانیتر کە سەیرە لێرە نە مسکێن نە جووتیارو نە نۆمیو نە ناویتریان نەبووە. چونکە ئەمانەش هەر لە پشتەوە لەگەڵ بنەماڵە مەلاکاندا یەکبوون‌و لە ژن‌و ژنخوازیشەوە خزمی شێخەکان بوون.

شێخەکان سەیدی بەرزنجە بوون‌و دیارترین باپیرە گەورەیان کە قەبرەکەی زیارەتگای دوورو نزیکبوو شێخ ڕەزای دێلێژەیە. سوێندی شێخانی دێلێژە بە قەبری (باپیرە شێخ ڕەزا) بوو، خەڵکی ناوچەکەش سوێندیان بە شێخ ڕەزای دێلێژە دەخوارد.

هەرچی مەلاکانن – ئەوە سێ بنەماڵە یان چوار بنەماڵەی بەناوبانگن. لەوانە ماڵی موفتیی چاومار کە چەند پشتیان موفتیی سلێمانی بوون. هەر چاومار برایەکی بە چاوهار بەناوبانگ بووە کە لە نەوەی ئەو ئافرەتێك بەناوبانگ بووە. ئەم ئافرەتە کە (مەلا فاتم)ە دەرسی بە منداڵانی سلێمانی ووتووەو سەدانی فێری خوێندن کردووەو لە کاتی خۆیدا ناوبانگی وەك خواجە فەندی وابووە.

ئەم مەلا فاتمە دایکی مەلا کاکە حەمەی حاجی سەیفوڵڵایە. وەك بیستوومە بنەماڵەی (چاومار) لە بنەچەدا لەگەڵ ئێمەدا ئامۆزان‌و هەر ئەو مەلا فاتمەو موفتی چاوماریش پورزای حاجی مەلا ڕەسووڵن.

بنەماڵەی دووەم: کە یەکەم مەلای بەناوبانگیان لە ناوچەی سلێمانیدا حاجی مەلا ڕەسووڵی باپیرمە، ئەویش لە دێلێژە بە کوڕی مەلا محەمەدی مەلا شەریف ناسراوە.

بنەماڵەی سێیەم: لە سلێمانیدا حاجی مەلا ئەحمەدی دێلێژەو مەلا محەمەد سەعیدی کوڕی کە ئەویش زانای گەورە بوو و مەلای مزگەوتێ بوو کە بە خومخانە بەناوبانگ بوو لە ناویاندا ناسراون.

لەم یادداشتانەدا گەلێك جار دێمەوە سەر باسی دێلێژەو پێوەندیی گیانیو ژیانی خۆمو هەموو خزمانی دێلێژەو شانازیم بەو گوندە پیرۆزەوە، لەبەرئەوە لێرەدا بەسەریدا ڕا دەبوورمو هەر لە بارەی بنەماڵەو پێکهێنانی شەخسییەوە دەبێ چەند دێڕێك بنووسم، کە ڕەنگە درێژتر لە هەندێك بەرهەمی لەمەوبەرمدا باسم کردبێو لەمەو دوواش لە شوێنی تردا بە درێژتر بێمەوە سەریان.

باوکم وەك هەر لە باوکەوە دێلێژەیی بوو، لە ژیانی خۆیو ئێمەشدا شانازیی زۆری بە بنەماڵەی دایکییەوە دەکردو لەگەڵ پورزاکانیو ئەو بنەماڵەیەدا پێوەندیی هەبوو و ئەو پێوەندییە بۆ ئێمەش مایەوە.

نەنکم (ڕەعنا) یەکێك بووە لە نۆ کچی شێخ عەزیزی خانەقا کە ئەوو شێخ عارف خانەقا جێنشینی باوکیان بوون لەسەر خانەقاکەی مەولانا خالید. باوکیان شێخ فەتتاحی حەمەخانی حسێنی مکایەلی بووە. کە مەولانا خالید ڕوویکردۆتە شام شێخ فەتاحی برازای لە خانەقا جێنشینی بووە: مەزاری شێخ عەزیزو شێخ فەتاح تا ئێستا لە خانەقای مەولانادان[٤].

کە سەرەتا بە باوكو باپیر دەستم پێکرد. دەبێ لە دایكو خاڵۆوانیشم بدوێم.

باوکم لە پاڵ ئەوەدا کە مەلا بوو، خوێندەوارێکی چاكو ئینسکلۆپیدیو هەمەڕەنگو خوێنەرەوە بوو. بەڵام دایکم هەر وەك نەخوێندەوار بوو، زۆر

---

٤-پێش نوێکردنەوەی خانەقا لە ژووری نوێژکردندا بوون، ئێستا کەوتووەتە حەوشی خانەقاوە.

بەسزمان‌و بە گشتی نەزانیش بوو، تا گەورە بووم لە کەس‌و کاری دایك هەر نەنکم (مریەم) و دوو خاڵی دایکم (حاجی قادر) و (سەعید) و کوڕو کچەکانی ئەوانم دەناسی. دایکم دەیگێڕایەوە کە باوکی قادری مەلا بۆرە بەناوبانگ بووە. ئەفسەری عوسمانی یا لە ئەفسەر خوارتر بووە لە سوپای عوسمانیدا.

لە ساڵانی دوایی ژیانیدا لە مووسڵ بووە. کوڕێکی بووە –ڕەشید بە قسەکانی دایکم‌و نەنکمدا وا دیار بوو قوتابیی ڕوشدیەی عەسکەری بووەو هەر لەو پلەیەی خوێندندا مردووە. قادر- یا وەك لەمەو دوا لە هەندێك لە خزمەکانیم دەبیست- قادر ئاغایان پێ ووتووە، هەر ماوەیەك پاش مردنی کوڕەکەی سوێی بۆتەوەو لە مووسڵ مردووە.

نەنکم پەلی ئەو تاقە کچەی گرتووەو هاتۆتەوە سلێمانی. بە بیرەوەریی من. نەنکم جاروبار لە ماڵی ئێمەو/زۆرتر لە ماڵی حاجی قادر دەژیا. ئێمە هەر لە منداڵییەوە حاجی قادرو کاك سەعیدی برایمان بە خاڵی خۆمان دەزانی‌و ئێستاش هاوتەمەنەکانمان ئێمەو کوڕو کچەکانی ئەوان بە خاڵۆزاو پورزا دەزانن- یا خاڵۆزای دایکیشمان بن. ئەمەش دیارە بێجگە لە پێوەندی. هەر لە خۆیەوە نییە. چونکە هەمیشە نەنکم دەیووت: قادر برامەو کوڕمە. کە دایکمان مرد من ڕەشیدم بە بەرەوە بوو ئەو شیرە خۆرە بوو، خۆم گۆشم کرد.

بە گەورەیی زانیم دایکم کەس‌و کارێکی زۆری هەیە، بەڵام لە هەژاری‌و بێ دەرەتانیدا دوور بوون لێی‌و ئەویش لە بەسزمانیدا کە ئەم ئامۆزاو پورزاو خاڵۆزا دەردەکەوتن باسی لێوە دەکردن‌و ئەوەم زانی کە ئەوانیش فەرەداخین. بنەماڵەیەکی ناسراوی زەردیاوان[5].

---

٥-بنەماڵەی حسین ئەفەندی کە شەجەرەیەکیان هەیە دەیانباتەوە سەر (موعازی کوڕی جەبەل). دیارە ئەم شەجەرانە لە وڵاتی ئیسلامدا زۆرن‌و شەرت نیە هەموویان ڕاست بن.

## خوێندن:

ناتوانم بڵێم هیچی پێش حوجرەو قوتابخانەم بیر نییە چونکە زۆرم بیرە. بەڵام ڕەنگە لە منداڵیی هاوتەمەنەکانی خۆم نەچێت. نە کۆڵانو نە یاریو نە هەڵماتێنو نە مزراحێن، کە هیچیان فێر نەبووم.

پێش چوونە قوتابخانە، دەبێ تەمەنم چەند ساڵ بووبێت کە بە داواکردنی خۆم دۆشەکەڵەیەکو جزمێک یا ئەلفو بێیەکیان دایە دەستمو ناردمیانە حوجرەی مەلا حامید. حوجرەکە هەر بەرامبەر بەو خانووە بچوکە بوو کە بە کرێ تێیدا بووینو دەرگاکەی بەرامبەر بە مزگەوتەکەی خۆمان بوو (مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵ) هێشتا ئەو خانووەی گەڕەکی سەرکارێزمان نەکڕیبوو کە هەموو ساڵانی دواییی تا ساڵی ١٩٧٦ خانەی ژیانو یادگارمان بوو.

حوجرەکە دوکانێك بوو لەناو مزگەوتەکەداو هەر وەقفی مزگەوت بوو، بەڵام دەرگای لەسەر جادەکە بوو، پاش ئەو کاتەی باسی دەکەم مامۆستا مەلا حامید حوجرەی بردەوە ماڵی خۆیانو جێگەکەی بوو بە دوکانی کاك کەریم. کەریمی وەستا بستە، کە قسەخۆشیو دەروون پاکیی خۆیو وەستانی بەردوکانەکەی بەشێکن لە یادگاری منداڵیی چەند نەوە لە منداڵانی گەڕەك.

مەلا حامیدی یەکەم مامۆستا کوڕی مەلا حەمەدوونی شاعیری کوێری بەناوبانگ بوو. ئەم چاوساغ بوو بەڵام قورئانی لەبەر بوو و لە زۆر بۆنەدا قورئانی دەخوێند[٦].

ئەوەندەم لە بیرە کە لەو تەمەنەی ٣-٤ ساڵی یەدا ئەلفو بێو سەرەتای جزمی (عەمما)م لای مەلا حامید خوێند، ئێستاش بە دەنگی ئەو (بێ ژێربێ،

---

٦-مامۆستا مەلا حامید شاعیریش بوو. وا بزانم بەرهەمەکانی کەوتوونە لای کاك فەرهاد فازیل لە بەرلین، هیوام وایە بە چاپیان بگەیەنێت.

سین زەنە بیس، میم ژێرمی- بسم)م لەبیرە، هەروەك نەورۆز نامەیەکی بە ڕەنگاوڕەنگ نووسراوەم لەبیرە کە بۆ قوتابییەکانی نووسیبۆوە.

نازانم نەخۆشی بوو، یا پارەی کرێی دوکان نەبوون، حوجرەکەی بە مەلا حامید گواستەوە مالی خۆیان لە ژوور مالی ئێمەو لەلای (قاوەخانەی سەرچیمەن). ئێمەش ناچار بە خۆمان‌و جزم‌و دۆشەکەڵەوە دەچووینە ماڵەکەی ئەوان. هەموو هاوالەکانی ئەو حوجرەیەم لەبیر نییە، بەڵام ڕەنگە هەر گەیشتنە (مریشکە ڕەشە) یەکێکیانی لەبیرمدا جێگیر کردبێت.

(مریشکە ڕەشە) بە سوورەتی (الفتح) دەووترا کە سەرەتا بە حینجە[٧] دەخوێندرا. چونکە لە کۆتاییدا دەوترا:

(انە کان توابا)- یەکسەر قوتابی دەیانووت: (مریشکە ڕەشەی سەوابە (ثواب)، بۆ مامۆستا کەبابە) ئیتر دەبوو قوتابی سبەینێ مریکشێکی ڕەش بۆ مامۆستا بێنێت. بەڵام ئەم هاواڵەی ئێمە کە کاك سەعیدی حاجی شێخ عەلی بوو. کە ئێستا نووسینی بەناوی (س. ع. شادمان)ەوە زۆرە، لە جیاتی مریشکەکەی مامۆستا سبەینێ ووتی: مامۆستا باوکم دەڵێ- نیوەڕۆ خۆی‌و هەموو قوتابییەکانی بفەرموونە ماڵی ئێمە بەو جۆرە مامۆستا مەلا حامید هەموومانی پێش خۆی دا بۆ ئەولای حوجرەکەی، بۆ کۆڵانی گەڕەکی قەزازەکان. تا دەعوەتێکی پیاوانەو چێشت‌و نانێك بخۆین کە بۆ پیاوان‌و گەورە دەکرێت.

کۆتایی‌و وازهێنانی منداڵانە لەو حوجرەیەی وا بزانم هەر جزمی (عەمما)م تێدا تەواوکردو بەم چەشنە بوو. ژوور ماڵەکەی ئێمە لە نێوان ئەوی‌و ماڵی مامۆستادا ماڵی مەلا عەبدوڵڵای عەزیز ئاغا بوو کە سێ کوڕی لە ئێمە

---

٧-قورئان بە حینجەو بە یاسایە خوێندرا. حینجە- واتە حەرف بە حەرف بە (سەرو ژێرو بۆرو زەنەوە دەخوێندرا- واتە فتحەو کسرەو ضمة و سکون) سایە هەر خوێندنەوەکە بەبێ ئەم سەرو بۆر ووتنە لەگەڵ هەموو ووشەیەکدا.

گەورەتری هەبوو، كاك مەجیدی كوڕی گەورە بوو، لە چستو چالاكیدا مەجید شەیتانیان پێ دەووت، كەڵەشێرێكی هەبوو فێری شەڕە كەڵەشێری كردبوو فێریشی كردبوو پەلاماری منداڵانی گەڕەك بدات.

ماڵی خاڵم لە خوار ماڵەكەی ئێمەوە بوو. جادەكەی دەچووە بەر ماڵی ئەوان لەوێوە شۆڕ دەبۆوە بەرەو بەرخانەقا. ئەو خانووەی ئەوان خانووی حاجی مەلا ڕەسوولی باپیرم بووە پاش وەفاتی ئەو مەلا مەحموودی مامم فرۆشتبووی بە حاجی قادری خاڵم.

لەگەڵ عەلیی خاڵۆزامدا هاوتەمەن بووین، بەڵام من ساڵ كەمتر لەو گەورەتر بووم. پێكەوە لای مامۆستا مەلا حامید دەمانخوێند بەیانیان عەلی دەهات بە شوێنماو پێكەوە دەچووین بۆ ماڵی مامۆستا. دیارە زۆر منداڵ بووین، لەبەر ئەوە زۆر جار حسابی كەڵەشێرەكەی مەجیدمان دەكردو بە یەكێك لەو دوو كۆڵانە دوورەدا دەچووین بۆ خوێندن كە بە بەرماڵی مەجیدا ڕەت نەدەبوون.

بەیانیەك عەلی زۆر بە خۆشیەوە هات. باوكی ڕۆژی پێشوو جوتێ كڵاشی تازەی بۆ كڕیبوو. بڕیارمان دا ئیتر لە كەڵەشێر نەترسین. بەڵام هەر گەیشتینە بەر دەرگای ماڵی مەلا عەبدوڵڵا دەرگا كرایەوەو كەڵەشێر پەلاماری داین. ڕامانكرد عەلی جووتە كڵاشی لەپێ داماڵراو لێی بەجێ ما. كە بە دەم گریانی ئەوو دڵخۆشی دانەوەی منەوە گەیشتینە لای مامۆستا. مامۆستا چەند قوتابیی لە خۆمان گەورەترو دوكاندارێكی نزیك ماڵەكەی خۆی لەگەڵ ناردین، كڵاشمان نەدۆزیەوە. ئیتر هەردووكمان بڕیارمان دا نەچینەوە حوجرە.

دووەم حوجرەم- حوجرەی شێخ نەجمەدینی شێخ عارفی خانەقا بوو، كە خۆی ئیمامی خانەقای مەولانا بوو، ئامۆزای نەنكم بوو.

پاش چوونە قوتابخانەشم چەند هاوینێك لەو حوجرەیەدا خوێندوومە. دەرسی قورئانو خەتو ئەحمەدیی شێخی نۆدێم لای شێخ نەجمەدین خوێند. بەڵام دیارە مریشكو كەڵەشێر پیشەیان بوو خوێندن بە من ببڕن.

حوجرەکەی کاك شێخ نەجمەدینیش لە دوکانێکدا بوو لە دوکانەکانی خانەقا، هەر بە تەنیشت دەرگای خانەقاوە بوو، پانیی وەك دوکانەکانی تری بەر خانەقا بوو، بەڵام درێژیی ئەوەندەی داڵانەکەی خانەقا بوو. لە جیاتی کورسی چوار ڕیز سەکۆی درێژ لە بەردو قوڕ دروستکرابوو، هەرکەسە دۆشەکی خۆی لەسەر جێی دیاریکراوی دادەنا ئیتر نەیدەبردەوە ماڵەوە.

دەرگای حوجرەکە بە تەنیشت دەرگای خانەقاوە بوو، لەبەرئەوە زوو زوو بە ناوی چوونە سەر ئاوەوە لە خانەقا ئیزن لە مامۆستا دەخوازرا. بەڵام ئەگەر فوتابییەك زۆری پێ بچووایەو فوتابی تر بهاتایەوەو بیووتایە –مامۆستا فلان لە حەوشەی خانەقادا یاری دەکا، ئەوە دەنێررا بە دوایداو بە دار لێدانی دەخوارد، یا پێش تەواوبوونی دەرس و نیوەڕۆ چوونەوە ماڵەوەی فوتابیان، فەلاقە کردن دەستی پێدەکرد.

کە گەورە بووم و ئەو شێخ نەجمەدینەی خزمم باش ناسی، کە چ مرۆڤێکی بێوەی و بێدەنگ و بەسزمانە، لام سەیر بوو چۆن لە مامۆستایەتیدا ئەوەندەی لێ دەترسایین یا چۆن ئەو وا تووڕەو دڵ ڕەق بوو. فەلاقەی لە دارێکی درێژ دروستکردبوو، قایشێك بە بزمار بە هەردوو سەرییەوە داکوترابوو، دوو فوتابیی بە خۆوە بۆیان دەگرت، دارەکە دەسووڕێنرایەوە، تا قایشەکەی لەسەر لوول و قایم دەبوو، ئەوسا مامۆستا بەدار لە بنی پێی ئەو منداڵە سزا دراوە، بەسزمانەی دەدا. باشبوو من بەر ئەو سزایە نەکەوتم. بەڵام کە پاش چەندین ساڵ فاچم لە فەلاقەی پۆلیسی نووری سەعی دابوو و لە جێگەی فەلاقەکە تفەنگ بوو، لە ڕووخساری پۆلیسەکاندا ڕۆژانی حوجرەم بیر دەکەوتەوە.

ئەوەی دەرسیشی ڕەوان نەبووایە هەر بە لێدان یا فەلاقە سزا دەدرا. ئێستاش دیمەنی هاوڕێی ڕەحمەتیم عومەر نەمەڵیم لەبەرچاوە کە لەسەر ڕێکوڕەوان فێرنەبوونی (اصحاب الأيكة) چ لێدانێکی خوارد.

حوجرەکە خۆی نیمچە دوکانێکیش بوو. بە بیانووی ئەوەوە کە قوتابی نەچنە دەرەوە بۆ شت کڕین، لای ماموٚستاوە سینییەك شیرینی (نوقڵو ماجوومیو مەسکەتو لەبزینە) دانرابوو، یەکی بە فلسێك. ئەو قوتابییەی بە نۆرە ئەرکی شت فرۆشتنی دەخرایە ئەستۆ زۆر شاد دەبوو. چونکە لای ماموٚستاوە دادەنیشت، لە دەورکردنەوەو لێدان ڕزگاری دەبوو. هەر یەکە چەند فلسێکی دەهێناو یەك لە یەکتریشمان قەرز دەکرد. ئەو کەسەش کە قەرز کوێر بووایە شکاتی لێ دەکراو سزایەك هەر دەدرا.

نازانم ماموٚستا ئەو حەوشە گەورەیەی ماڵی خۆیانی لەبەردەستدا بوو، کە دیواری بە دیواری خانەقاوە بوو و دەرگاشی هەر لسەر خانەقا بوو، هەروەك حەوشەی خانەقاشی لەبەردەستدا بوو. کەچی مریشکێكو جوجکەکانیی لەناو حوجرەکەدا بەرەڵلا کردبوو. بۆچی ڕۆژێك پێم لەسەر زەوی دانەناو یەکسەر کەوتە سەر جوجکێك. ئیتر هۆشی ئەوەم نەما مردووە یا نا. تا قوتابییەکەی تەنیشتم هاواری کەیشتە ماموٚستا کە من جوجکێکم کوشتووە. من گەیشتمە بەردەرگاو بەرەو ماڵ بوومەوە. لەم حاڵانەدا ماموٚستا دوو قوتابیی چاپووکی بەدووای قوتابییە هەڵاتووەکەدا دەنارد دەیانگرتەوەو دەیانبردەوە بەر فەلاقە. بەڵام ماموٚستا کەسی بە دوای مندا نەنارد. منیش بڕیاری خۆمدا کە نەچمەوە حوجرەو ئەو لێدانە لە ماڵەوە بخۆم.

شەو وەك زۆرجار کردبووی بە عادەت ماموٚستا پاش نوێژی خەوتنان هات بۆ ماڵی ئێمە. لە ترسان نە زەوی ئەیگرتم نە ئاسمان هەڵی دەلووشیم. پاش بەخێرهاتنی لە کونجێکی ماڵەکەدا خۆم شاردەوە.

سەیر ئەوە بوو نە ماموٚستا لە هاتنیدا گرژو مۆن بوو نە باوکم دووایی قسەی کرد. بێگومان مەسەلە نە لای ئەو نە لای ماموٚستا سزای نەدەهێنا، کەچی من بە لێکدانەوەی منداڵانەی خۆم زۆرم لا گەورە بووبوو.

کە باوکم بەیانی بە پێکەنینەوە ڕووی تێکردم‌و ووتی: هەستە، بچۆ بۆ حوجرە، ووتم ناچم بێ ئەوەی لێم بپرسێ بۆ ووتی: بڕۆ لە شێخ ئەجمەدین مەترسە. حەرفەکان‌و قورئان باش فێربە، سەری ساڵ ئەتبەمە مەکتەب[٨].

## سێ براو کڵاوێك

حاجی مەلا ڕەسووڵ پێنج کوڕی هەبووە. بەڕێز: مەلا ئەحمەد، مەلا محەمەد، مەلا مەحموود، مەلا مستەفا، ئەجمەدین.

مامە مەلا ئەحمەد دایکی جیابووە. مەلا محەمەد لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ژنی نەهێناوەو مردووە. کۆمەڵێ شیعری هەبووە، هەندێکیم هێشتا لاماوە تەخلووسی (فەیضی) بووە.

مامە مەلا ئەحمەد لەبەرئەوەی لەگەڵ براکانیتردا لە دایکێك نەبوو و من زۆر منداڵ بووم واتە لە ساڵی ١٩٣٧دا بە مەلایەتی چووە بەرزان‌و زێبارو پاشان لە ١٩٤٦دا چووە خانەقین. کە گەورەش بووم زانیم لەگەڵ براکانیدا سەردەمی سلێمانی زۆر کۆك نەبووە. لەبەرئەوە لە زۆر حسابدا هەرسێ برایان حساب دەکرد.

حیکایەتی سێ براو کڵاوەکەش ئەوەیە کە ڕۆژێك وەك هەموو منداڵی گەڕەك حەزم لە یاریکردن کردووەو لە کونجی ژوورەکەی باوکم لە مزگەوت کە جێگەی هەمیشەیم بوو یاخی بووم، مامە مەلا مەحموود هاتبوو بمباتەوە ڕامکردووەو دووام کەوتووە، ژنێکی دراوسێ لێی پرسیبوو: مامۆستا مەلا مەحموود ئەوە چییە. وەڵامی دابۆوە: ئەوە بە سێ برا کڵاوێکمان هەیە ئەوەتا لە دەستم دەرچووە ئەمەوێ بیگرمەوە. لە ڕاستیدا مامە مەلا

---

٨-بە قوتابخانەی ڕەسمی دەوترا –مەکتەب.

ئەحمەد دوو کوڕو کچێکی بوو –کاک قادر، کاک جەلال، سەبیحەخان)[٩] کە هەرسێکیان لە من گەورەترن و پاش سالانێکی زۆر دووری ئێستا لە سلێمانین. بەلام سێ برای ئەم حیکایەتە- مامە مەلا مەحموود ئەو سەردەمە تەنیا کچێکی هەبووە (زەکیە خان) کە لە من گەورەترە، ئەوانی تر هەموویان لە من بچووك ترن. باوكو دایکیشم پێش من کوڕیان نەبووە خوشکەکانم سیانیان لە من گەورەترن. مامە ئەحمەدیشم منداڵی لە من گەورەتری نەبووە. لەبەرئەوە من بووم بە کلاوی ئەو برایانە کە نازیانم لە بیر ناچێتەوە. سۆزو دڵسۆزیی مامە مەلا ئەحمەدیش لە ژیانمدا زۆر دیاربوو.

دیارە بردنەوە مزگەوتو چوونە مزگەوتو لە مزگەوت خوێندنی من ئامانجی هەرسێکیان بوو، تا جێگەی حاجی مەلا ڕەسووڵ کوێر نەبێتەوەو مەلایەك لە جێگەیدا بمێنێ.

بەلام ئەم لە حوجرە ڕاکردنانەی منو خەوبینین بە چوونە مەکتەبەوە کێشەو مایەی ووتو وێژی ڕۆژانەیان بوو، تا لە تاوێکی زۆر پڕ لە ئازاردا باوکم بە پێچەوانەی خواستی خۆیو هەمووانەوە بڕیاری چوونە مەکتەبم دەداو پاشان بەجێی دێنێت.

ئەو تاوەش ئەوە بوو کە ساڵی ١٩٢٨ تووشی گرانەتا بووم، وەك دەگێڕنەوە وڕێنەم بە قوتابخانەو بەرگی قوتابییەوە کردووە، یا بە واتای ئەویا بە مەکتەبو جلی مەکتەبلییەوە. باوکیشم دەستێکی بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوەو ووتوویەتی:

-شەرتە چاك بیتەوە بتخەمە مەکتەب.

---

٩-کوڕێکی هاوتەمەنی منیشی لە ژنی دوەمی بوو. ناونرا ڕەسووڵ لە زێبار بە لەرزوتا مرد.

## قوتابخانە:

ڕەنگە دووایی زانیبێتم چۆن و چ ساڵێك چوومەتە قوتابخانە، بەڵام ئەوەی لەبیرمە ئەوەیە دەمەو عەسرێك باوکم پەلی گرتم و ووتی: سبەینێ مەکتەبە، هەستە با بچین جلی مەکتەبت بۆ بکڕم.

کام خۆشی وەسف بکەم، خۆشیی چوونە مەکتەب، یا بەرگی جوان و ڕێکوپێکی قوتابی لەبەرکردن. ئەوە لەو بارە سایکۆلۆژی دەروونییانەی ژیان بوون، کە چەند جار لەم گەشتی ژێر ڕووناکییەدا ئاواتم بە قەڵەمی دیستۆیفسکی خواستووە تا بتوانم وەسفی بکەم. بەڵام کە نەبوو قەڵەمەکەم داناوە لەگەڵ گۆراندا ووتوومە:

هەرچەند ئەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم

سلێمانی ئەو سەردەمە هەرچەند دوکانێکی گەورەی تێدا بوو کە هەمەڕەنگ و تازە بابەتیان تێدا بفرۆشرێت بەوانیتر دەووترا (دوکان) و بەمانە دەووترا (موغازە) کە دیارە ئەم ناوە لەناو تورکەوە هاتۆتە لای ئێمەو ئەوەش دیارە کە لەگەڵ (مەگازین)ی ڕووسیدایەکە، هەرچەندە ئەم ووشەیە لە زمانە ئەوروپایەکانیتردا بۆ (گۆڤار) بەکاردێت و هەمووش ڕەگەزی کۆکردنەوەی تێدایە. هەرچی ووشەی (کۆگا)یە ئەوە دوواتر لە کۆتایی ساڵانی چلدا لە سلێمانی پەیدابوو.

موغازە[10]ی حاجی عەزیز بەگی حاجی فەرەج بەگ لە هەمووان بەناوبانگتر بوو. بەڵام دەیانووت شتی گرانە. لە خوار ئەوەوە بەرامبەر بەو نەخۆشخانەیە پێی دەووترا خەستەخانەی خوارەوەو ئێستا پارکی ئوتومبیلە[11] موغازەیەك

---

١٠-ئەم ووشەیە لەگەڵ (مخزن)ی عەرەبیدا یەکدەگرنەوە.

١١-ئێستا تەلاری کارەیە.

هەبوو، خاوەنەکەی یەکێك بوو لەم دوکانداره کەمانەی چاکەتو پانتۆڵیان لەبەردا بوو و سدارەی لەسەردا بوو. چونکە ئەو سەردەمە هەر فەرمانبەرانی میری ئەو بەرگەیان لەبەردەکردو (ئەفەندی)یان پێ دەووترا، کاسبیتر جلی کوردییان لەبەر دەکرد، یا کەواو چاکەت یا کەواو سەڵتە. خاوەنی ئەم موغازەیە مەحموودی ناو بوو، کوڕ یا برازای غەریبی حەڵواچی بوو.

یەکەم جار بوو موغازە ببینم، باوکیشم لای وابوو خاتر دەگیرێ، خاوەن موغازە پێی خۆش بوو مەلایەکی ناوداری شار کوڕی بنێرێتە مەکتەب. هەر لەوێدا بە چارەکە دینارێك بەڵێ ٢٥٠ فلس کرام بە مەکتەبلی. قوتابیی ئەو سەردەمە دەبوو جلی (کەشافە —نیدەوانی) لەبەرکەن. بەو چارەکە دینارە. کراسو پانتۆڵو سدارەو بۆینباغو گۆرەویو پێڵاوی کەششافە کڕراو پەرداخێکی ناو (ئاسنین) کە قوڵفی بوو و بە جۆرە قەفیسێك دەکرا بە پشتی پانتۆڵەکەوەو فیکەیەکیشی خرایە سەر. پێش باوکم کەوتم تا ماڵەوە فیکەم لێدا.

سبەینێ زوو باوکم پەلی گرتم بردمییە قوتابخانەی (خالیدیە). بەڕێوەبەری ڕەحمەتی مستەفا مەولوود (مستەفا بەهجەت) بوو، باوکم نامەیەكو دەفتەری نفووسەکەمی دایە. بەڕێوەبەر فەڕاشەکەیی بانگ کردو ووتی:

-وەرە ئەم کوڕەی مامۆستام بەرە بۆ سنفی یەکەم.

## ( پۆلی ) یەکەم

پۆلی دەرسخانەش گەشەو سامی دەدا بە دڵ، فەڕاشەکە جانتاکەی دەستمی لێ سەندەو لەسەر مێزێکی نەگیراو دایناو ووتی ئا لێرە دانیشە. ئێستا زەنگ لێ دەدات. هەموو ئەم شتانە بەو زەنگەشەوە تازە بوون، هەر یەکە هەستێکی تایبەتییان دەبەخشی. زەنگ لێی دا.

یەکەم مامۆستا هاتە ژوورەوە —عوسمان ئەفەندیی سەعیدی مەلا عەباس بوو.

قوتابییەك بانگی كرد:

-قیام

هەموو بە سەلامەوە هەستاینە سەرپێ.

مامۆستا ووتی:

-جلوس

دانیشتینەوە.

یەکەم دەرس تیپی (ز) بوو، تێی گەیاندین کە ئەمە (زێ)یەو هەموو لەگەڵیدا ووتمانەوە. تا (زێ) بوو بە (زیز).

لە پشووی نێو دوو دەرسدا نەچوومە دەرەوە.

دەرسی دووەم: حسین ئەفەندیی ساڵح ئاغای دراوسێی خۆمان هاتە ژوورەوە زۆرم لا خۆشبوو. سێ جوغزی لەسەر تەختە رەشەکە رەسم کردو ووتی: ئەی لە دەفتەرەکانتاندا نەخشی بکەن. یەك بە یەکیش بەسەرماندا رادەبوورد تا بزانێ باش ئەو جوغزە دەکێشین یانا؟ زوربەی قوتابییەکانیش هێشتا نەیاندەزانی قەڵەم چۆن بە دەستەوە دەگیرێت، فێری دەکردن. ئامۆژگاریی کردین کە بە لاستیکی خەت کوژێنەوە شت بسرینەوەو دەم نەدەین لە قەڵەمەکە.

دەرس کۆتایی نەهاتبوو بەرێوەبەر (مستەفا بەهجەت) هاتە ژوورەوە مامۆستا خۆی ووتی:

-قیام.

کە دانیشتینەوە بەرێوەبەر کەوتە ناو خوێندنەوەمانو ووتی: هەرکەس ناوی خوێندرایەوە جانتاکەی هەڵدەگرێتو دەچێتە دەرەوە. لە بیرمە ناوێکی خوێندنەوە.

-عەلی مەلا مستەفا.

من هەستام وام زانی من بانگ دەکاتو ناوەکەی لێ چەواشە بووە. بە پێکەنینەوە ووتی: نا، تۆ نیت، تۆ جارێ دانیشە. کاك عەلی مستەفا (لە

مەودووا ئەفسەری سوپا) هەستا چووە دەرەوە. من بەو هەڵەیەی خۆم زۆر تەریق بوومەوە. حسین ئەفەندی تێگەیی. بۆ دڵخۆشی دانەوەو هێمن کردنەوەم ووتی:

-قەیناکا، ئێستا نۆرەی تۆش دێت.

دیاربوو چونکە من درەنگ هاتبووم دووا ناو لە لیستەکەدا ناوی من نووسرابوو. بە چوونە دەرەوەی من کەس لە ژووردا نەما. دوو دوو ڕیزیان کردین‌و حسین ئەفەندی‌و فەڕاشێك پێش‌و دووا لەگەڵماندا هاتن.

لە قوتابخانەی (خالیدیە)وە کە بەرامبەر بە ناشی میرزا غەفوور بوو، بردیانین بۆ کۆڵانەکەی ئەودیو- بۆ خانووەکەی مەجید بەگی حاجی ڕەسووڵ بەگ. کە تازە کرابوو بە قوتابخانەو ناونرا بوو قوتابخانەی غازی (ئێستا شوێنەواری ئەم دوو قوتابخانەیە نەماوە، هەردووکیان ئەمبەرو ئەوبەری شوێنەواریان بازاڕو دوکانە لەسەر شەقامی کاوە).

* * *

تومەز من بە هیچ پێودانگێك تەمەنی وەرگرتنم نەبووە لە قوتابخانە. ئەگەر لە ڕاستیدا بێت‌و لەدایکبووی ١٩٢٥ بم یا بە پێی دەفتەری نفووس بێت‌و لەدایکبووی ١٩٢٤ بم. بەڵام باوکم چوو بووە لای بەڕێوەبەری زانیاری (مودیری مەعاریف)[١٢] کە ئەو دەمە خوالێخۆشبوو مستەفا مەزهەر بوو. ئاواتی خۆی‌و منی تێگەیاندبوو ئەویش زۆری لا خۆش بوو کە کوڕەزای حاجی مەلا ڕەسووڵ بێتە قوتابخانەی ڕەسمی نامەیەکی دابوویە. بۆ بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەیەی کە تازە کراوەتەوە. ئەم قوتابخانەیە ئەوەلی بوو، واتە چوار پۆلی تێدابوو. ئەو سەردەمەو تا من قوتابخانەی سەرەتاییم تەواو کرد لە سلێمانی چوار قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان (شەش پۆلی هەبوون)- خالیدیە، فەیسەڵیە، گۆیژە، ئەیووبیە. سێ

---

١٢-ئێستا بەڕێوەبەر یا بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردەی پێ دەڵێن.

قوتابخانەی ئەوەلی (چوار پۆلی هەبوون)- غازی، مەلگەندی، کانیسکان. لە سەرەتاوە غازی لە گەڕەکی جوولەکان بوو. لە باشووری سلێمانی. هەموو قوتابیەکانی جوولەکە بوون. ئەو ساڵەی ئێمە چووینە قوتابخانە بڕیاردرا بوو قوتابخانەی تایبەتیی جوولەکە نەمێنێت. دیارە بە ڕەسمی هەر بۆ جوولەکە بوون. ئەو ساڵەی ئێمە چووینە قوتابخانە بڕیاردرابوو قوتابخانەی تایبەتیی جوولەکە نەمێنێت. دیارە بە ڕەسمی هەربۆ جوولەکە نەبوو، بەڵام چونکە لەو گەڕەکە بوو و ئەویش لە شار دوورو جیابوو ئەوا هەر بوو بوو بە تایبەتی. بڕیاریان دابوو پۆلێك لە خالیدیە دابڕنو لەگەڵ جوولەکەکاندا تێکەڵیان بکەن. ئیتر نازانم قوتابییە تێکەڵەکانی سێ پۆلەکەی تریان چۆن هێنابوو.

بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیەمان مامۆستا فەوزی ڕەشید بوو، کە تا کۆتایی ژیانی هەر سۆزی باوکێتیو مامۆستایەتیم لێ دەبینی. بە هەموو سەرکەوتنێکم لە ژیاندا گەشەی دەکرد. فەوزی ئەفەندی —بە باوکمی ووتبوو: بە پێی یاسا ئەمساڵ یا تا دوو ساڵ هەقی نییە ببێتە قوتابی، بەڵام لەبەرخاتری جەنابتو نامەی مستەفا ئەفەندی بە گوێگر دەوام بکاتو بۆ ساڵی ئاینده سوود دەبینێو خوا کەریمە. کەسانیتر وەك من هەبوون، قوتابییە گەورەکان (سنفی نیو)- پۆلی نیویان- پێدەووتین بەڵام من بنەمام هەبوو، کوڕە خوێندەوار بووم. لە تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵدا هەریەکەمی پۆلی نیو نا، بەڵکو یەکەمی پۆلی یەکەمیش دەرچووم. مامۆستا فەوزی میهرەبانیی نواندو ناردی بە دوومداو ووتی سبەینێ دوو ڕەسمی (وێنەی) خۆت بێنەو بە باوکت بڵێ تۆ قوتابیی ڕاستەقینەی پۆلی یەکەمی. بەم جۆرە بووم بە قوتابیو نەوەستام.

**کاکە عەلی:**

هەموو کەس لە ژیانی فێربوونو خوێندنیدا چەند مامۆستایەکی خۆیی لە بیرە. هەر شتێکیان لێوە فێربوو بێت دیارە، یا بە ڕەوشتو سیماو کردارێکیاندا بیری دەکەونەوە.

لە زۆر شوێندا باسی (مامۆستای یەکەم) دەکرێت. ئیتر ئەو مامۆستایە یا یەکەم مامۆستای ئەو کەسەیە کە یادی دەکاتەوە، یا مامۆستای یەکەمی گوندێك، شارێك، وولاتێکە.

(مامۆستای یەکەم)ی جەنگیز ئیتماتۆڤ کە لە ڕۆمانێکدا جێی خۆی کردەوە بە نەمری مایەوە.

ئەم مامۆستای یەکەمەی منو کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانم کە هاوڕێی ژیانم پرۆفیسۆرو مێژوونووسی ناسراوی کورد دوکتۆر کەمال مەزهەر یەکێکیانە، شایانی ئەوەیە شەخسیەتو ئەرکی مامۆستایی بچێتە پلەی مامۆستای یەکەمی جەنگیز ئیتمانۆف.

لە دەرسداو لە دەرەوە هەر (کاکە عەلی)مان بانگ دەکرد. هەر بەو ناوەشەوە ناسرابوو. لە بەڵگەو کاری ڕەسمیشدا بە عەلی کاکە ئەمین ناسرابوو. زۆر کەس لایان وابوو کەبە ڕەگەز عەرەبەو هاتۆتە کوردستانەوە، بەڵام لە ڕاستیدا هەر خەڵکی گەڕەکی سەرشەقامی سلێمانی بوو، کەسو کاری زۆرو دیار بوونو ئێستاش هەر ماون. کەوتبووە ئەستەمووڵو عەرەبستانو لەوێوە هاتبۆوە لە دەوری حکوومەتی عیراقدا تاقەتی ئەفسەری نەمابوو بوو بە مامۆستای سەرەتایی.

بەیانیان لە قوتابخانە ئەفەندی بوو. پاش دەوام لەناو بازاڕو لە مزگەوتدا – بە تایبەتی لە مزگەوتەکەی ئێمەدا- بە کەواو چەفتەو عەگالو عەباوە دەبینرا. دەنگی زۆر خۆشبوو، زۆر ڕەفیقی حەمدیەیە فەندیی دەنگ خۆشبوو. کە خاوەن چەند قەوانی کوردی بوو لەوانە مەقامی (ئای ئای). کاکە عەلی پاش نیوەڕوان لەگەڵ حەمدیەیە فەندی ڕوویان دەکردە ٠زگەوتی ئێمەو لای باوکم دادەنیشتنو شەویش زۆرتر یا لە ماڵی شێخ محەمەدی مەحوی، یا لە ماڵی ئێمە بوون، کۆڕیان خۆشدەکرد، بەڵام کاکە عەلی هەر تەواشیحی عەرەبیی دەووت. لەوانەی دەیووت بیرمە (یا صفوة الرحمان)ی لەسەر ئاوازی گۆرانیی (یا نبعە

الریحان) دەووت زۆر جار قورئانی دەخوێند، کە بچووایە هەندێك پرسەی ناسیاوان یەك (عەشەرەی) دەخوێند. شێوەی خوێندن‌و دەنگەکەی تەواو لەوەی قورئان خوێنی بەغدایی (حاجی مەحموود عەبدولوەهاب) دەچوو.

دەرسیشی هەر بە گۆرانی بوو.

زیز.. زیڕ

ئینجا تیپی فێردەکردین

(بـ)ی ئەوەڵ، (ـبـ)ی ناوەڕاست، (ـب)ی ئاخر، (ب)ی بە تەنیا.

(ئڕ) (ڕ) بوو (ئم) (میم) بوو

لەمەودووا خزم‌و مامۆستام جەلال ئەفەندیی مەلا کاکە حەمە، کە بێگومان ناووباسی لەم یادداشتانەدا دێت، دەیووت: هیچ ڕێبازو جۆرێکی دەرس ووتنەوەو ڕەفتاری کاکە عەلی لەگەڵ ئەوەدا ناگونجێ کە ئێوە لە دەرسی پەروەردەو ڕێ‌و شوێنی فێرکردندا خوێندووتانە، بەڵام کەسیش وەکو ئەو قوتابی فێرناکات.

بەڵێ وابوو:

دەرسی: دواندن (یا) (محادثة) دەهات، عەرەبیی فێردەکردین.

-(ماهذا؟)

-هذا انف

ئەمجارە بە کوردی:

ماهذا؟

هذا لووتوون

ئیتر بە (هذا چاو و عین (ید و دەست)دا دەهاتە خوارەوەو هەموویمان بە گۆرانی‌یەوە لەبەر دەکرد. گیرفانی پڕبوو لە نووقڵ، کە دارێکی لە منداڵێکی چەقاوەسوو بدایە، خێرا نووقڵێکیشی دەخستە دەمی‌یەوە. ڕۆژانی سەرمای زستان لە حیاتی بەڕێز لەسەر کورسی دانیشین جێگەمان دوو جوغزی بوو لە دەوری ئەو سۆپایەی بە دار گەرم دەکرا.

جاروبار تووڕە دەبوو جنێویشی بە منداڵان دەدا، جوێنەکەی ئەوە بوو دەیووت: (دانیشە خوری)، کە دەمانپرسی کاکە عەلی خوری مانای چییە، دەیووت: پاش دەرس پێتان دەڵێم لە حەوشە دەیووت: کوڕە خوری مانای مەرەز، مەرەز مانای تەرەس، تەرەس مانای گەواد. بە هۆی ئەو پێوەندییەی مزگەوتەوە، تا کۆچی دوواییشی لە دەروبەری ساڵی ١٩٧٠دا کاکە عەلیم هەر دەدی‌و ئەم زانیارییە عەنتیکەیەشم لە بارەیەوە زانی:

تا مردن ژنی نەهێنا، کە لە سەردەمی ئەودا مووچە بە دەرامەتێکی باش دادەنرا. ئەو لە مووچەی پارمەتیی زۆری هەژاران‌و کەس‌و کاری دەدا، دیاریی بۆ دەکڕین.

کاکە عەلی ساڵ‌و کاتی دەوامی لە سلێمانی دەبردە سەر، پشووی هاوین دەچووە بەغداو سەری لە کۆنە هاوەڵەکانی سوپای عوسمانی‌و (لیوا عەبدولەتیف نووری) دەدا کە پورزای بوو[١٣] لەوێوە دەچوو بۆ (ئەبولخەسیب) بۆ لای شێخ عەبدولقادری نەقشبەندیی هەولێری کە ئەم خۆی بە موریدی دەزانی‌و ئەویش لەو خوارە خانەقای هەبوو. هەموو جار لەو گەشتەی کاکە عەلی‌و دیاریی ئەو خورمای تازە بەر ماڵی ئێمەش دەکەوت.

وەك دەیگێڕایەوە: نووری سەعیدیش هاوەڵی خوێندن‌و منداڵیی ئەوو عەبدولەتیف پاشا بووە. تەنانەت کە پاش ساڵانێکی زۆری لە یەك دابڕان بە هۆی سیاسەتەوە لە نەخۆشییەکدا نووری سەعید سەری لە عەبدولەتیف نووری دابوو، یەکەم کەس هەواڵی کاکە عەلیی پرسیبوو، بەڵام ئەم تاقەتی نەبوو بچێتە لای دەیووت: ئیشم پێی نییە.

---

١٣-لیوا ڕوکنی سوپا بوو، پاش کودەتای بەکر سدقی ١٩٣٦ بوو بە وەزیری بەرگری‌و نیتر تا مردن کەنارگیر بوو، هەرچەندە جەشنە پێوەندییەکی لەگەڵ کامیل جادرچیدا هەر هەبوو.

لەناو ئەو کەسانەدا کە باسی ئەوەم لێ بیستبن کە نووری سەعید لە ڕەچەڵەکدا کورد بوە، کاکە عەلی بوو، تەنانەت کاکە عەلی دەیووت: باوکی نووری سەعید موختاری گەڕەکی (فەزل) بوو. فێستی سووری لەسەر دەکرد.

ساڵی ١٩٦٧ ڕۆژێك لەگەڵ دۆستم چیرۆکنووسی بەناوبانگ عەبدولەلیك عەبدولەتیف نووریدا لە چایخانەی بەرازیلی دانیشتبووین، لە قسەدا کاکە عەلیم هاتەوە یاد. بە پێکەنین دەستی پێکرد: لێرەدا چیم نووسیوە باسی کردو ووتی ئەمانە ڕاستن، پورزای باوکمە، ساڵی جارێك سەرمان دەدات، قوتوویەك یا دووان حەلوای گەزۆ دێنێت، نانێکی نیوەڕۆمان لا دەخوات‌و ئیتر تا ساڵی داهاتوو نایبینینەوە. لە منداڵییەوە چۆنم دیووە هەر وایەو لە هیچ مەیدانێکدا شتێکی تازە فێر نەبووە.

هەر ئەو ساڵە هاتمەوە سلێمانی، ڕێکەوت کە کاکە عەلیم دی، باسی عەبدولەلیکم بۆ کرد، هەر زۆر لای سەیر بوو من‌و ئەو یەکتربناسین، لەوە سەیرتر ئەوە بوو پاش تاوێك تاڵە دەزوویەکی پێوەندیی نێوانمانی بەبیردا بێت‌و بڵێت:

-ئای شیوعی، هەمووتان یەکتر دەناسن.

بە ڕەحمەت بێت کاکە عەلی، بۆ من وای فێری خوێندن‌و نووسین کردم، هاوینی تەواوکردنی پۆلی یەکەم نامە بنووسم، ڕەنگە زۆر هاوەڵی تریشم هەروا بووبن، بێگومان بە پاکی‌و ڕەوشتی بەرزو سۆزو ئەو شێوە فێرکردنە سەدان کوڕی سلێمانیی پێگەیاند[14].

---

١٤-شەخسیەت‌و ژیانی کاکە عەلی بۆ کەرەسەی شانۆگەری دەست دەدات. ڕەنگە نووسەر لەگەڵ کاك حسین عەلی کەمال-ی پارێزەردا کە دایکی ئەو برازای کاکە عەلییە بیرو زانیاریی نووسەری شانۆگەری دەوڵەمەند بکات.

## زمانی زگماك

زۆر شت لە ژیانی ئەم مرۆڤەو ئەو مرۆڤ لە یەکدەچێت منداڵیی زۆر کەس لەگەڵ یەکتردا لە یەکچونیان تێدایە، نووسەر گەورە بێ یا بچووك، گەورەیی‌و بچووکیش بە بەهرەیە. پاش ئەوە بە زۆریی بەرهەم، دەڵێم نووسەران بە گەورەو بچووکیانەوە زۆر سەرەتایان لە یەکتر دەچێت‌و کانی تەقینەوەی ئیبداعیان زۆر جار لە یەکتر نزیکە، با وولات‌و زمانیشیان لە یەکتر دووربن:

دیسان جەنگیز ئیتمانتۆڤ نووسیبووی:

(ڕەنگە ئەنکم بێ ئەوەی پێبزانێت خۆشەویستیی زمانی زگماکی لە دڵمدا چەسپاند. زمانی زگماك.. ئای کە لە بارەیەوە نووسراوە، هیچ ڕێگەیەك نییە ئەفسوونی قسەکردن بە زمانی زگماك ڕوون بکاتەوە، دەروونیش تێر لەو شاعیرێتییە ناخوات کە لە ئەزموونی گەلەوە هەڵدەقوڵێ. لە ڕێگەی ئەو ووشە ڕەسەنەوە نەبێت کە مرۆڤ لە منداڵییەوە پێی چەش بووە، ووشەش نەبێت هیچ شتێکی تر نییە ببێتە سەرچاوەی یەکەمی شانازیی نیشتمانی مرۆڤ‌و چێژی جوانیی چەند سووچ‌و مانای زمانی باوو باپیری پێ ببەخشێ. منداڵی هەر سەردەمێکی ڕەنگین نییە. بەڵکو منداڵی ناوکی دروستبوونی لەمەودوای شەخسیەتی مرۆڤە، لەو سەردەمەدا زانینی ڕاستەقینەی زمانی زگماك دەچەسپێت، هەر لەو سەردەمەدا مرۆڤ هەست بە پێوەندیی خۆی لەگەڵ خەڵکیترۆ سروشتی دەوروبەرو کەلەپەری تایبەتی دەکات.

ڕەنگە بڵێم، هیچ نەبێ بە پێی ئەزموونی تایبەتیی خۆم، مرۆڤ دەتوانێ لە منداڵییەوە بە قووڵییەکی لە ڕەگەوە فێری دوو زمان ببێت کە لە یەك کاتدا دێنە ڕێگەی، ڕەنگە بڵێم دوو زمان زیاتریش، کە لە ساڵانی یەکەمدا وەك یەك کاری تێبکەن).

لەوانەیە ئەم سەرەتاو ئەزموونەی ئیتماتۆڤ لەگەڵ سەرەتای زۆر نووسەری ڕۆژهەڵاتدا یەکبگرنەوە، بەڵام دەتوانم من لە سەرەتای خۆمدا جیاوازییەك ببینم.

هەموو بە فۆلکلۆرو بە لایلایەی دایك دەستپێدەکەن کە دیارە یەکەم ئاوازی گۆرانیو مۆسیقایان لە بناغەی دەروونو بۆچووندا دروستکردووە، بێگومان کەسیش لایلایەیەکی لەبیر نییە. کە بۆ خۆیکراوە، بەلام حیکایەتی نەنكو داپیرەیان لەبیرە. کە گەورە بووم سێ منداڵیش لە ماڵدا بە دووای مندا هاتوون. لەوە گەیشتم کە دایکم نە ئەو دەنگخۆشە بوو کە مۆسیقای کاریتێکردبم، نە ئەوەندە لایلایەی دەزانی، لە هەموو چەمکێکی پێوەندیی ئەو فۆلکلۆرە چەشنە لاوانەوەیەکیم لەبیرە کە بە (چوومە شەرای مەرگ عەجەب نەمردم) کۆتاییدەهات.

لە حیکایەتی دوو نەنك، دایکمو باوەژنی باوکم تەنیا چەند دیمەنم لەبیرە

-ئەحمەد بۆ کوێ دەچیت

-وەك دەزانیت ناوم ئەحمەدە دەشزانی بۆ کوێ دەچم. یا ڕێگەی دوور بڕینو حەوت کاڵاو پێتاوی ئاسن شکاندن، یا دێو وابکات- کانی یا ڕووبار ڕەنگی ئاوی بگۆڕێت. بۆ منداڵی بڵێم (منو فۆلکلۆر) ئاو بێنەو دەست بشۆ. بەلام بە گەورەیی ئاڵۆدەی تەواوی فۆلکلۆر بووم. ڕەنگە دوورکەوتنەوەکەی منداڵی دوو هۆی هەبێت، کە لە حیکایەتیدا بە (شەولەبان) دەیانترساندین باوکم یەکسەر توورە دەبوو، دەیووت: مەیترسێننو لە منی دەگەیاند کە (شەولەبان) باگردێنە. لەولاشەوە لای وابوو نابێ گوێم بە باسی پڕوپووچی دێوو درنج پڕبکرێت. لە مامۆستاکانیشماندا عەبدولواحید نووری ئامۆژگاریی ئەوەی دەکردین کە زۆر گوێ لەو پڕوپووچانە نەگرین[١٥]!

سەرەتای پێوەندیی من لەگەڵ شیعرو ئەدەبدا جیاوازە چونکە یەکسەر چوومەتە سەر سەرچاوە ئەدەبییەکە خۆی هەر بە منداڵی زۆربەی شاعیرانی سەردەمم دیوە، لە مەجلیسی شاعیراندا دانیشتووم.

---

١٥-ئەممەشم لا سەیرە، ڕەنگە لایەنی پەروەردەو منداڵ نەترساندن بەسەر بیرو هەڵوێستی ئەو ڕووناکبیرە گەورەیەدا بەرامبەر بە فۆلکلۆر زاڵبووبێت.

ژوورەکـەی بـاوکم لـە مزگـەوتی حـاجی مـەلا ڕەسـووڵ (باشچـاوەش) سـەر سەکۆی مزگەوتەکەو چالێنانی بن دارە ڕەشە بەناوبانگەکەی مزگەوت. هەر پێم گرتو توانای ڕۆیشتنم هەبوو باوکم لەگەڵ خۆیدا دەیگێرام، هەر لە بیرەوەریی منداڵیدا هەیوانی خانەقای مەحوی، باخچەکەی مەلا ئەسعەد لەو خانەقایە، حەوشەی مزگەوتی بابە عەلیو کۆبوونەوەی مەلایانو شاعیرانم لە بیرە. زۆر منداڵبووم هێشتا مامم (مەلا ئەحمەد- فائیز) پێش نوێژو مودەڕیسی مزگەوتی عیرفان بوو کە داوای چوونە ماڵی ئەوانم بکردایە لە گەڕەکی شێخان باوکم بە یەکێکدا دەینـاردمو ئێـوارە یـەکێك لـە ئامۆزاکانم کاك قادر یا کاك جەلال دەیانهێنامەوە. ڕاڕەوی ئەو مزگەوتەو سێ سوچکەی هەمیشەیی مامەو زێوەرو مەلا سەعیدی کابانو کۆڕی شیعرو ئەدەبو موناقەشەی مەلایانەو دامەکردنیانم لەبیرە.

لە شاعیران بێخود لە هەمووان زیاتر هاتوچۆی باوکمی دەکرد، شەوی زستان لەسەر خوانی شیعرو ئەدەبو شەوچەرە کۆدەبوونـەوە، بـە منـداڵی ڕەنگینترین پارچە شیعری بێخودیان پێ لەبەر کردم:

لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من

هەرچەند دەگەڕێم بێ سەرو شوێن ماوە دڵی من

هێشتا هەر لە پۆلی سێیەمی سەرەتاییدا بووم مامم (ن. ئاری) عەسرێك بردمییە دیوەخان یا داڵانەکەی ماڵی ڕەمزییە ئەفەندیی مەلا مارف (م. ڕەمزی). شیعریان پێ خوێندمەوەو ڕەمزی بەو جۆرە پڕ زەمزەمەیەی خۆی فێری شیعر خوێندنەوەی دەکردم.

لە منداڵیمدا پیرەمێرد، فایەق بێکەس، فایەق زێوەرم لە ماڵی خۆماندا دیوەو گوێم لە شیعر خوێندنەوەیان بووە، وابزانم یادگارێکی بەنرخم لە بارەی گەشتەکەی مامۆستا گیوی موکریانییەوە بۆ سلێمانیو ڕەسمگرتنی شاعیرانەوە لە گۆڤاری (ڕەنگین)دا نووسیوە.

لە قوتابخانە، تا لە (غازی) چوار پۆلیبووم مامۆستای سەر بە شیعرو ئەدەبو کوردیمان نەبوو. لەبەرئەوە لە پارچەیەکی زێوەر بەولاوە (خێرو سەدەقە بدە بە فەقیر) هیچ شتێکیتریان پێ لەبەرنەکردبووین، کە چوومە قوتابخانەی شەش پۆلیی (فەیسەلیە) ئەوە مامۆستاکانی جیهانێکی نوێیان بۆ خستینە سەرپشت. جارێك لە ریزدا مامۆستا (شەوکەت محەمەد) قوتابییەکی هێنایە دەرەوە بۆ شیعر خوێندنەوەکە دەستیپێکرد: خێرو سەدەقە.. هتد توورە بوو و ووتی لە (غازی)یەوە هاتوویت تەواوی مەکە.

ئەو مامۆستایەمان ئەو سەردەمە زۆر چالاكو خوێنگەرمبوو، دەمانزانی کە خوشکەزای ئەمین زەکی بەگە. یەکەم دەرسی قوتابخانەکە باسی کوردایەتی تێدا کرابێت دەرسێکی ئەو بوو، هەموو دەرسەکە باسی مستەفا کەمالو ئازاردانو کورد قرانی بۆ کردین، لە دەرسێکی پاش نیوەڕۆدا پارچەی (ئەی گردی سەیوان)ی ئەخۆلی بۆ نوسینەوەو بۆی شەرحکردین. کە بۆ سبەینێ بەیانی لە ڕیزدا منی هێنایە دەرەوەو یەکسەر (ئەی گردی سەیوان)م خوێندەوە، سەرسامبوو، پاشان بانگیکردم لێی پرسیم ئەو شیعرەت پێشتر لەبەر بوو، ووتم: نەخێر، جەنابت دوێنێ پێت نووسینەوە من شەو لەبەرمکرد، زۆری پێخۆش بوو، شێوەی وەڵامدانەوەکەشی بۆ منداڵێك لا سەیر بوو، ئیتر زۆر گوێی دەدامێ، لە تاقیکردنەوەی سەری مانگدا نەخۆشبووم، بەڵام خۆی ٩٥٪ی بۆ دانابووم، ئەمە یەکەم دەرسی بایەخدان بە قوتابیی باشبوو لە ژیانمدا. قوتابییەکی تەمەڵمان لەگەڵدا بوو، دەیووت: هەموو شت بە بەختە، ئەو لێرە نەبووە ٩٥ی وەرگرتووە، من چەند لاپەڕەشم بۆ نووسیوە کەچی ٢٠٪ی داومەتێ.

مامۆستا شەوکەت وەك شیعری پێ لەبەردەکردین، ئەو سروودانەشی فێردەکردین کە خۆی ئاوازی بۆ دانابوون وەك: (کوردستان جێگای بێچووە شێرانە)ی محەمەد ڕەسووڵ هاوار. پاش نیوەڕۆیەك تیپی سروودی هێنایەوە،

من دەنگم خۆشنەبوو، بەلاّم لەبەر زوو شیعر لەبەرکردن لە تیپی سروودا بووم. (ئەی بانگی کورد)ی بۆ نوسینەوە، کە ئێمە خۆبەخۆ خەریکی لەبەرکردن بووین، ئەو کەوتبووە دەستجوولاّندن‌و دەنگەدەنگ، ئاوازی دادەنا.

کە ئاواز لەدایکبوو، فێریکردین، دوایی تێگەیشتین ئەمە شیعری موتەسەریفی لیوا، لیوا ڕوکن بەهائەدین نووریە، بە تورکی بۆ گۆڤاری (بانگی کورد)ی نووسیوە، پیرەمێرد کردوویەتی بە کوردی‌و دەبێ سبەینێ لە بەردەمی موتەسەریفدا بۆ بەخێرهاتنی ئەو سرودە بوترێت.

عەبدولواحد نووری کەڵەپیاوو ڕابەری مەیدانی قەڵەم‌و خەباتبوو، بەلاّم هەر تا بەهاری سالی ١٩٤٤ دەرسی پێووتین‌و ئیتر چووە ماڵەوەو لە ٤ی تەمووزی ١٩٤٤دا کۆچی دواییکرد. ئەو چەند مانگەی دەرسی بە ئێمە دەووت نەخۆشی پەکیخستبوو، دەنگی نووسابوو. دوو دەفتەری خۆی هەبوو بۆ (مێژوو) و (جوگرافیا)، پێی دەنووسینەوەو جاروبار بە کورتی هەندێك قسەیدەکرد. ئیتر ئەو سوودەی قوتابیانی پێشووی لێیانبینیبوو ئێمە نەماندی.

یەکەم دەرس‌و رووکردنە ڕۆژنامەگەریم، یا یەکەم خشتی تەلاری ئەو ئالۆدەبوونەش هەر لەو قوتابخانەیەدا بوو، مامۆستایان فازیل عیرفان‌و محەمەد تۆفیق ڕۆژنامەی دیواریان بۆ ڕێکخستین داوای نووسینیان لێکردین، منیش دەستم دایە قەڵەم. کە نووسینەکەمم بەسەر دیوارەوە دی ئەوەی من نەبوو بەلاّم تامی ئەوی تێدا مابوو، ئەوەو بینینی ناوی خۆم لە دەنگ‌و باسدا کە لە تاقیکردنەوەی مانگانەدا یەکەمبووم گەشەی دیاریان لە دڵی منداڵیمدا دیاربوو.

گەورەترین پێوەندی من‌و چەند هاوەڵێ لەگەڵ کوردیدا لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییەوە بوو. مامۆستا کەریم زەند تازە بووبوو بە مامۆستا، بەلاّم یەکسەر سێ دەرسی پۆلی شەشەمی درابوویە، مێژوو، جوگرافیە، مەدەنیە (کە زانیاریی گشتی بوو). کە گەورەتر بووم لەوە گەیشتم کە لە دەرسی مەدەنیەدا بە شێوەیەکی گشتی ساکارو بە جۆرێك کە تێی بگەین

نــاوەرۆکی نامیلکــەی (مــن مســتلزمات کفاحنــا الــوطني)ی فەهــدی بــۆ ڕوونکردبووینەوە. کاك کەریم هەردوو ڕێبازی کوردایەتی‌و پێشکەوتنخوازی کردبووە کەرەسەی دەرسەکانی. نووسینی کوردیی لاتینیی فێرکردین. ئەو سەردەمە تازە کوردیی پەتی بلاوبووبۆوە بە کوردی پەتی هەرسیێ دەرسی پیێ دەنووسینەوە. چونکە کتێب نەبوو. بەلام دەفتەرێکی بۆ ووشەی کوردیش پیێ تەرخانکردبووین، کە پێی دەنووسین: نیشتمان، نیشتمانی.. هتد. دەیووت: بەلام لە بەکەلۆریدا بنووسن: وەتەنی، وەتەنیەت، چونکە لەوانەیە ئەو مامۆستایانەی سەیری دەفتەرەکە دەکەن ئەو ووشە تازانە نەزانن، کوردییە پەتییەکە بۆ ئێمەی منداڵیش هەر هەندێك پێکەنینی تێدەکەوێت. بە ڕاستی زۆر بەوە پێکەنین کەلە باسی پیشەسازیدا- لە پێشدا پێی نووسین: میری: حکوومەت، پیشەسازی: صەناعەت، کارخانە: مەعمەل. ئەوسا پێی نووسین: (بۆ ئەوەی پیشەسازی لە وولاتدا پێشکەوێت ئەبیێ میری یارمەتیی کارخانەچییەکان بدات) چونکە ووشەی (کارخانەچی) بەجنێو بەکاردەهات.

ئەو کاتە بە مامۆستامان دەووت ئەفەندی. ووشەی مامۆستا هەر لە حوجرەو مزگەوتدا بەکاردەهات. لەبەرئەوە ئەبیێ بڵێم چالاکیی کەریم ئەفەندی هەر لە دەرسدا نەبوو، بەڵکو هەوڵی دەدا لە زۆر مەیدانیتردا مامۆستا بێت. چەند هاوەڵێکمان هەبوو ئەوساو باوەڕبکە تا ئێستاش قوماریاندەکرد. نیتر پاش نیوەڕۆ یا لە دەشتی سەرقەبران، یا گاوران یا تەیارەخانە (عەقاریی ئێستا) کۆدەبوونەوە. کەریم ئەفەندی بە دوویاندا دەگەڕا. فەڕاشێکی دەبرد ڕاویدەنان‌و کاغەزی قومارەکانیانی دەدڕی.

سەرمان لەوە سوڕمابوو چۆن هەموو ڕۆژ جێگەی تازەیانی دەدۆزیەوە. کەوتنە بەدووادا گەڕان، تا دۆزیانەوە. ئیتر ئەو قوتابیە کلۆڵەیان ناونابوو جاسووسەکەی کەریم ئەفەندی.

کاك کەریم ئەوساو ئێستاش خاوەنی شەخسیتی تایبەتیو بیرکردنەوەی تایبەتیی خۆیەتی. ڕۆژێك هاتە پۆلی دەرسخانەوە ووتی: تاقیکردنەوە نییە، تاقیکردنەوە نییە. هەر پرسیارێکە، ناوی خۆشتان مەنووسن.

پرسیارەکەی ئەمە بوو: (ڕاتان بەرامبەر من چییە؟). ئیتر ئێمەی منداڵی بەسزمان کەوتینە مەدحو سەنا. لە ڕاستیدا ستایشی دەرس ووتنەوەو کوردی فێکردنمان دەکرد. هەندێك باسی بەدووای قومارچییەکاندا گەڕانیاندەکرد. بە ئەسپایی قومارچییەکان جنێوێکیان دەدا. لە پڕ کاك کەریم زەرد بوو، بانگیکرد: ئەمە کێ نووسیویێتی؟ کەس قسەینەکرد. چەند سوێندی خوارد کە زویر نابێت هیچ دەنگ ناکات. هەر دەیەوێ بزانێ چۆن ئەو قوتابییە زانیویێتی ئەو لە ماڵەوە توڕەو تڕۆیەو شت دەشکێنێت (هێشتا ژنی نەهێنابوو). کە زۆری پرسی لەناوماندا ڕەحمەتی شەماڵ سائیب دەستی هەڵبڕی. ئیتر کاك کەریم هەر ئەوەندەی ووت: ڕاست دەکەیت، ڕاست دەکەیت، ڕەخنە لە خۆم دەگرم، ئیتر توڕە نابم.

هەر لەم قوتابخانەیەدا کۆمەڵێك یادگاری تری سەر بە زمانو ئەفراندن تۆمار دەکەم

هەر مامۆستا محەمەد تۆفیق لیژنەی زمانو خوتبەدانی بۆ دروستکردبووین، لیژنەکە ڕۆژنامەی دیوارو کۆبوونەوە یا کۆڕی خوتبەدانو شیعر خوێندنەوەی هەبوو. لە هەمووومان بە تەمەن گەورەترو چالاکتر قوتابی محەمەد مەجید بوو (باوکی سەلاح محەمەد)ی شاعیر. وا دیارە درەنگ هاتبووە قوتابخانە، یا مابۆوە. بەلام بۆ قوتابیەکی پۆلی شەشەمی سەرەتایی نووسینو شیعردانان کارێکی گەورە بوو، هەروەك هێندەی مامۆستایەك چالاكو ڕێکخەر بوو. بە باربۆی هەمووومان کتێبخانەیەکی باشی بۆ لیژنەکە کۆکردەوە قوتابیان کتێبیان لێ وەردەگرتو لە ماڵەوە دەیانخوێندەوە. دەبوو ئەو محەمەد مەجیدە ڕووناکبیرێکی گەورەی لێ دەرچێت بەلام ئەوە بوو لەبەر تەمەن زۆری لە کۆتایی ساڵدا بردیان بۆ

کەرکووك بۆ عەسکەری، هەوڵی بەڕێوەبەرەکەمان مامۆستا فوئاد ڕەشید بۆ ڕزگارکردنی سوودی نەبوو. هەموومان تا گەراج ڕەوانەمان کرد، ئیتر من تا ساڵی ١٩٥٨ لە ژیانی گشتیدا نەمدیوە. تا لە پاش شۆڕشی چواردەی تەمووز لە بارەگای لیژنەی محەلیی حیزبی شیوعی بە کارمەندی دیمەوەو هەر ئەو جارەشبوو. محەمەد مەجید شیعری بە ناوی (جەنگی)یەوە دەنووسی لە من بچووکترو چالاك لەو لیژنەیەدا کاك عەبدوڵلا ئەژدەر بوو.

قوتابخانەیەك مامۆستا فوئاد ڕەشید بەڕێوەبەری بێت، بێ کارو چالاکیی هونەری نابێت، لە پۆلی شەشەمدا بووین ساڵی ١٩٤٤-١٩٤٥ خرایە لیژنەی (تەمسیل)ەوە، کە ئێستا بیر لەو پلەی تەمسیل‌و دیکۆرو دەرهێنانە دەکەمەوە، ئەو پلە بەرزەم دێتەوە بەرچاو کە زۆر زوور توانای قوتابخانەیەکی سەرەتایی بوو.

(لە پێناوی نیشتماندا) وەرگێڕانی (فی سبیل التاج)ی مستەفا لوتفی مەنفەلووتی (منفلوطی)یە کە نازانم بۆچی تا ئێستا بە خەیاڵما نەهاتووە بزانم ئەو لە کێی وەرگرتووە، کە دیارە دەبێ لە چیرۆکێکی فەرەنسییەوە بە دەستکارییەوە وەرگێڕرابێ. ئەم شانۆنامەیە وەرگێڕانێکی کوردیی چاپکراوی هەیە کە (ن. ناری)ی مامم وەریگێڕاوە، بەڵام تەمسیلەکەی ئێمە وەرگێڕانی ئەو نەبوو، وا ئەزانم وەرگێڕانی یەکێك بوو لە مامۆستاکانی خۆمان. ئەوەندەش هەیە شاعیری ناودار فایەق بێکەس کە ئەو کاتە مامۆستای قوتابخانەی مەڵکەندی بوو هەموو ڕۆژ دەهات بە پێی ئەو ڕۆژو پلەیە بەشداریی دەرهێنانی دەکرد، دیارە بەشداری وەرگێڕانیش بووە.

ئێستا ئاوڕ دەدەمەوە تواناو وزەی گەورە لە منداڵییەوە پەروەردە بکرانایە بە گەورەیی چی دەردەچوون، بۆ نموونە: قارەمانی شانۆگەری ڕەحمەتی کەمالی شێخ جەلال بوو (برای ڕەحمەتی ئەمین‌و شەهید ئارام) زۆرتر لە خەتیبێك دەچوو، مامۆستا فوئاد دەیووت: دووارۆژی هەیە، بەڵام ژیان هەر بەرەو

پیشەسازی‌و دوکانەکەی باوکیی برد. مامۆستا محەمەد تۆفیق بە زۆر قەناعەتی بە ڕەحمەتی ئەوڕەحمانی حاجی عەبدوڵڵای بۆسکانی کرد کە دەوری باوکی قارەمانەکەی ببینێ چونکە دەیووت: لە تەمسیلیشدا خیانەتم پێ ناکرێت. پاش ئەوە بە دوو ساڵێك لە پلەی ڕووناکبیرانی شاردا بە قارەمانیی ڕەفیق چالاك ئەو چیرۆکە بۆ باربۆی بەر بە گومەلەرزە کەوتووانی پێنجوین پیشاندرا. بەڵام ئەوە کارێکی هونەریی گەورەتر بوو.

لە سەرەتاییەوە بۆ ناوەندی. هەموو خوێندن بوو بە عەرەبی. بە هەناسکە برکێ دەمانویست لە عەرەبی بگەین، عەرەبی فێربین. وەك هەموو خوێندن بە عەرەبی بوو، زوربەی مامۆستاکانیشمان عەرەببوون. بە زۆر ڕێگەدا بۆ گونجاندن‌و فێربوون دەچووین، یەکێکیان لیژنەی تایبەتی‌و چالاکیی پاش خوێندن بوو. هەرچەندە ڕۆژنامەی دیواری هەندێك لیژنە هەر بە کوردی بوو.

لە ساڵی ١٩٤٥-١٩٤٦ەوە چەند کتێبخانە لە سلێمانی دانرا. وەك دەرکەوت ئەم کتێبخانانە سەر بە حیزبەکان بوون. کتێبخانەی ڕووناکی سەر بە کۆمەڵەی یا حیزبی ڕزگاری‌و پاشان بە پارتی دیموکراتی کورد. کتێبخانەی (بیری نوێ) سەر بە حیزبی (تەحرور) یا حیزبی شیوعی بوو. ئەمانە لەپاڵ ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێب فرۆشتندا بە پارە شەوی بە ئانەیەك (عانەیەك)[16] کتێبیان دەدایێ. دەمانخوێندەوە، دەمانبردەوە. لەو سەرەتای خوێندنەوەیەدا ڕۆمانێکم لە بیرە بە عەرەبی (اهوال الاستبداد) ناونرابوو. پرسم بە خاوەن کتێبخانە کرد زۆری

---

١٦-ئانە، یا عانە پارچە دراوێکی سپی بوو بە چوار فلس دەچوو کەچی لە قەڵادزێ بە پێنج فلس دەچوو پێیاندەووت عانەی بابەکر ئاغا (بابەکر ئاغای سەلیم ئاغای سەرۆکی میراودەلی). ڕۆژان گۆڕرا عەبدولکەریم قاسم بڕیاری دا عانە پێنج فلس بێت. ئەودەمە گرۆڵەی بەرەو لێژی هاتبوو، خەڵکی بۆ گاڵتە دەیانووت:

عاش الزعيم الزيد، العانة فلس.. واتە بژی ئەو سەرکردەیەی فلسێکی بۆ عانە زیادکرد.

پێخۆشبوو بە وردی بە قەڵەمی قورقوشم مانای وشەکانی بکەم بە کوردی. دیارە منیش وشە بە وشە لە باوکمم دەپرسی‌و لەسەر کتێبەکە دەمنووسی، ئینجا جاری دووەم کتێبەکەم خوێندەوەو تێی گەیشتم. رەنگە بڵێم لەززەتی ئەو رۆمانە تا ئێستا لە دەروونمدایە. کە رووسی فێربووم، یا چوومە مۆسکۆ، دەمویست بە ناوی قارەمان‌و رووداوی رۆماندا بیدۆزمەوە. ئەوسا تێگەیشتم کە ئەوە بەشێکە لە رۆمانی (پەترۆسی یەکەم)ی ئەلکسی تۆلستۆی‌و وەرگێری عەرەبی ئەو ناوەی لێناوە.

هەرکە باسی ئەو لەززەتی خوێندنەوەیە دەکرێت، ئەوا خۆشیی (کەمانچەژەن)ی پیرەمێردم لەبیرە کە هەر لە تورکی‌یەوە کردبووی بە کوردی‌و نووسیبووی —تۆفیق- میر ئالای لە ئەڵەمانی‌یەوە وەریگێڕاوە، ئێستاش دیمەنی لە پلەی سەرەتاییدا هەفتە بە هەفتە لە رۆژنامەی ژیندا (کەمانچەژەن)مان خوێندەوە کە پیرەمێرد ئەلفرێد مۆللەرە فەندیم لەبەرچاوە، بەڵام بۆ من ساغ نەبۆتەوە ئەوە وەرگێڕانی چ رۆمانێکە. هەرچەندە دەڵێن رۆمانی هانس ئەندەرسنە.

کۆمەڵێك بووین کتێبمان دەدا بە یەکترو رشتەی خوێندنەوەمان یەکبوو. لە هەموویان دیارترو بەردەوامتر کاك کەمالی کەریم بەگ (دوکتۆر کەمال فوئاد) بوو. باوکم زۆر ئالۆدەی چیرۆکە مێژوویی‌یەکانی جورجی زێدان بوو. شەوان دۆست‌و کەس‌و کاری کۆدەکردەوەو یەکێك لەو حیکایەتانەی بەرە بەرە بۆ دەخوێندنەوە یا یەکسەر بۆی دەکردن بە کوردی، بە نووسینیش چیرۆکی (شازنی غەسسان- فتاە غسان)ی کردووە بە کوردی. بە داخەوە تا ئێستا چاپنەکراوە. ئەمە منی بردە سەر چیرۆکەکانی جورجی زێدان. لە پلەی ناوەندی‌و ئامادەییدا هەموویانم خوێندەوەو برادەرەکانیشم هەر خەریکی خوێندنەوەیان بوون. لەو لاوە بەرەو بیری چەپ دەهاتین. ئەوەی دەستدەکەوت زنجیرەی (اعلام الحرية) قەدری قەلعەچی بوو، هەموویانم خوێندەوە.

کاك جەمال فوئاد لە بیرووت دەیخوێند هەندێك کتێبی عومەر فاخوریی بۆ کاك کەمال هێنابوو. دەستمانکرد بە خوێندنەوەی کتێبەکانیتریشیو بە هەوڵی زۆر پەیدامان دەکرد. لەوانە (الحقیقە اللبنانیە..) و (الباب الموصود)م لەبیرناچێت.

لە پاڵ ئەم ڕێگایانەی خوێندنەوەدا دوو ڕێگەی هەمیشەیی ترمان هەبوو. یەکەم: کتێبخانەی گشتیی سلێمانی، کە ڕۆژی چەند سەعاتێك لەوێ بە کتێب خوێندنەوەوە خەریك دەبووینو دوکانی قادری ئاغای عەتاریشمان هەبوو.

ئەم دوکانە شتێکی سەیرو مەڵبەندێکی ڕووناك بوو. شەخسیەتی قادر ئاغا سێبەری خۆی بەسەر دوکانەکەو هاتوچۆکەرانیدا کێشابوو.

ڕۆژنامە لە بەغدا دەردەچوو بۆ نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی بە پۆستەدا دەگەیشتە سلێمانی. لەوێ دابەشکەرێك هەموو ڕۆژنامەکانی پێکەوە دەنارد. لێرەش قادر ئاغا تاقە وەکیل بوو وەریدەگرت، دابەشی دەکرد بەسەر ڕۆژنامە فرۆشەکانیتردا، ئابوونەکان، ئەوانی تری دەفرۆشت. لە هەر ڕۆژنامەیەك ژمارەیەك، دووانی لەسەر مێزێك لە دوکانەکەدا دادەنا، کورسی بە دەوری مێزەکەدا بوو، خەڵك دەهاتن. بە عانەیەك هەموو ڕۆژنامەکانیان دەخوێندەوە. ڕۆژنامەش زۆر بوون، نزیکی دە ڕۆژنامە لە بەغدا دەردەچوو. ئەوانەی دەهاتنە دوکانی قادر ئاغا دیاربوون، واتە چەند کەسێك بوون لە هەموو چینو توێژو تەمەنێك. ئەمانە حەزیان لە خوێندنەوەی هەموو ڕۆژنامەکان دەکرد، نەك تەنیا ڕۆژنامەیەك بکڕنو بڕۆن. ڕۆژی چەند سەعاتێکمان لەوێ دەبردە سەر. زۆر کەم کەسانیتر دەهاتنو ڕوو دەگۆڕرا. لە ئەوڕەحمان بەگی بابانەوە تا ئێمەی قوتابی، هەریەکەش بە دەم خوێندنەوەوە تەعلیقی خۆی دەداو قادر ئاغایش گوێی بۆ هەمووی هەڵدەخستو قسەی خۆیی دەکرد. هەندێکیش بووبوو بە ئەرك کورتەی سەر ووتارو شتی تازە بۆ قادر ئاغا بکەن بە کوردی. کاك عەزیز فەرمانبەری ئاوو کارەبا زوو زوو دەیووت:

"قادر ئاغا ئەمە دەڵێ..".

من زۆرتر لەگەڵ جوامێردا پێکەوە دەچووین‌و دەگەڕاینەوە. جوامێر (دوکتۆر جوامێر مەجید سەلیم) دراوسێی ماڵ بە ماڵەوەو ڕەفیق‌و هاوڕێی خەباتی سیاسی دووایم بوو. ماوەیەکی زۆری ژیانمان پێکەوە بردە سەر، کە لەمەو دووا باسی دێت[١٧].

مامۆستا عومەر ساقی دەهات. هەر مانشێتی ڕۆژنامەکانی بەسەر پێیەوە دەخوێندەوە. کە ڕۆژنامەیەك بەدەست یەکێکەوە دەبوو ئەو ئۆفەرەی لێ هەڵدەگیرا. پەلەیبوو بڕوات، ڕۆژێك بەسەر جادەدا لەگەڵ باوکمدا دەڕۆیشتین، مامۆستا ڕایگرتین تۆڵەی هەموو کەسی لە من کردەوە. بە باوکمی ووت: بەمە بڵێ ئیتر ڕۆژنامە نەخوێنێتەوە. ئەمەو خزمەکەی، دێن، ئیعلانات دەخوێنن، مودیر مەسئوول‌و ڕەئیس تەحریر دەخوێنن. خەڵك پەلەیانە ئەمەو خزمەکەی جەریدە دەگرن.

ئیتر تا لە باوکمم گەیاندو من‌و جوامێر لە بڕیاری ڕۆژنامە نەخوێندنەوە ڕزگارمانبوو فێر ووتی چەق. دوکانی قادر ئاغا پێشتر بەرامبەر بە خەستەخانەی خوارەوە بوو (جێ خەستەخانەکە ئێستا پارکی ئوتومبیلە لە خوار بازاڕی عەسرییەوە "ئێستا تەلاری کاوەیە"). بەڵام کە ئێمە بووینە هاتوچۆکەر لە شەقامی سابوونکەران لەسەر سووچی ئەو کۆڵانە بوو کە بۆ گەڕەکی قەزازەکان دەچوو. تا کۆچکردنی قادر ئاغا (بە ڕەحمەت بێت) ئەو مەڵبەندەمان بوو. لە هاوەڵانی ئێمە دوکتۆر کەمال فوئاد لە ئەورووپاش قادر ئاغای لەبیر نەکردبوو جاروبار کارت‌و کتێبی بۆ دەنارد.

هەرچی کتێبخانەی گشتییە، کە ساڵی ١٩٤٥ لە کاتی موتەسەرڕیفیی مارف جیاووکدا کرایەوە، ئاهەنگێکی گەورەی بۆ گێڕرا، ئەوانەی لە ماڵەوە

---

١٧-ئێستا کە ئەم یادداشتانە بۆ بە (کتێب) بوون ڕێك دەخەم. چەند مانگێکە جوامێر ماڵئاوایی لێکردووین. بێگومان بە نووسینی شایان بەوەوە دێمەوە سەر باسی.

کتێبخانەیان هەبوو باربۆی کتێبخانەیانکرد. نازانم چۆن هەڵبژێردرابووین، بەڵام دەزانم کۆمەڵێك قوتابییان بەڕێز بردبوو. یەکەمجار کتێبخانەکە لە خانوویەکی یەکتابەگدا بوو تەنیشت ماڵی خۆیان لە سابوونکەران، وابزانم خانۆکەش هەر بە خۆڕایی درابو بە کتێبخانە. لە بیرمە قادر ئاغای حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکلی زادە لە هەموو کەس زیاتر کتێبی بەخشی. خەڵك دەیانووت پشتی پێوەی نەئێشاوە، بە ڕەنجو خوێندەواریی باوکی کۆکراوەتەوە. لە ڕاستیدا لە باوکمم بیستووە کە حاجی مەلا سەعید تاقە کەسبووە هەمیشە لیرەی زۆری ئاڵتوونی ناردووە تا لە ئەستەمووڵو پاشان لە بەغداوە کتێبی باشی بۆ بێتو خۆیشی لە ئەستەمووڵەوە زۆری هێناوەتەوەو مەلاکانی سلێمانیشی بێ بەش نەکردووە.

دووایی کتێبخانە چووە ماڵی شێخ کەریمی حەفیدەوە نزیك مزگەوتی گەورە. زۆرکات تا ئێوارە لەوێ دەبووین ڕەنگە بڵێم چی کتێبی کوردیو عەرەبیی تێدابوو لە ساڵانی خوێندنی ناوەندیماندا خوێندمانەوە. بۆ کتێب بردنەوە ماڵەوە دەبوو دینارێك بە بارمتە دانێیت. هەموو کەس توانای ئەوەی نەبوو. من بەختەوەر بووم، لەو ساڵانەدا مامۆستا فەوزی ڕەشید بەڕێوەبەری ئەو کتێبخانەیە بوو، زوو مامۆستاو بەڕێوەبەری یەکەم قوتابخانەم بوو (غازی)، تا کۆتایی ژیانی خۆشی دەویستم، ڕێزی دەگرتم، ئیتر بێ بارمتە چیم کتێب دەویست دەیدامێو دەمبردە ماڵەوە، بەو چەشنە دەرفەتی شەو خوێندنەوەشم بۆ ئاسانکرابوو.

لەبەرئەوە درێژە بەم باسە دەدەم کە ئەوەی نوێ لە جۆری خوێندنەوەو پێگەیشتنی ئێمە بگات.

بیری مارکسی لە پاش جەنگی دووەمو سەرکەوتنی یەکێتیی سۆڤێتو دەسەڵات پەیداکردنی کۆمەڵەی (ژ. ك) لە مەهابادو پاشان دامەزراندنی جمهوریەتی کوردستان پەرەی سەند. حیزبەکانی کوردستان پێشبڕکێی

ئەوەیانبوو کامیان بە نوێنەری بیری مارکسی بناسرێت. فێرکردن لە شانەکانی هەمووان‌دا هەر فێرکردنی مارکسیزم بوو، کتێبی مارکسی بە کوردی هەر نەبوو، بە عەرەبیش کەمبوو.

لە شانەکانی پارتی دیموکراتی کورددا (مەسەلەی نیشتمانی)ی ستالینیان پێدەووتین، کە بە عەرەبی هەبوو. کاک حیلمی عەلی شەریف دانەیەك (مەتریالیزمی دیالێکتیکی)ی ستالینی بە عەرەبی دەسکەوتبوو، ساڵی ١٩٤٨ عەسران لە باخی تەکیە (باخی فەرەج) بۆی شەرحدەکردین. ئێستا کە بیر لە هەندێك کەسی ئەو سەردەمەو ئەو جورئەتە دەکەمەوە لەو تەمەنەدا هەر دەبێ بە بەرزی سەیریان بکەم. (پێشتر باسی ئەمەم کردووە).

وورده وورده لە پاڵ کتێبی کەمی کوردیو گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بابەتی ئەدەبیو چیرۆکی عەرەبیو وەرگێڕدراوی ڕووسیش پەیدابوون. چیرۆکەکانی زەننون ئەیووب (ذو النون ایوب) ڕایاندەکێشاینو هەموویمان دەخوێندەوە. چاپی دووەمی عەرەبیی (دایك)ی گۆرکی لە پلەیەکی داهاتوودا یەکەمجار باسی ڕیالیزمو ڕیالیزمی سۆشیالیستی دا بە گوێماندا. لە ساڵانی پەنجاکانەوە کتێبخانەی (گەلاوێژ)ی کاك ڕەووف مەعرووف کرایەوە. کاك ڕەووف ئینسانێکی باش، کتێبخانەکەی وەك یانەیەك وابوو، چی کتێبی سەر بە بیری پێشکەوتنخواز بهاتایە بەغدا دەیهێنا. بەلام ئەم هاتنو بردنە لە بیرووتەوە تا سلێمانی نرخی کتێبەکانی گرانتر دەکرد، بەلام پشتو پەنای ئێمە کاك.. (عوسمان دانش) بوو، بەو ژیانە کولەمەرگییەی خۆیەوە هەموو کتێبێکی دەکڕیو دەیان کەس لێمان دەسەندو پاش خوێندنەوە دەماندایەوە، کاك ڕەووف لە کۆتایی پەنجاکاندا کەوتە چاپی کتێبو دیوانی کوردیو دەرگایەکی گەورەی کردەوە.

## هەندێ بیرەوەری ڕۆژنامەنووسیم

تا ئێستا لەلای ئێمە سنوور بۆ جۆرەکانی کاری ڕۆژنامەگەری یا سنوور بۆ مانای (ڕۆژنامەگەری) (ڕۆژنامەنووسی) دانەنراوە. لای من دەبێ (ڕۆژنامەنووس) بەو کەسە بووترێ کە بە نووسین بەشداری دەرکردنی ڕۆژنامەیەو ئەمە کاری کۆمەڵێك ڕۆژنامەنووس‌و خاوەن کاری جیاواز دەگرێتەوە. هەرچی بە گشتی (ڕۆژنامەگەر)ی پێ دەووترێ ئەوەیە کە کاری تەکنیکی دەکات (دوور لە قەڵەم). ئەمەش چەند کارێکی جیاوازەو هەندێك کاری ڕۆژنامەگەریش هەیە، کە تەکنیك‌و قەڵەمی تێدا تێکەڵاوە.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکیترەوە هەندێك تا ئێستا نووسین بۆ ڕۆژنامە، یا بەرهەم لە ڕۆژنامەدا بڵاوکردنەوە لە کاری ڕۆژانە لە (تەکنیکی بێت یان نووسین) جیاناکەنەوە. کە دەبێ بەمەی دووەمیان بڵێین –ڕۆژنامەنووس یا ڕۆژنامەگەر-.

ئەم چەند دێڕە لە خۆیاندا کەرەسەی باسی درێژ یا کتێبی تایبەتین. کە لەم نووسینەی مندا جێگەیان نابێتەوە. چونکە ئەمە چەند لاپەڕە یا فەسڵێکی تایبەتیی یادداشتی شەخسییە لە بارەی کاری درێژی ڕۆژنامەگەری‌و ڕۆژنامە نووسیمەوە.

لە باسی یادگاری منداڵیدا نووسیبووم:

یەکەم دەرس‌و ڕووکردنە ڕۆژنامەگەریم، یا یەکەم خشتی تەلاری ئەو تاڵودەبوونەش هەر لەو قوتابخانەیەدا بوو (قوتابخانەی سەرەتایی فەیسەڵیە). مامۆستایان فازیل عیرفان‌و مەحەمەد تۆفیق ڕۆژنامەی دیواریان بۆ ڕێکخستین. داوای نووسینیان لێکردین. منیش دەستم دایە قەڵەم. کە نووسینەکەمم بەسەر دیوارەوە دی ئەوەی من نەبوو. بەڵامی تامی ئەوی تێدا بوو. (دیارە یەکێك لە مامۆستاکان دەستکاریی کردبوو وای نووسیبوو کە تاڵێکی ئەوی تێدا بێت).

ئەوەو بینینی ناوی خۆم لە دەنگوباسدا کە لە تاقیکردنەوەی مانگانەدا یەکەم بووم گەشەی دیاریان لە دڵی منداڵیمدا دیاربوو.

لە پلەی ناوەندیشدا هەر لە پۆلی یەکەمدا ڕووبەڕووی ڕۆژنامەی دیوار بووینەوە. خوێندن بە عەرەبی بوو، بەڵام مامۆستای کیمیا جەلال نیهال لیژنەی (تەبیعیات)ی دروستکردو سووربوو لەسەر ئەوەی ڕۆژنامەکەمان بە کوردی بێت. لە گۆڤارو ڕۆژنامەی ئەو سەردەمەدا بۆ ووتار دەگەڕاین. من چونکە تەجروبەی پێشووم هەبوو. ووتارەکەم بە هەندێك پاش‌و پێش‌و کورتکردنەوەوە دەنووسی‌یەوە. بەڵام هاوڕێم قادر دیلان لەو تەمەنەدا دەستیشی دابووە تەمسیلی کۆمیدی نووسین (کە لە بەشێکی ئەم یادداشتانەدا باس دەکرێت)، بۆ ئەو ڕۆژنامەیە ووتارێکی وەك خۆی لە بارەی (پەنسلین)ەوە لە گۆڤاری (گەلاوێژ)ەوە وەرگرتبوو، ووتارەکە د. تاهیر بەهجەت مەریوانی لە ئەمریکاوە ناردبووی.

مامۆستا (جەلال نیهال) چەند ژمارەی لەو ڕۆژنامەیە پێ نووسینەوە، دانەیەکی ناردبوو بۆ ڕۆژنامەی (ژین) گەلێك بەوە شاد بووین کە پیرەمێرد لە (ژین)دا ستایشی لیژنەکەو ڕۆژنامەکەی کردبوو، بەڵام ڕەخنەی لەوە گرتبوو کە (لوجنە- لجنە)مان کردەوە بە (لیژنە) و لای وابوو کە لیژنە تەنیا بۆ لیژنە داری بێ جووڵەو بێ گیانە.

مامۆستاکەمان دەیووت: من لیژنەم لە فەرەنسی‌یەوە وەرگرتووە لە لەجنەی عەرەبی‌یەوە نی‌یە.

وا ئێستا دەتوانم بڵێم (لیگا) و (لیگوێ) لە ڕووسی‌و فەرەنسیدا کە دەبێ هەر لە لاتینی‌یەوە هاتبێ بە مانای پێوەندەر –یا- ڕابیتەیە. بەڵام لەجنەی عەرەبی یا لە (لیمیون)ی یۆنانی یا لە (لیمیو)ی لاتینی‌یەوە هاتووە. هەرچەندە Ligationی ئینگلیزیش بە مانای پێوەندی هەیە. ئەمەش باسێکە با زمانەوانەکانمان –خوا داوێنێ- لێی بدوێن.

هەر لە پۆلی یەکەمی ناوەندیدا بووین، سەرمان دەنا بە یەکەوە، باسی جمهوریەتی کوردستانو مەهاباد دەکرا، محەمەد کەریم فەتحوڵڵاو مستەفا ساڵح کەریم لە قەڵادزەوە هاتبوون هەواڵیان زۆر لابوو. هەر لەو تەمەنەشدا بڵاوکراوەی نهێنیمان دیبوو. سێ کوچکەیەکیتر (سەید تەها جەلال، جوامێر مەجید سەلیمو من) چەند دەفتەرمان کڕیو بە خەیاڵی خۆمان گۆڤارێکی نهێنیمان نووسییەوە، دەڵێم نووسییەوە، چونکە هەمووی وەرگرتن بوو لە شیعری شاعیرانو لەو نوسینانەی دیبوومانن (تێبینی: هەندێك لە نەزانییەوە تا ئێستا نووسینو نووسنیەوە لە یەکتر جیاناکەنەوە). گۆڤار کەوتە لای سەید تەها دیاربوو چەند کەس پێیان دیبوو ترساندبوویان، چۆن دەبێ لەو تەمەنەدا خەریکی کاری نهێنی بێت. ئیتر ئەو دەفتەرانەمان نەدیوە. هاوڕێی شیرینو زانام د. کەمال مەزهەر ئەحمەد لە نووسینێکیدا باسی لەم چەشنە گۆڤارانە کردبوو. بە داخەوە ئەو دەستنووسانەم نەدی کە پشتی پێیان بەستبوو. ئەگینا لەوانە بوو ئەو چرۆی کارەی ئێمەشی تێدابوو بێت.

*بۆ ڕۆژنامەی دیوار ئەمەندە بەسە*

با هەر لێرەدا باسی یەکەم نووسینم بۆ ڕۆژنامە بکەم:

ساڵی ١٩٤٨-١٩٤٩ بە ئارەزووی باوکم چوومە کولیەی شەریعەت، کە ئەوسا ماوەی خوێندنی شەش ساڵ بوو و دەرچووی ناوەندییان وەردەگرت. (وەك لە بەشێکیتری یادداشتەکاندا باسکراوە ساڵم تەواو نەکرد) بەڵام لەو ساڵەدا لە پاڵ گەلێك چالاکیتردا کەوتمە نووسین. سەیر ئەوەیە ئەو نووسینەی بڵاوکرایەوە بەشداریی موناقەشەیەك بوو لەسەر قورئان خوێندن. هاوەڵێکمان (ئەسعەد عەبدولجەببار کوبەیسی) لە ڕادیۆ بە شێوەی میسری قورئانی دەخوێند، قورئان خوێنان لێی ڕاپەڕینو بە جائیزیان نەدەزانی کە عێراقییەك لە شێوەی خوێندنی عێراقی لابدات. سەیر ئەوە بو من لەو تەمەنەشدا لە کونجی

نەویستی بیر تەسکیو بەرەوپێشچوون ڕاگرتنەوە بەرپەرچم دابوونەوە. نووسینەکەم لە ڕۆژنامەی (النداء)دا بڵاوکرابۆوە.

هەر لەو ساڵەدا بە هۆی ئەو تێکەڵییەوە کە لە نێوان باوکمو ماموّستا سوجادیدا هەبوو هاتووچۆی ئیدارەی گۆڤاری (گەلاوێژ) و (نزار)م دەکرد. ماموّستاو دەستەی نووسەرانی (نزار) هانیان دەدام بنووسم. بەڵام لە ڕاستیدا جورئەتی ئەوەم نەدەکرد نووسینی کرچو کاڵ ببمە بەردەم ئەو دەستەی نووسەرانەی گوێم لە تاوتوێو هەڵسەنگاندنی ووتارەکان بوو لای ئەوان. لە ئیدارەی (نزار) زۆرتر شەهیدعەلی حەمدیم ئەدی کەوا تێگەیشتبووم ئەو وتارانەی بە ناوی (الاستاذ محمد علي)یەوە دەنووسرێ نووسینی ئەو بوون. هەروەها نووسەرێك کە شێوەیم لە بیرەو ناوی (ظاهر) بوو، کوردیی نەدەزانی، وەك بزانم یا خۆی یا برایەکی حاکمێکی ناودار بوو. لە موناقەشەی ووتارەکاندا باڵادەستبوو. نازانم چۆن ئەم هەموو ساڵەی دوایی ئەوەم بەبیردا نەهات هەواڵی لە ماموّستا سوجادی بپرسم. ئەوەی لەبیرم مابێ ئەوە بوو کە ڕەشید نەجیب ئەو سەردەمە بەناوی (ئیبن خەلەکان)ەوە بۆ (نزار)ی دەنووسی.

ساڵ هاتو چوو گەڕامەوە سلێمانی- چوومە دوواناوەندیی سلێمانی، کەڵکەڵەی ڕۆژنامەنووسی کەوتە کەللەمەوە. هەموو ڕۆژ (وەك لە یادداشتەکاندایە) دەچووینە دووکانەکەی قادر ئاغای عەتتار هەموو ڕۆژنامەکانی بەغدامان دەخوێندەوە. زۆرم لا نەنگی بوو دەنگوباسی هەموو شارەکانی عێراق لە ڕۆژنامە ئازادەکانی ئەو سەردەمەدا بێت (هەرچەندە کەم بوونو ئەوەو ناوبەناویش دادەخران). هەموو کارو کردەوەو هەناسەدانمان ئەو سەردەمە پرسی حیزبیی دەویست. بە سڵ کردنەوە پرسیم، نەك بڵێن چۆن بۆ ڕۆژنامەی ئاشکرا یا نیمچە بۆرژوازی دەنووسێت. بەڵام خوایکرد وەڵامیان بە باشی دامەوە. یەکەم نامەم هەر بە پۆستەدا بۆ ماموّستا لوتفی بەکر سدقی نووسی، کە ئەو سەردەمە ڕۆژنامەکەی خۆی داخرابوو و ڕۆژنامەی (العالم

العربی)ی بە کرێگرتبوو کۆمەڵێ دەنگوباسی سلێمانیم بە ئیمزای (مراسلکم) بۆ نووسی. ئیتر بە چەند هەفتە نامەیەکم دەنارد، زۆرتر لە باسی بێکاریو نەخوێندەواریو هەژاریو زۆربوونی سواڵکردن دەدوام. ئەو نامانە تا ناوەڕاستی مارتی ١٩٥١ بەردەوامبوون. دیارە ئەو پەیامنێرییە بە خۆڕاییو بێکرێبوون، ئەگینا دەتوانرێ ئەوەبە یەکەم کاری ڕۆژنامەنووسیم بزانرێت.

ساڵی ١٩٥١ چوومەوە بەغدا لە (خانەی بەرزی مامۆستایان- دار المعلمین العالیة) (لە مەودووا کۆلێجی پەروەردە) لە بەشی عەرەبی وەرگیرام، لە پاڵ خولیای ڕۆژنامەگەریدا باری سەختی ژیانی باوکمو دەستکورتیی پاڵیان پێوەنام کە بۆ ئیش بگەڕێم.

هەرچەندم کرد ڕووم نەهات بچمە لای لوتفی بەکر سدقیو بڵێم: من پەیامنێرەکەتانم، چونکە بە ڕاستی منداڵبووم. ئەودەمە بۆ کەسێکی وەك ئێمە –لە تەمەنو لە خوێندنیشدا دەبوو وا پەسەند بکرێین کە باوەڕمان پێ بکرێت ئەوسا لە پلەکانی یەکەمی ڕۆژنامەدا جێگەمان ببێتەوە.

پارێزەر فائیق تۆفیـق[١٨] کە کۆنتر ڕۆژنامەی (الجهاد)ی هەبوو سەردەمێکیش (مودیری مەسئوولی) (گەلاوێژ) بوو ئیجازەی (الجهاد)ی وەرگرتەوە. بە فرسەتم زانی، چونکە کاتێك موتەسەریفی سلێمانی بوو باوکمی دەناسی. مامۆستا سوجادی بردمییە لای لە نەقابەی پارێزەران، لای سەیر بوو لەو تەمەنەدا داوای کارکردن بکەم لە ڕۆژنامەدا. بەڵام مامۆستا سوجادی پێی ووت: کوڕی فلانە، لای باوکی خوێندوویەتی، لە پۆلی یەکەمی بەشی عەرەبیی خانەی بەرزی مامۆستایانە. لای خۆی دایناو، کۆمەڵێك

---

١٨-ئەم فائق تۆفیقە خەڵکی خانەقین بوو. ئەمە ئەحمەد فایەق تۆفیق (فایەقی تاپۆ) نییە کە سەردەمێکی پێشووتر ڕۆژنامەنووسو نوێنەری مەلیك مەحموودی دووەم بووە.

پرسیاری لێکردم. کە زانیشی ساڵی پێشوو لەسەر سیاسەت گیراوم ووتی: من کەسێکی وەك تۆم دەوێت، کاری (ڕاتسکردنەوە-تصحیح) دەزانیت. مامۆستا سوجادی فەرمووی: کاتی خۆی زوو زوو دەهاتە (گەلاوێژ) و (نزار) و ئاگاداری کارەکەی ئێمە بوو. ئیتر یەکسەر بڕیاری دا مانگی بە ١٠ دینار ڕاستکەرەوە بم، جانتاکەی گردەەو لە دەفتەرێکدا ناوی نووسیم. دەبوو خۆی یا مامۆستا سوجادی ئاگادارم بکەنەوە. بەڵام خۆشم نەچووم بە دەمی‌یەوە. (الجهاد) هەر دەنەچۆوەو چاوی ڕەشم کاڵ بۆوە.

ئەو سەردەمە دۆستێکی وەك من لەسەر تێکۆشانی نیشتمانی یا بڵێم شیوعی (تالب دنهاش) لە خوێندن دەرکرابوو. لە بەڕێوەبەرێتی (مستەوردە) کاری دەکرد، کە نازانم هەر کاری بەڕێوەبەری گشتی (نازم زەهاوی) بوو، یا بۆ ئەوە بوو ئەو چەشنە کەسانەی بە هۆی نیشتمانپەروەری‌یەوە کاریان نی‌یە لە یەك جێگەدا کۆکرێنەوە. (مستەوردە) بووبووە جێگەی (استخدام) کارکردنی هەموو ئەو نووسەرانەی لە کار (وەزیفە یا موەزەف دەرکرابوون). زوو زوو دەچوومە لای تالب. هەر لەوێ کەسانی وەك: کازم ئەلسەماوی، عەبدولجەبار وەهبی (ئەبو سەعید)، محەمەد شەرارە، بەدر شاکر ئەلسەیاب، عەدنان لوتفی ڕەفعەت، علاء ئەحمەد، عەبدولوەهاب ئەلقەیسی‌و گەلێکیترم دوور یا نزیك ناسی. بەڵام لەو ناوەدا لەگەڵ یەکەم‌و ئەم سیانەی دوایی زیاتر تێکەڵبووم. دوایی دۆستایەتیم لەگەڵ ئەبو سەعیدو شەرارەدا زۆر بەتینتر بوو. ئەو سەردەمە عامیر عەبدوڵلاش هەر لەوێ کاری دەکرد.

باسی (الجهاد) و دەرنەچوونیم گێڕایەوە. ووتیان: ئاسانە، بچۆرە (الاهالی) بۆ سبەینێ ناردمیانە لای (عەبدولەجید وەنداوی) بێگومان کاری ڕاستکەرەوەی هەڵەی ڕۆژنامە لەو سەردەمەدا ئاسان نەبوو، ڕاستکەرەوە دەبوو عەرەبی باش بزانێ، زانیاریی گشتیی هەبێت تا هەڵەی ناو مێژوو و جوگرافیاشی پێ ڕاستکرێتەوە. ڕۆژنامەس (الاهالی) ڕاستکەرەوەی باشیان هەبوو، نووسەرە

سەرەکییەکانی خۆیان ووتاری خۆیان ڕاست دەکردەوە، تەنانەت کامیل جادرچی ووتارەکانی خۆیی پێش چاپ دەبینی. کاریتری پلەی سەرەتایی کاری (منصت) بوو کە گوێ لە ڕادیۆ بگرێو دەنگوباس، بە تایبەتی دەنگوباسی جیهانی بنووسێتەوە. بۆ ئەم کارەو هاتووچۆی دادگاکان، لە کاتی دادگای سیاسیدا کوڕێکی بالآبەرزی ڕەش تاڵەی ڕەوشت بەرز هەبوو، کە لە هەموو سەردەمەکانی (الاهالی)دا کارمەندی ڕۆژنامەکە بوو و سەربازێکی نەناسراوی، بێ ترسی ڕۆژنامەبوو ناوی (عەبدولقادر محەمەد) بوو. ئەو هەندێ کاری (هەواڵ نووسینەوە) و (هەواڵ هێنان)ی فێرکردم. کەچی کە ڕۆژێك چوومە ڕۆژنامەکەی جەولەهیری، دۆستێکم لەوێ هەواڵی لە ڕادیۆوە وەردەگرت. ئەو بە پێکەنینەوە باسی سەر ڕاستیی عەبدولقادری دەکرد. دەیووت: تۆ (فەبرەکە)ی ڕۆژنامەنووسیت نەبیستووە.

ووتی: سەیرکە، ئەوە من گوێ لە ڕادیۆ دەگرم. هەندێك هەواڵ دەنووسمەوە، بۆ ئەوی تر دەنووسم: ڕۆژنامەی (لیبراسیۆن)ی (ڕیۆ دوجانیرۆ) نووسیویەتی. هەواڵێکی ڕێکوپێکی بۆ خۆی دادەڕشت. ناوی ئەو دۆستە ناهێنم کە ئێستا کەسێکی ناسراوە، تا پرسی پێنەکەم. چونکە دەترسم ئەمەش وەك زۆر شتی تر بە ناوی زەمکردنەوە بۆی بخرێتە پرپاسکەو، کە من مەبەستم ستایشە.

هەواڵ هێنان ئەو کاتە لە دائیرەکانی میرییەوە بوو، دەبوو دۆستت لەم لاو ئەولا پەیدا بکردایە تا هەواڵی دائیرەکانی خۆیانت بدەنێ، زۆری ئەو هەواڵانە باسی گواستنەوەو تەرفیعی فەرمانبەران بوون. (الاهالی) وەك دەنگێکی پتەوی ئۆپۆزسیون ئەوەندە گوێی نەدەدایە ئەمانە. بەڵکو زۆرتر دەبوو باسی نەقابەکانی کرێکاران (کە هەندێکیان ئاشکرا بوون)، یا مانگرتن‌و ناڕەزایی خەڵك‌و باری سەختی ژیانیان کۆبکەینەوە.

لە ساڵی ١٩٥١ەوە ماوەیەك لەو ڕۆژنامەیە کارم کرد، بەڵام چەند جار گیران لە کاری ئەخستم. ئەوە بوو لە پاش ڕاپەڕینی تشرین ڕۆژنامەکە داخرا. گیرام‌و لە خوێندن دەرکرام، پاشان ساڵی ١٩٥٢ هاتمەوە سلێمانی.

### ژین:

ساڵی ١٩٥٣ ماوەیەك هاتمەوە سلێمانی، لە پۆلی دووەمی کۆلێجەکەم دەرکرابووم، بە سیفەتی کرێکار کارێکم لە ڕێکخراوی (نەهێشتنی لەرزوتا) دەست کەوت، بەڵام لە دائیرە کارم دەکرد، تاقە ڕۆژنامەی کوردی (ژین) بوو، لە سلێمانی دەردەچوو، پاش کۆچی دوایی پیرەمێرد ١٩ حوزەیرانی ١٩٥٠ وەرەسەکەی (کە خاوەن ئیمتیازی بۆ ئەوان مابۆوە) سەرنووسەری یان بە (جەمیل سائیب)ی خوشکەزای سپاردبوو. کە ئەویش کۆچی کرد، ماوەیەك پارێزەر نووری ئەمین مەحموود (نوریی ئەمین بەگ) کە خوێندەوارو ڕێباز چەپ بوو، سەرنووسەر بوو، لە سەردەمی ئەوەوە پێوەندیم لەگەڵ (ژین)دا هەبوو، بەڵام کە من هاتمەوە سلێمانی بنەماڵەی پیرەمێرد ڕۆژنامەکەیان دابووە دەست مامۆستا گۆران.

مامۆستا گۆرانم هاوینی ١٩٥٢ لە بەندیخانەی بەغدا ناسیبوو، کە یەکمانگرتەوەو لە نزیکەوە بووین بە دۆست ئیتر کارکردن لە ڕۆژنامەدا بۆ من ئاسان بوو. (ژین) توانای کادر ژیاندنی نەبوو، تەنانەت مامۆستا گۆران خۆی هەر مانگی (١٠) دیناری وەردەگرت‌و حسابی پارەی ژین لای بنەماڵەی پیرەمێرد خۆی بوو. بەبێ پارە کەوتمە ئیش. زۆرجار دەنگوباس، بە ووتاردا چوونەوە (دیارە نووسینی مامۆستا خۆی نەبێت)، زۆرجار هەڵەی چاپ ڕاستکردنەوەو چەند ئەرکێترم لەسەر بوو. لە زۆربەی ژمارەکاندا شتێکم دەنووسی یا بەرهەمێکی ئەدەبیم لە عەرەبییەوە وەردەگێڕا. بە ڕاستی سوودی زۆرم لە مامۆستا گۆران بینی، بە تایبەتی لە ڕووی کوردی نووسینەوە. بەو شێوە تەوازووعەی خۆی، زۆری فێرکردم، هەر لەو ماوەیەدا لەسەر دەستی خۆیدا کەوتمە وەرگێڕانی شیعری خۆی‌و دیلان بە عەرەبی.

(ژین) یەکێك بوو لە سەردەمەکانی تەقینەوەی بلیمەتیی مامۆستا گۆران. سەیری ئەو سەردەمە کورتە بکەیت زۆر شیعری کۆن‌و نوێی خۆی. هەواڵ بە جوانی دارشتن، کە محەمەد شەڕارە باسی ئەسپەکەی موتەنەبیی لە دەرەی (بوان)دا کردبوو بە بەڵگەی ئاشتیخوازی، ئەمیش دوو ووتاری لە بارەی قەسیدە بەناوبانگەکەی مەلا حەمدوونەوە (سەفەربەر) نووسی:

جەندرمە ئەسووڕێنەوە وەك واشەیی برسی

بۆ لاشەیی میللەت بە فڕوفێڵی غەزاوە

تەنانەت کە مامۆستا نەجمەدین مەلا لە ژین تووڕە بوو چونکە بابەتی ئەوی تێدا نەمابو دەیووت:

(کوڕە کابرا غەزەتە بۆ باسی ئاشتی دانراوە یا بۆ حیکایەتێکی منداڵان‌و مەتەڵێکی جوان). مامۆستا گۆران هەستیکرد کە مەتەڵیش پێویستە، بەڵام چۆن مەتەڵێك؟ سەیری دیوانەکەی بکەن. هەموو هەفتەیەك بە شیعری جوان، وێنەی جوان مەتەڵێکی ئامانجداری دەنووسی.

تەنانەت هەندێجار (بۆ زانین)ی دەکرد بە بابەتی مەبەست دەبڕین — وەك (تیپی پاڵەوانی خان قارەمان) یا لە هەڵبژاردەی ئەنجومەنی شارەوانیدا نووسیی:

-گەنم، گەنم لە پێنجەی بێ

دەستی دز لە خۆی پەنجەی بێ

-گەنم نابێ لە پێنجەی بێ

میللەت بەری لەو ڕەنجەی بێ

دیارە ئەم جەشنە تەقینەوەیەی بەرهەم خاسیەتێکی ڕۆژنامەی کوردیە. ئەو دیاردەیە لە ژیان‌و بەرهەمی کەسانی دیاری وەك: شێخ نووریی شێخ ساڵح، پیرەمێرد، برایم ئەحمەد، جەلادەت بەدرخان، کامەران بەدرخان، عەلادین سوجادی‌و حەسەن قزڵجیدا دەبینی.

نووسەرو بەڕێوەبەرو کارمەندی سەرەکیی ڕۆژنامەکە خۆی بوو، بەڵام ڕەنگە بڵێم منیش یارمەتی دەری یەکەمی بووم.

ئەوانەی دەهاتنە (ژین) و بەرهەمی بڵاودەکردنەوە ڕەنگە کەمێك یارمەتییان دابێت. خۆی زۆر دڵی بە (هۆگر) خۆشبوو. دەیووت: هەندێ خاسیەتی منو خاڵیی کۆکردۆتەوە (واتە: گۆرانو عەبدولواحید نووری). ئەوانەش کە بۆ (ژین) یان دەنووسی کەمبوون. کاك ئەژی گۆران تازە دەستی دابووە ووردە نووسین، بەڵام چونکە کرچو کاڵبوون بڵاونەدەکرانەوە، مامۆستا گۆران بە پێکەنینو خۆشییەوە دەیگێڕایەوە کە ئەژی لە ماڵەوە ووتوویەتی: (کەی (ژین) ڕۆژنامەی کوردە، تەنیا ڕۆژنامەی گۆرانو دیلانو عیزەدینو جەمالەدینو حەمەی مەلا کەریمەو جاروبار بۆ پێکەنین بەرهەمی هۆگریش بڵاودەبێتەوە).

ڕاستە ئەمانە بۆ (ژین)یان دەنووسی. جەمالەدین (واتە: جەمال نەبەز) تا یەك لایەنە لەگەڵ مامۆستا گۆران تێکی نەدابو شتی باشی دەنووسیو ڕای زۆر بە نرخی لە بارەی گۆرانەوە هەبوو.

مامۆستا (ع. ح. ب) لە پلەیەکی گەورەی بەرەو پێشچوونی شیعردا بوو. کۆمەڵێك شیعری سیاسیی خۆیی لەو سەردەمەی (ژین)دا بڵاوکردەوە.

مەترسە ئەی ئەرز، مەلەرزە ئەی مانگ

ئەی ماسییەکانی بنی دەریا تەڕ مەکەن برژانگ

لێرەدا دەمەوێ تەنیا تێبینی لە بارەی یەك شتی بیرەوەریی مامۆستا (ع. ح. ب)وە لێرەدا بنووسم. هەر هەمووی نا. لە گۆڤارێکدا باسی ئەوەی کردبوو کە کتێبی ئینگلیزیی بە مامۆستا گۆران نەدیوە.. هتد. لە ڕاستیدا مامۆستا (ع. ح. ب) ئەو سەردەمە فەرمانبەر بوو لە ناحیەیەکی سلێمانی (وابزانم هەر بەرزنجەی خۆیان بوو). پێنج شەممەو هەینی کە دەهاتەوە سلێمانی. لە چاپخانەی (ژین) بووایە یا لە دوکانەکەی کاك تۆفیق محەمەدو شێخ کەریمی شێخ مەحمودی بەرزنجەیی (خەزووری مامۆستا هەردی) یا لە چاپخانەی

حەمە ڕەق کە شوێنی دانیشتنی عەسرانمان بوو لە دەوری مامۆستا گۆران مامۆستا (ع. ح. ب)یش دەهاتە لای گۆران. مامۆستا گۆران شیعرەکانی (ع. ح. ب)ی زۆر بەدڵبوو. تەنانەت کە کەوتە بڵاکردنەوە، بە تایبەتی پارچەی (ڤیتنام)ەکەی کە لە ژیندا بڵاوکرایەوە دەنگی دایەوە، ئەو سەردەمە بوو مامۆستا هەردی ووتی: وامدەزانی من دەبم بە جێگرەوەی گۆران، بەڵام وا (ع. ح. ب) پێشم کەوت. ئەم ڕاستی‌یە دەبێ بووترێ. بەڵام ئەوەش دەبێ بووترێ کە (ع. ح. ب) ئەو سەردەمە کەمتر لەگەڵ گۆراندا بوو لەبەرئەوە ئاگای لە خوێندنەوەی کەمتر بوو.

مامۆستا گۆران هەمیشە دەرفەتی کتێب پەیداکردنی بەو زمانانە دەدۆزیەوە کە دەیزانین‌و هەموو خوێندنەوەشی بە بەرهەم‌و بەکاری ڕۆژنامەگەریی خۆیەوە دیارە (چ لە ژین‌و چ لە (شەفەق- بەیان) و چ لە ئازادیدا). ئەو سەردەمە کە سەردەمی هەژاندنی ئێرانبوو –دەوری موسەدیق- بە هۆی مەمەند ئاغای فانی‌یەوە دیوانی (میرزا زادەی عیشقی) و گۆڤارو ڕۆژنامەی ئەو سەردەمەی ئێرانی بۆ ئەهات –لە کارتێکردنی ئەوەدا وەرگێڕانی شیعری عیشقی‌و ئەبوو تورابی جەلی‌و کارتێکردنی ئەو دوو شاعیرە لە بەرهەمی‌دا دیارن (بڕوانە: بت- بتەوان) بۆ ئینگلیزیش هەمیشە کتێبی بچووک، بە تایبەتی (پینگوین)ی لە گیرفاندا بوو. کە بە بڕیارێك وەرگێڕانی (نامە بۆ میهرەجانی بوخارست) بۆ عەرەبی بە من سپێردراو وەرگێڕانی لە ئینگلیزی‌یەوە بە هاوڕێی کۆچکردوومان کاك ئەزادی ئەحمەدی عەزیز ئاغاو مامۆستا سەلاح عیرفان سپێررا بە مەرجێك مامۆستا گۆران خۆی سەرپەرشتی بکات، سەرەتا ئەو دوو برایە لایان ناخۆشبوو با شیعری خۆیشی بێت ئەوێك کە لایان وابوو ئینگلیزی باش نازانێ سەرپەرشتیان بکات. بەڵام کە دەستیان دایە وەرگێڕان دەیان ووت: بە ڕاستی ئینگلیزی‌یەکەی ئەو لە ڕووی ووشەو وێنەی ئەدەبی لە ئینگلیزی داڕشتنەوە زۆر لە ئێمە شارەزایانە ترە.

هەر لەو ماوەیەی (ژین)دا شانازی بەوەوە دەکەم کە مامۆستا گۆرانم بۆ ئیبداعێکی نوێی خۆی جوولاند:

-مامۆستا ئەم هەموو قسە خۆشیەو ئەم هەموو گاڵتە کردنە بە شیعرەکانتەوە دیارنییە. کە عاتیفەو خەمناکییان پێوە دیارە.

بێدەنگبوو، بۆ سبەینێ یەکەم (پیەس لە یەك پەردەدای) پیشاندامو دای بە چاپخانە بۆ (ژین) ئیتر یەك بە دووای یەکدا (موحاکەمەی مام چەوەندەر، جۆقی یۆنسکۆ، دەنگی مردوو.. هتد) شیعری گەپ دەرپەڕینو چوونە سەر لاپەڕەی (ژین) توخوا با لە باسی (ژین)دا (کاك ئەحمەدو کاك عەلی)مان لەبیر نەچێت کە زەحمەتکێشانە هەر لە سەردەمی پیرەمێردەوە تیپ چنو چاپکەرو کۆڵەکەی (ژین) بوون، با بیاندۆزینەوە.

## دیسان (الاهالی):

لە کارەکەی مەلاریا دەرکرام، بێکار ڕووم کردەوە بەغدا، ئەمجارەش لە دەرگای (الاهالی)م دا. پیاوانەو زۆر ڕێکوپێك دەرگام لێکرایەوە. هەر (وەنداوی) سەرنووسەر بوو. گروپێکی دەنگوباسی پێکەوە نا. غائیب توعمە فەرمان سەرپەرشتیی دەکرد. حسێن مەردانو من لەگەڵیدا کەوتینە کار. دیسان بە دوای دەنگوباسدا دەچووینە لای کرێکاران، لە دادگاکردنی بەغدا چی دادگای سیاسی هەبوو زۆر جار هەموو مەحزەرەکەی بلاودەکرایەوە. حسێن مەردان دەچووە پەرلەمانو هەندێ دەنگوباسی ئەوێی دەهێنا. مامۆستا مەسعوود محەمەد لە ئوتێل ترۆکادیرۆ دەژیا سەرم دەدا، ئەوکاتە پرسیاری پەرلەمانی هەبوو، واتە: ئەندامی پەرلەمان پرسیاری لە وەزیرێك دەکردو دەبوو وەڵامی بداتەوە. لەو پرسیارانەدا کە دەنگی دایەوەو هەڵوێستێکی جیا لە نائیبە کوردەکانیتری تێدابوو پرسیاری مامۆستا مەسعوود بوو لە بارەی بریندارکردنی مامۆستا برایم ئەحمەدەوە لە سلێمانی کە دای بە منو لە (الاهالی) بلاوکرایەوە.

بێگومان من لە حسێن مەردان گورجوگۆڵتر بووم، هەر ئەوە کۆمەڵێ باس‌و قسەی خۆشی دروستکرد کە دەبێ لە یادی پێوەندیم لەگەڵ شاعیران‌و نووسەراندا تۆمار بکرێت، بە تایبەتی قسەکان ڕاوەستانێکیان دەوێ، لای شەخسیەتی حسێن مەردان کە بە ڕەچەڵەك‌و بە دڵ کورد بوو، بەڵام کوردیی نەدەزانی، هەر لەو سەردەمەدا بەردەوامبووم لە شیعری کوردی بە عەرەبی کردندا بۆ (الاهالی) هەر بە دووای هەواڵ گەڕاندا هەواڵێکی دەستخستم. کە بۆ من سوودی هەبوو. بەوەی لە پۆلی دووەمی کۆلێج دەرکرابووم دەتوانم ببمە مامۆستای سەرەتایی. بۆ باوکمم نووسی. موتەسەریف موزاحم ماهیر بوو (پیاوێکی باشبوو) دایمەزراندم بە مامۆستا بۆ قەڵادزێ. هاتمەوە لە ١٩٥٤/١/١٨دا چوومە قەڵادزێ.

هەر لەو ماوەیەی (الاهالی)دا پێوەندیی کارم بە گۆڤارێکی عەرەبی‌یەوە بوو. ئەویش گۆڤاری (صدى المستقبل) بوو، گرووپێکی سەیر بووین، لە تاقە ژوورێکدا لە شەقامی (المتنبی) ئێواران کۆدەبووینەوە، هەموو بەبێ پارە کارمان دەکرد. خاوەن ئیمتیازو هەڵسووڕێنەری گۆڤارەکە ڕەسمی ئەلعامیل (رسمی العامل) بوو کە ئەو سەردەمە هێشتا هەر سەر بە حیزبی شیوعی بوو، چونکە هێشتا کۆلێجی حقووقی تەواو نەکردبوو پارێزەر (عەبدولکەریم شێخ داوود)ی کردبوو بە سەرنووسەر. دەستەی نووسەرانی ناونراو نەبوو، بەڵام ئێواران کە کۆمەڵە لاوێك کۆدەبوونەوە هەریەکەی چمکێکی کارمان دەگرتە دەست: (ساڵح جواد، کازم –پاشان دکتۆر، ڕوشدی ئەلعامیل، ماجید ئەلعامیل، حەبیب محەمەد کەریم‌و نووسەری ئەم یادداشتە، خەڵکیتریش زۆر هاتووچۆیان دەکردین. بڕیار درا بەشێك بە عەرەبی بۆ کوردو باسی کورد تەرخانبکرێت. لە دوو ژمارەدا من شیعری گۆران‌و دیلانم وەرگێڕا. د. جەمال نەبەز کە ئەودەمە دۆستی هەمووومانبوو. ڕیزە ووتارێکی لەسەر ئەدەبیاتی کوردی بڵاوکردەوەو دوو زنجیرەی لێ بڵاوکرایەوە. نووسینی من هەر بە ناوی (هاوار مصطفى)ەوە

بوو. کاک جەمال بە ناوی (ج. ا. کلۆڵ)ەوە بڵاویکردنەوە. ئەو سەردەمە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان کەوتبووە چالاکی، بەشێکی گۆڤارەکە بۆ ئەو مەبەستە بوو. هەر لە پاڵ گۆڤارەکەدا وەرگێڕانی کتێبی (ئابووریی شەڕو ئاشتی)ی جۆن ئایتن کە ساڵح جواد کازم وەرگێڕابوو. بە ناوی بڵاوکراوەی گۆڤارەکەوە دەرچوو. سێ ژمارەمان دەرکردبوو چوارەم لەژێر چاپدا بوو کە فەرمانی داخستنی گۆڤارەکەمان درایە. چار چییە؟

گەڕان کابرایەکی موسڵاوی ئیمتیازی گۆڤارێکی بە ناوی (الوحدة)ەوە هەبوو بۆی دەرنەدەکرا. بەرامبەر بە مانگانەیەکی کەم ڕازی بوو گۆڤارەکە ئێمە دەری بکەین‌و دیارە ناوی ئەوی لەسەر بێت. هەر ژمارە چوارەکەی خۆمان بەرگێکی (الوحدة)مان بۆ کردوو دەرچوو. دوو ڕۆژی نەبرد کابرا بە جنێودان هاتە سەرمان. فەرمانی داخستنی گۆڤارەکەیی بە دەستەوە بوو. تومەز تازە هەستی کردووە ئێمە سەر بە چەپین.

هەر لەو سەردەمەدا گۆڤاری (الثقافة الجديدة) دەرچوو، دەستەی نووسەرانی هەردوو گۆڤار سەری یەکمان دا پلەی (الثقافة الجديدة) و دەستەی نووسەرانی لە هەموو ڕوویەکەوە لە ئێمە بەرزتر بوو. ئەوانەی ئەو سەردەمە لەو هاتوو چۆیەدا ناسیمن (ئیبراهیم کوببە، د. سەفاء لحافز، د. سەلاح خالس، عەبدولوەهاب بەیاتی، د. شاکیر خەسباك بوون) بەڵام چونکە کادری کوردیان نەبوو دەشیان ویست دەنگی کورد لە گۆڤارەکەدا ببیت، ئەو ئەرکەیان بە من سپارد، منیش ئەو سەردەمە توانای وەرگێڕانم لە هەموو شت زیاتر بوو. دیسان گۆران، کە ئەوساو ئێستاش لەلای من گەورەترین شاعیری سەدەی بیستەممانەو وا ئەزانم شێرکۆ بێکەسی شاعیری گەورەی ئێستامان لەم بڕیارەدا لەگەڵمایە. ئۆپەرێتی (ئەنجامی یاران)م وەرگێڕا. زۆریان لا جوانبوو. (سەعدی یوسف)ی برادەرم تا سەردەمێکی درێژ هەرچەند دەیبینیم لە جێی سڵاو دەیووت: (كثير من النحل، كثير من النحل الجائع مروا من هنا). (دیلان)یش هاوڕێ‌و دۆستم بوو، تازە دەستی دابووە شیعر نووسین (چەند

ساڵێك بوو) هەر پارچەیەکی دەنووسی دەیدامێ یەکسەر دەمکرد بە عەرەبی ئیتر یا بڵاودەکرایەوە، یا دام ئەمنا، یا لە کۆبوونەوەیەکدا دەخوێنرایەوە.

ئەوەم لەبیر نەچێت، کە ئەو سەردەمە بە هۆی سێ کوچکەی (الاهالی- صدی المستقبل- الثقافة الجدیدة)وە هەندێ چیرۆك‌و شیعرم بە عەرەبی نووسی. ئەگەر زۆر نووسەر لایان ناخۆش بێت شتی کرچ‌و کاڵی سەرەتای نووسینیان بڵاوکراوەتەوە. ئەوا دەبێ من پێم خۆش بێت کە ئەوانەی من بلاونەکرانەوە. ئێستاش سکێچی چیرۆکەکانم لەبیرە –کاشکی کوردی بوونایە، وابزانم دەبوون بە یەکەم کۆمەڵە چیرۆك، شیعرەکان خراپ نەبوون. دوو قەسیدەیم لە گرتنی هاورێ (بەهادین نووری)دا نووسی دام بە (الاهالی) دیاربوو بۆچی بڵاویان نەکردەوە، بۆ ژمارەی پێنجەمی (صدی المستقبل) پارچەیەکم بۆ کارساتی هۆگر گۆران نووسی، کە بە زۆر لە بەندیخانەوە برایە نەخۆشخانە.

سەرەتاکەیم لە بەرە:

حقا جنون

دك المظالم والحصون

في مشية المجنون

صوب النار والموت الزوام

نمشی..

***دیسان (ژین):***

پێش چوونە قەڵادزێ، لە سلێمانی مامۆستا گۆرانم دی، بناغەی هاوکارییەکی نوێم لەگەڵ (ژین)دا دامەزراند، زیاتر بە نووسین. زۆر هەفتە نووسینم دەنارد. لە بەغداوە گۆڤارو رۆژنامەم پێدەگەیشت، هەندێك شتم وەردەگێرا.

وا بزانم یەکەم پارچە شیعرم هەر ئەو سەردەمە لە ژیندا بڵاوکردەوە.

پاش نزیکەی ساڵێك هاتمەوە سلێمانی، ئەودەمە مامۆستا گۆران لە (ژین) نەمابوو، پاشان گیرابو، عومەر عەلی بووبوو بە موتەسەریفی سلێمانی، لە پاڵ گەلێك کاری زەبروزەنگیتردا بنەماڵەی پیرەمێردی ناچارکرد کە (ژین) لە مامۆستا گۆران بسێننەوە. لە خۆیان کچەزای پیرەمێرد پارێزەر (ئەحمەد زرنگ) بوو بە سەرنووسەر. هەوڵیدا کە ئەوانەی هاوکاریی (ژین)یان دەکرد پێوەندییان بمێنێ.

لەگەڵ کاك ئەحمەد زرنگدا لە قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندیدا پێکەوە بووین. پشتی بە من بەستبوو کە هەر وەك ڕۆژانی گۆران یارمەتیی بدەم. زیاتر کەوتمە ووتار نووسین. لەو ووتارانەی بڵاوکرانەوەو ڕژێم‌و عومەر عەلییان تووڕە کرد. دوو ووتار بوو کە لە بارەی سروودی کوردی بە ئیمزای (ع. مصطفی)وە نووسیمن. چونکە (هاوار مسطفی) و (هـ. م)ە کە شەقڵی زەمانی مامۆستا گۆرانیان پێوە دیاربوو دەناسرانەوە. ئەوە بوو عومەر عەلی لیژنەیەکی دروست کردبوو بۆ پێداچوونەوەی سرووده کوردییەکان، تا چی ووشەی کوردو کوردستانە فڕیی بدەن یا بیگۆڕن. (نەورۆز) بکەن بە جەژنی دارو درەخت، (ئەوە شوێنە شوێنی کوردە) بە (ئەم شوێنە دەشت‌و هەردە).. هتد، بە توندی بەرگریم لە کوردو کوردستان کرد. کاری نائەمینیی شێواندن‌و گۆڕینم تاوانبار کرد.

هەر لەو بەردەوامییەدا ووتارێکم لە بارەی تەمسیلێکەوە نووسی، کە تێکستەکەی وەرگێڕان بوو بە دەستکارییەوە بەڵام بە نووسینی خاوەنەکەی دانرابوو کە ئەندامی لیژنەی سروودەکانبوو. من لە داخی سروودەکان زۆر تیژ بووم، ڕەنگە لە نەزانینیشەوە بووبێت، خاوەن تێکستیش زۆر تیژتر، بێ حسابی هەندێ پێوەندی شکاتی لێکردم‌و ئەمەی بەکاری ڕوخێنەری شیوعییەکان دابوو لە قەڵەم. دەی (تەوبیخ)یکم لە بەڕێوەبەری پەروەردە وەرگرت‌و نەقڵی قەمچووغەش کرام‌و عومەر عەلی خۆی بە (کاك ئەحمەد زرنگ)ی ووتبوو — ئیتر هیچی بۆ بڵاوناکەیتەوە.

لەگەڵ کاک ئەحمەد زرنگ ڕێك کەوتین، زۆرجار ووتارو سەروتارم بە ئیمزای (ز) دەنووسی، ئیتر ئەوان بە (زرنگ)ی تێدەگەیشتن. عومەر عەلی سانسۆری لەسەر ڕۆژنامەکە دانا. بە هێمنی ڕۆیشتین تا نەورۆزی ١٩٥٦. چۆن نەورۆز بێتو (ژین)ی پیرەمێرد هیچ لە بارەی ئەو جەژنەوە نەنووسێت. کە ووتارێکمان لەسەر نەورۆز دا بەو فەرمانبەرەی کاری سانسۆری درابوویە ڕەنگە بە پرسکردن لە عومەر عەلی بووبێت- قەدەغە کرا. ئەمجارە هاتین ووتارێکی مامۆستا عەلادین سوجادیمان لە گەلاوێژەوە وەرگرت بە ناوی (بەهاری کوردستان)ەوە. کە جەنابی عومەر عەلی خۆی کردبووی بە (بەهاری عێراق) ئێمە کوردستانەکەمان هەر هێشتەوە. ئەو ژمارەیەی پێش بڵاوبوونەوە سووتاند.

لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٦دا ناچار بووم ڕووبکەمە شام. ئیتر ژینو ئەحمەد زرنگم بۆ چەند فەسڵێکی ئەم چەشنە تراژیدییە بەجێهێشت.

**سوریاو لوبنان:**

کە چوومە (شام) لە پاڵ خوێندندا بۆ کار دەگەڕام لە زانستگا دەمخوێند. کاك فوئاد قەدری -کە ئەو سەردەمە یەکێك بوو لە شەخسیەتە سیاسییە دیارەکانی سووریە، چەند موحازەرەیەکی عەرەبیی لە ناوەندیی پێنجەم بۆ پەیداکردم. (کە ئەوەش ئاسان نەبوو) بەڵام من هەوڵی کاری ڕۆژنامەگەریم دا.

عەقید محەمەد زلفۆ ناردمیە گۆڤاری (الجندي) کە ئەو سەردەمە جەواهیریی مەزن ڕاوێژکاریبوو. کە بە وەرگێڕانی شیعری کوردی دەستم پێکرد. بە برا سووریەکان تەحەمول نەکرا، هەر ناوی کورد بهێنرێت، کەچی لە فارسیەوە وەرگێڕانم پێ سپێررا، منیش نەمکردو مانگم نەبردە سەر. بەڵام کۆمەڵێك شیعری کوردیی وەرگێڕراو کۆبوونەوە لە شیعری (گۆران، جگەرخوێن، عەلی، فەتتاح دزەیی). ڕۆژنامەی (الصرخیة) و (الثقافة الوطنیة)ی لوبنانی بۆیان بڵاوکردمەوە، بەڵام بێ پاداشت.

***پاش تەمووز- لە مجارەش (الاهالي):***

هاتمەوە بەغدا- لە کۆلێجەکەی خۆم وەرگیرامەوە). بڕیاریان وا بۆ دام کە لە یەك ساڵدا بە تاقیکردنەوەی پۆلی سێیەم‌و چوارەمدا ڕەت بم (ئەمەش بە درێژی لە هەندێ شوێنیتری ئەم یادداشتەدا دەگێڕمەوە)، هەندێ ڕۆژنامەی سەر بە حیزبە نیشتمان پەروەرەکان دەرچوون. کە (الاهالي) پێش هەموویانبوو، منیش ڕووم تێکردەوە. دیسان عەبدولەجید وەنداوی کەسی یەکەمبوو، بەڵام ئەمجارە بیروباوەڕی زیاتر بە لای چەپدا هاتبوو. حسێن مەردان هەر هەبوو و هەروەك خۆی، هەر قسەی خۆش، ئەویش زیاتر بەرەو چەپ هاتبوو، وەك جاران کاری زۆر نەدەکرد، بەڵام کاری ڕۆژنامەنووسیمان جیابوو. لەم سەردەمەدا (فازیل مەهدی) سکرتێری نووسین بوو، ئەرکی گەورەی تەکنیکی ڕۆژنامەنوسین، پۆلێنکردن‌و داڕشتنەوە.. هتد، لەسەر ئەو بوو. تەنانەت کە هەندێك پێیان دەووت: کلاسیکی‌یە، بەڵام من زۆر شتی لە ڕووی تەکنیکی ڕۆژنامەگەریی ئەوساوە لێ فێربووم.

چونکە هێشتا ئیجازەی حیزبە سیاسی‌یەکان بە ڕەسمی نەدرابوو، بارەگای ڕۆژنامە بارەگای حیزبی دیموکراتیی نیشتمانپەروەریشبوو، هەر لە (کامیل جادرچی) خۆیەوە تا هەموو سەرکردەکانی ئەو حیزبە ڕۆژانە دەهاتنە بارەگاو کەم‌و زۆر ئاگاداری ڕۆژنامەکە بوون یان دەستیان لە کاری وەردەدا.

هێشتا نە حیزبی شیوعی‌و نە پارتی ڕۆژنامەیان نەبوو، لەبەرئەوە ئەمان وەك پێڕەوی کۆنی خۆیان دەرگای ڕۆژنامەکەیان بۆ کردبوونەوە.

لەم سەردەمەدا زیاتر لە وەنداوی نزیکبوومەوە، زیاتر لەو ئینسانە دڵ سافە، بێگەردە، دڵسۆزە گەیشتم، تەمەن‌و باری چالاکیی سیاسیشم وایکردبوو کە زیاتر بایەخم پێبداو دەرگای کارم بۆ بخاتە سەرپشت، بە تایبەتی بیری ئەو زیاتر بەرەو چەپ هاتنی‌و خۆ بە کورد زانینی ئەم پێوەندی‌یەی پتەوتر کرد.

ووتارم دەنووسی، لە کوردییەوە هەندێك شتم وەردەگێڕا. هەفتانە یەك لاپەڕەم بۆ کاری قوتابیان درایە (ئەوکاتە هەمووﻻ هەر قوتابیانیان دەووت). بەڵام جۆرە کارێکی نوێ کە زیاتر لە سووریا فێری بووبووم، لە نێوان وەسفو چاوپێکەوتنو ڕێبورتاژو ووتاری ڕەخنەگرانەدا لاپەڕە یا لاپەڕەو نیوێکی تاسووق دەردەچوو.

بە شانازییەوە هەندێك تەعلیق یا وورده لێدوان لەو بارەیەوە تۆمار دەکەم.

ئەو چەشنە ڕیبۆرتاژە تێکەڵە لە ڕۆژنامەی عێراقدا تازە بوو، عەبدولقادر محەمەدی کۆنە هاوەڵمان دەیووت: ئەوا ئەو ڕۆژنامەی (الاهالي)یە پتەوە، کلاسیکییەت کرد بە (ئەلمۆد)ە، (وەنداوی) بە خۆشییەوە بە باشترین ڕۆژنامەنووس پێشکەشی دەکردم. بەڵام ڕۆژێك پارێزەر عەبدوڵڵا عەبباس کە دۆستیشم بوو یەکێك بوو لە سەرکردەکانی حیزبی نیشتیمانپەروەری دیموکراتی (وطني ديمقراطي) و سەردەمێك ناوی بە سەرنووسەر دەنووسرا گلەیی کرد کە دەچمە کۆلێجەکان چاوپێکەوتنەکانو پرسیار هەر لەگەڵ قوتابییە کوردو شیوعیەکان دەکەم. وەڵامم ئەوە بوو: قوتابیی حیزبی نیشتمانپەروەری دیموکراتی هەقیان زیاتر هەیە لە خۆو ڕا دەربڕین لەم ڕۆژنامەیەدا، تەنانەت من ئەگەر لە ڕۆژنامەیەکی کوردی یا شیوعیشدا کارم بکردایە ئەو هەقەم هەر دەدانێ، بەڵام من نایانناسم، ئەوە بوو لیستەیە ناوی دامێ، ئەو کەلێنەم پڕکردەوە، بەڵام خوا هەقە لە بەردەم هیچ شتێك یا نووسینێکدا نەدەوەستا کە پێوەندیی بە کوردەوە بوایە.

**لە یادگارەکانی ئەو سەردەمە:**

ڕۆژێك لە لاپەڕەی سێیەمدا ووتارێك بڵاوکرابۆوە کە کابرایەکی تووڕانی نووسیبووی‌و کوردی تێدا کرابوو بە تورك. ئێوارە ئیدارەی ڕۆژنامە هەژا، هەر هەموو سەرکردەکانی حیزبەکە (محەمەد سەعدوون، خەدوری، عەبدوڵڵا

عەبباس.. هتد) بە نارەزایی‌یەوە هاتن، وەنداوی ئاگری دەکردەوە، سەرۆکی حیزب کامیل جادرچی خۆی تەلەفوونیکرد. لێپرسراوی لاپەڕەی سێیەم (سەلاح عەبدولوەهاب)ی بە ڕەچەڵەك کوردی‌یان بانگ کرد، تومەز ئاگای لە مەحمودی بێ زەواڵ نی‌یەو هەستی بەو هەڵە گەورەیە نەکردووە، بۆ پینەکردن گەڕان‌و داوای نووسینێکی کتوپڕیان لە من کرد. دەست‌و دەم چوومەوە کۆلێجەکەمان (بەشی ناوخۆ). دوکتۆر کەمال مەزهەر لە پۆلی چوارەمی بەشی مێژوو بوو، لە بەشی ناوخۆ لە یەك ژووردا نەژیاین، خێرا سەرچاوەمان لە کتێبخانەی کۆلێج ئەملاو ئەولا پەیدا کردو کاك کەمال کەوتە نوسین‌و شەو بەشی یەکەمی زنجیرە ووتارێکم گەیاندە چاپخانە، بە پینەیەکی گەورەوە کە گوایە ئەو ووتارە چەوتە لەبەر ئەوە بڵاوکراوەتەوە کە ڕای جیاواز بزانرێ‌و دووایی وەڵام بدرێتەوە. ئیتر ڕۆژ بە ڕۆژ کاك کەمال هەڵقە بە هەڵقە دەینووسی‌و بۆ سبەینێ بڵاودەکرانەوە. ئەوە یەکەم نووسینی ئەو مێژوونووسە گەورەیەمان بوو.

بەڵام هەر ئەو ووتارە شتیتری بەدووادا هات، مێژوو نووسمان ساڵح قەفتان نامیلکەیەکی بە ناوی (کورد تورکمان نی‌یە) نووسی. یەکێکیتر ووتارێکی نووسیبوو پڕبوو لە شەڕە جنێو، لەسەر پێڕەوی خۆی لەقەبی بەو مێژوونووسانەش دابوو کە قسەیانیکردبوو بە بەڵگە (حقیر، احمق، سافل.. هتد) چونکە کابرا نزیکی حسێن جەمیل بوو، پاش لابردنی ئەم لەقەبانە بڵاوکرایەوە.

ئەم دوو دێڕی (ابن الصیفی)م دێنێتەوە یاد:

ملكنا فكان العفو منا سجية فلما ملكتم سال بالدم الابطح

وحسبكم هذا التفاوت بيننا وكل اناء بالذي فيه ينضح

***هەر بۆ یادگار دەمەوێ شتێکیتر لە بارەی ڕۆژانی (الاهالي)یەوە بنووسم:***

ساڵی ١٩٥٣ پاش چوونە سەرتەختی فەیسەڵی دووەم، گوایە خەڵك لە بەندیخانە ئازاد دەکەن. کۆمەڵێك لەو بەندانەیان بەردا کە پاکانەیان لە

کۆمۆنیستی کردبوو. لای خەڵك سەیر بوو کە ناوی دوو ئەفسەری تێکۆشەری کورد کە چووبوونە مەهابادو بەشداری سوپای پێشمەرگەی جمهوریەتی کوردستان بووبوون‌و هاتبوونەوە گیرابوون‌و یەکی بە ۲۰، ۱۵ساڵ بەندی حوکمدرابوون، لەناو ئەو پاکانە کەرانەدا بوو. ئەمان نە کۆمۆنیست بوون‌و نە پاکانەیان دابوو، بەڵام دیارە بۆ مەبەستێکی پیس ناویان تێکەڵ بە وان کرابوو.

ئەو دوو تێکۆشەرە، شۆڕشگێڕە کاك جەلالی ئەمین بەگ‌و کاك نووریی ئەحمەدی تەها بوون. من کاك نووریم لە بەندیخانەوە دەناسی، چۆنی بیستبوو من لە (الاهالي)م بیستبووی، هاتە لام، هەموو بە ڕێزەوە پێشوازیانکرد، ڕوونکردنەوەیەکی تیژی هێنابوو. بەڵام لەگەڵ (لەسەرخۆیی ڕۆژنامەکە)دا بۆیان بڵاوکردەوە. بەردانی ئەو تێکۆشەرانەی مەهابادو بەرزانی‌یەکان دەمێکبوو دروشمی نیشتمانپەروەران‌و حیزبەکانبوو. کاك نووری ڕێك‌و ڕەوان نووسیبووی (استنكر الارادة الملكية باطلاق سراحنا التي تجاهلت قوى الجماهير الشعبية الغلابة التي اجبرت السلطات على اطلاق سراحنا واطالب باخراج زملائي الستة الباقين في السجن) (مەبەستی شێخ ئەحمەدی بەرزانی‌و عوبەیدوڵڵاو ئەوانبوو) (ووتەکانی کاك نووریم لەبیری خۆمەوە دارشتۆتەوە). دەنگی دایەوە، بەڵام تازە مەلیك هاتنە سەرتەخت ڕۆژنامە داخستنی نەدەبوو بە دووادابێت. تۆڵەش دووایی لە کاك نووری سێندرا.

جا هەر پاش شۆڕشی چواردەی تەمووز ڕۆژێك کاك نووری لە (الاهالي) پەیدابوو، ووتی: بۆ لای تۆ هاتووم. کاتی خۆی پیاوەتی‌یەکت لەگەڵ کردووم، ئێستا دەبێ تەواوی بکەیت. تۆ دەستت لەو بڵاوکردنەوەیەدا بوو، ئێستا هەندێك کەس لە پارتیدا (ئەندامی م. س بوو) پێم دەڵێن پاکانەت داوە. ئەگەر بکرێ ئەو ژمارەیەم بۆ پەیدا بکە. خواو راستان لە ژمارە کۆنەکانی (الاهالي) هەندێکیان بێ بەرگ تێگرتن چەند ژمارەیان لێ دانرابوو نوسخەیەکم پاش چەند ڕۆژ دۆزیەوەو بۆم برد.

## اتحاد الشعب- ئازادی

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٩ەوە یا کەمێك زووتر ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب)ی نهێنی حیزبی شیوعی بوو بە ئاشکرا. هەرە لەو ماوەیەدا بە منیش ووترا کە وورده وورده خۆم لە (الاهالي) بدزمەوەو بچمە (اتحاد الشعب) یا هەندێك کار بۆ ئەویش بکەمو پاشان کە (ئازادی) دەرچوو بەویشەوە خەریکبم.

کە لە ڕۆژی ١٩٥٩/٢/٢٤دا ئاهەنگی نەورۆز گێراو زەعیم عەبدولکەریم قاسم یەکەمجار بوو چەند سەعات لە ئاهەنگێکدا دانیشێ بەڕێوەبەری ئاهەنگ (عریف- مجری) بووم، بەڵام ڕیپۆرتاژێکم بۆ (اتحاد الشعب) نووسی. کە لە لاپەڕەی ٣ یا ٥دا ستونێك بە ناوی (صوت الشعب الکردی)یەوە تەرخانکرابوو، زۆرتر د. موکەڕەم تاڵەبانی بە ئیمزای (ئازادیخواز) یا من بە ئیمزای (مامەند) دەماننووسی. (مامەند) ناوی حیزبیی سەردەمی قەڵادزەم بوو. زۆر شادمان بووم کە هەندێك لەو نوسینانەی دەمنوسین مەسەلەی جیاجاو موناقەشەیان دەوروژاند.

کە لە یەکی ئایاری ١٩٥٩دا لە کەرکووك (ئازادی) دەرچوو، پاش تەمموزی ١٩٥٩ هاتە بەغداد ئیتر وەك لە باسی ئازادیدا لێی دەدوێم، کەوتمە ئیش بۆ ئەویش ناچار وازم لە (الاهالي) هێنا. عەبدول مەجید وەنداوی دەیزانی بۆچ. لەبەرئەوە دەنگی نەکرد، چونکە خۆیشی وورده وورده لە حیزبی نیشتمانپەروەری دیموکراتی دوور دەکەوتەوە بەرەو چەپتر، بەڵام وەك وەفا دەبێ بڵێم (خدوری خدوری) زۆر لەگەڵم خەریك بوو کە بمێنمەوە. لە پاڵ کاری (ئازادی)دا، بەشداریم کرد لە (اتحاد الشعب) لە نووسینی ئەو ستوونەدا. داهێنانی بابەتێکی تازە بوو لە ڕۆژنامەی ئەوسادا، کە نومایش کردنی ژمارەکانی (ئازادی) بوو بە عەرەبی، وەك گورزی میراتی بۆ زۆر شوێنیان دەناردم، بۆ نموونە: عەبدولکەریم قاسم دوو دادگای عورفیی دانابوو، بە

یەکێکیان نەتەوە پەرستو کۆنەپەرستەکانی حوکم دەداو بەویتریان کە دادگای شەمسەدین عەبدوڵڵا بوو کۆمۆنیستەکانی حوکم دەدا، ئەوا هەموو ڕۆژ لە ڕۆژنامەوە دەیانناردمە دادگای شەمسەدین (بە پەیامنێری)، بەڵام کە من ئەچووم‌و شتم تۆمار دەکردو هیچمان بڵاونەکردەوە، چەند جارێك شەمسەدین بانگی کردم‌و ئاگاداریکردم کە ڕووداوی ناودادگاکەی بڵاونەکەینەوە ڕێگەم نادات بێمەوە. ئەوە بوو دووایی دەریکردم.

## لە بابەتی سەیری ئەو دادگایە:

من تێبینم لە بارەی لایەنە چەوتەکانی دادگاو ئەو شایەتی‌یە درۆیانەوە دەنووسی کە دەمدین‌و دەمبیستن، یا تەعلیقە پڕ لە ڕق‌و کینەو کۆنەپەرستانەی سەرۆکی دادگاو مودەعی‌یە گشتی‌یەکەی. دەمدا بە سەرپەرشتکەری ڕۆژنامە هاوڕێ زەکی خەیری. ئیتر لێپرسراوی بڵاوکردنەوە نەبووم. ڕۆژێك تەماشا دەکەم ڕۆژنامەنووسێکی بەد هاتە تەنیشتمەوەو سەیری دەکردم، دیاربوو (شەمسەدین) ڕایسپاردبوو بزانێ چی دەنووسم. یەکسەر کردم بە کوردی‌و بە لاتینی، کابرا بە چاو ئیشارەتی شەمسەدینی کرد، ئەویش بۆ پشوو دادگای ڕاگرت. پاش چەند دەقیقەیەك ناردی بەدووامدا بۆ ژوورەکەی خۆی ووتی: ئیتر تۆ نایەیتەوە بێرەدا. پاش ئەوە بڕیار درا کە شیوعی‌یەك، کە لە ڕۆژنامەیەکی تردا کە گومانی لێ ناکرێ بچێ‌و ئەو جۆرە تێ بینی‌یانە بێنێت.

خەریکبوو دادگاکردنی برادەرانی کەرکووك: فاتیح جەبباری‌و جەبباری پیرۆزخان‌و هاوڕێکانیان دەست پێبکا. ڕۆژێك هێشتا نەچووبووینە هۆڵی دادگاوە. نوێنەری پۆلیس لە دادگا کە ئەفسەرێکی کوردی کەرکوك بوو (عەبدوڵڵا ڕەووف ناجی)، بەلامدا تێپەڕی‌و بێ سەلام ووتی: تۆ بۆ خۆت پیاسە بکە وەك ئاگات لە من نەبێ، یان گوێت لێم نەبێ، کەوتمە پیاسەو ئەو لە دووامەوە ووتی:

-تۆ دەزانی من شیوعیم خۆش ناوێ، بەڵام من کوردم. وا برایانی کەرکووك دەنێرنە بەردەمی ئەم دادگا چەپەڵە، ئەمانە بڕیاریان داوە بە ناهەق بەرامبەر هەر کوژراوێکی ڕووداوەکانی کەرکووك بڕیاری خنکاندن بەسەر سێ کەسدا بدەن. سەرۆکی دادگاو ئەندامەکانی لە یاسا نازانن، مودەعیی گشتی (راغیب فەخری) هەموو شتیان فێردەکاتو ڕێو شوێنی پڕ لە پێچو پەنایان بۆ دەدۆزێتەوە.

ئەمەم گەیاند بە حیزب، چ بە نووسینو چ بە داواکردن پەردەمان لە ڕووی ئەو کابرایە داماڵی، کە پۆلیسی نهێنیی دەوری پاشایەتی بووە. بەڵام ئەمە لەلای حکوومەتی قاسمو ئەوانی دووای ئەویشدا خۆشەویستی کرد.

**بۆ مێژوو:**

لە کاری ئەو سەردەمەی (اتحاد الشعب)دا دەبێ دوو دوو شت تۆماربکەم.

١-پاش ڕووداوەکانی ١٩٥٩ی برادۆستو پێکدادانی سەر تیرەکانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ حکوومەتی شۆڕشو لایەنگراندا. (پارتی بە سەرۆکایەتیی بەرزانی) و حیزبی شیوعیو هێزەکانی سەربەو (شەهید فاخر مێرگەسووریو کاك عیزەتی سلێمان بەگی دەرگەڵە) و بەرگریی میللی ناوچەکە. ڕیپۆرتاژێك لە (اتحاد الشعب)دا بڵاوکرایەوە ناوی کاك وسوو سەبزەچی لەو بەرەبەرکانییەدا پێش مەلا مستەفا برابوو. چ پارتیو چ هەندێك لە سەرکردەکانی حیزبی شیوعی ناڕازیبوون. هاوڕێ زەکی خەیری بە ئامادە بوونی چەند کەس لە دەستەی نووسەران. بانگی کردم.

-ئەمە تۆ نووسیوتە.

-بەڵێ، هەردوو هەڵقە من دامڕشتوون.

-چۆنو کێ پێی ووتوویت ووسو سەبزەچی لەوێ بووەو لە پێش مەلا مستەفاوە بووە.

-منیش ئەمەم لا سەیر بوو و بە دڵم نەبوو و قسەشم کردووە.

-یانی چی؟ ئەی خۆت نەتنووسیوە؟

-من دامڕشتووە. ئەو هاوڕێ سەرکردەیەی ووشە بە ووشە بە دەمی پێی ووتووم‌و فرمانی داومێ بینووسم ئەوەتا لە ژوورەکەی خۆی. ئێمەش دیسپلینی حیزبی وای فێرکردووین ئاوا بکەین.

سەرسامبوو، بە تەلەفوونی ناوخۆ لەگەڵ شەهید جەمال حەیدەری دووا. ئەو ووتی: بەڵێ ووشە لە قسەی من زیاد نەکراوەو لێی لانەدراوە. ئیتر من هەستام، نازانم لە نێوان خۆیاندا چۆن بڕاوەتەوە.

جارێکیتر هەر باسی مەلا مستەفاو شۆڕشەکانی بەرزان. شەهید د. قاسملوو کە ئەو کاتە بە ناوی (عەبباسی ئەنوەری)یەوە لە بەغدا بوو، ووتارێکی گەورەی قووڵی لەسەر جمهووریەتی کوردستان نووسیبوو. ئەو سەردەمە بەشێك لە پارتی پێیان خۆش نەبوو بەو جۆرە ستایشی پێشەوا قازی محەمەد بکرێت. دوکتۆر مراد عەزیز (ڕازماوەر) کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو و زۆر لە بەرزانی‌یەوە نزیکبوو. لە نەقابەی مامۆستایان بە نارەزای‌یەوە لەو بارەیەوە لەگەڵ مندا دووا. ووتارەکە بە کوردی لە (ئازادی)دا بە ئیمزای (ع. وریا) بڵاوکرابۆوە، کاك بەهادین نووری داوای لە من کرد بیکەم بە عەرەبی، وەرمگێڕاو دام بە خۆی، لە (اتحاد الشعب)دا بڵاوکرایەوە.

دیسان هاوڕێ زەکی خەیری‌و تەحقیق:

-ئەمە تۆ کردووتە بە عەرەبی؟

-بەڵێ.

-ئەی چۆن‌و بە چ حەقی لێت زیاد کردووە.

-هیچم لێ زیاد نەکردووە.

-چۆن؟ کوردی‌یە کە بە سلبی باسی شۆڕشی بەرزان‌و مەلا مستەفای تێدابوو.

-نەخێر، لە عەرەبی‌یەکەشدا نی‌یە.

-چۆن ئەی ئەمە چی‌یە.

کە سەیرمکرد، زیادکردن هەبوو ووتم:

-من هیچم لێ زیاد نەکردووە دەتوانن دەستنووسەکەی من بهێنن.

باشبوو دەستنووس (یا ڕەشنووس) لە چاپخانە مابوو، خێرا ناردیان. کە سەیری کرد. ووتی: تەواو. تۆ بڕۆ. دووایی زانیم کاك بەهادین خۆیی لێی زیاد کردووە.

## ئازادی:

یادگاری ڕۆژانی (اتحاد الشعب) و (ئازادی) زۆرن، زۆریان پێویستیان بە تۆمارکردن هەیە. بەڵام ئێستاکە ئەمەوێ ئەم بەشەی یادداشتەکانی ژیانم بۆ یادی ١٠٠ ساڵەی ڕۆژنامەگەریی کوردی ئامادە بکەم. ئێستا بەسەر زۆریاندا تێپەڕ دەبم. هەرچی باسی (ئازادی)یە، ئەوە ساڵی ١٩٩٤ لە سێ هەڵقەدا لە ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستاندا کۆمەڵێك یادگارو یادداشتم بڵاوکردەوە. لێرەدا ئەوانە وەك خۆیان تۆمار دەکەمەوە.

ڕێگای کوردستان

سێشەمە ١٩٩٤/٥/١٠

ژمارە ١٠٧ ساڵی ٥٠

### بەشی یەکەم:

وەك لە هاوڕێ کۆنەکانم بیستووە (ئازادی) یەکەمجار ساڵی ١٩٤٤ بە نهێنی دەرچووە. سەردەمێك کە هێشتا ژمارەی کورد لەناو حیزبی شیوعیدا کەم بوون، بە بەڵگەی ئەوەی کە (ئازادی) و (یەکێتی تێکۆشین) لە یەك کاتدا دەرچوون، ئەوەش کە دیارە ئەوەیە کە هاوڕێ ناسراوە شیوعی‌یەکانی هەولێر زۆربەیان ئەو سەردەمە لەناو (یەکێتی تێکۆشین)دا بوون، بێجگە لەوان خۆیان، هەندێك یادگاری ئەو سەردەمەشم لە شاری (لینینەکان)ی ئەرمەنستان لە (ئەواکیم

ئەواکیمیان)ی کۆچکردوو بیستووە کە لە شوێنی خۆیدا باسیان دەکەم، هەرچی سلێمانی‌یە درەنگتر حزبی شیوعیی تێدا بەهێزبوو..

(ئازادی) بە پێشنیازی هاوڕێ فەهد خۆی دەرچووە یەکەم یا تاقە نووسەری لە سەرەتادا (مەلا شەریف) بووە، کاك ئەنوەر دڵسۆز خۆی بە یەکەم کورد دەزانێ کە چووبێتە حزبی شیوعی‌یەوە، ئەویش لە ساڵانی ١٩٤٢-١٩٤٣دا کە لە عەممارە گیرابوو، کاك ئەنوەر دەیووت: کە بەربووم‌و هاتمەوە پێوەندیم بە مەلا شەریفەوە کردو لە (ئازادی)یشدا نووسینم هەیە. دووایی کە هاوڕێیانی ناو (یەکێتی تێکۆشین) چوونە ناو حزبی شیوعی‌یەوە ئیتر بێگومان ڕۆژنامەکە نووسەری پەیدا کرد، چونکە ئەوە ئەوەیە بە جورئەتەوە هاتبوونە مەیدانەوە، کە هەندێك جار لەمەودووا ڕەخنەمان لە زمانی نووسینەکانی نافیعی شەهید دەگرت دەیووت: پانزە ساڵ لەمەوبەر نە ئەمە بووم‌و نە لەم تەمەنەشدا بووم بەڵام بێ ترس بۆ (ئازادی)م دەنووسی‌و زۆرجار سەروتاریشم دەنووسی، وەڵامی منیش ئەوە بوو: -کاکە، ئەوسا ئەم منداڵە وورتەکەیەت لێ پەیدا نەبووبوو- مەبەستم خۆمان بوو، کاکە حەمەش بەم قسەیەم تووڕە دەبوو، بۆ خوێندنەوە من لە ساڵانی ١٩٤٧-١٩٤٩دا کە لە پلەی ناوەندیدا بووین (ئازادی)ی نیمچە نهێنیم لە پاڵ (ڕزگاری) و (مرۆڤ)ی ڕۆژنامەی پارتیدا دیوە.

ئەو سەردەمە چەند قوتابی‌یەکی ناوەندی بووین زۆر بە یەکەوە بووین‌و زۆر نزیکی یەکیش بووین. حیزبایەتیش لە یەکی جیانەدەکردینەوە. دارا تۆفیق‌و مستەفا ساڵح کەریم شیوعی یا (تەحرور) بوون. محەمەد کەریم فەتحوڵڵاو جەمال شاڵی‌و من لەگەڵ پارتی بووین. کە من ساڵی ١٩٤٩ چوومە حیزبی شیوعی‌یەوە ئەو سەردەمە ڕۆژنامەی (ئازادی) وەستابوو. هەر دەستەیە ڕۆژنامەیتری هەبوو. کاری ئێمەی قوتابی نووسینەوەی ڕۆژنامەکان بوو، چونکە تا ماوەیەك حیزب چاپخانەی نەما. چاپخانەکە گیرابوو.

ئێمە سەر بە کۆمەڵی (نەجمە) و پاشان (اتحاد) لە سلێمانی (ئەستێرە) و پاشان (یەکێتی) و (دەنگی فەللاح)مان دەنووسییەوە. کە یەکەمجار (القاعدة)مان بە چاپکراوی – بە چاپی ڕۆنیو دی ئیتر لەرزینێك کەوتە ناو تاقمی (الاتحاد)ەوە، ئەو چاپە یەکێکە لە کارە گەورەکانی هاوڕێ بەهادین نووری، پاشان کە (ئیتحاد) پاش شەهیدبوونی ڕابەرە هەڵکەوتووەکەی (کەریمی سۆڤ) نەماو هەموو تاکە تاکە چووینەوە ناو حیزب یا یەك یەك وەرگیراینەوە، چاپی کوردیو (ئازادی) دواکەوت.

لەو سەردەمەی ڕابەریی کاك بەهادیندا هەر (القاعدة) و (الانجاز)م بیرە، جا نازانم لەبەرئەوە بێت کە لە بەغدا بووم یا کوردی هەر دەرنەچووبێت. کە کاك بەهادین گیراو سەردەمێك هاوڕێ کەریم ئەحمەد بوو بە مەسئوولی یەکەم وابزانم لەو سەردەمەدا (ئازادی) دەرچۆوە. بەڵام بە چاپی ڕۆنیۆ، کە کاك حمید عوسمان لە بەندیخانەی باقووبە ڕایکردو بوو بە مەسئوولی یەکەمو باری وڵات لە هەڵچووندا بوو ئیتر زۆر شت بە کوردیش چاپ دەکرا. ئەو سەردەمە مەسئوولەکانی کوردستان زۆربەیان پێوەندییان بە نووسینو ووشەی کوردییەوە هەبوو (کاکەی فەللاح، ئەحمەد دڵزار، سەعید فەرەجی دارتاش) و دەتوانین ناوی (عوسمان مستەفا خۆشناوو د. کەمال فوئادو محەمەد ساڵح دیلان)یش بەرینە پاڵ ئەوانو بڵێین ئەمە لە پاڵ توانا پەیداکردنەوەی حزبدا تەوژمێکی بە چاپی نهێنیی کوردی دا. (ئازادی) بە ٨-١٦ یا تا ٢١ لاپەڕەی قەوارەی نهێنی دەردەچوو.

من مەسئوولیەتی گەورەم نەبوو، بە تایبەتی لەو سەردەمەدا، ئەگەر مەسئوولیش بووبم هەر سەردەمی قەڵادزێیە ١٩٥٤-١٩٥٥ لەبەرئەوە ئاگاداری بەشداریی هاوڕێیانیتر نیم لە نووسیندا. ئەگینا هەر لەو سەردەمە گەشەدا گەلێك شاعیرو نووسەر لە ڕیزی حیزبی شیوعیدا بوونو دەبێ نووسینیشیان هەبووبێت. کە ژمارەیەکی قەوارە گەورەی (ئازادی) بۆ یادی بیست ساڵەی

حیزبی شیوعی تەرخان کرابوو ئەوا لەناو کەرەسەکانیدا پارچە شیعری (ئەی حیزبی شیوعی تەمەن بیست ساڵە)ی گۆران هاواری دەکرد.

(بە داخەوە ئەوە لە پارچە وونبووەکانێتی)، هەروەك شیعرەکانی دڵزارو ڕۆستەم (نافیع حەوێزی)یش دیاربوون، من لەو ژمارەیەداو لە ژمارەیەکی تردا نووسینم هەبوو. جارێك بە ئیمزای (ع) و جارێك بە ناوە حیزبییەکەوە (مامەند).

لە ڕیزی ئەو گاڵتەو قسە خۆشانەدا کە لە هەموو ژیاندا لەنێو منو شاعیری خۆشەویستو دۆستی دێرینم محەمەد ساڵح دیلاندا هەبووە ئەوە بووە کە دیلان چەند ساڵێك بوو دەستی دابووە شیعر نووسین، زوو بە شاعیر ناوبانگی دەرکرد. لە شیعرەکانیدا ووشەی (دڕكو چقڵ) زۆر دووبارە دەبوونەوە، لەو ژمارە تایبەتی‌یەدا پارچە پەخشانێك بۆ یادی حیزبی شیوعی نووسرابوو بە ئیمزای (خورشید)، دوو جار یا زیاتر حیزبی شیوعی کرابوو بەو دڕكو چقڵەی دەچێت بە چاوی دوژمندا. کە بە پێڕەوی ئەو سەردەمەمان هەموو ڕۆژێك دیلانم دەدی، هەر دیمو ووتم:

-ڕۆژباش هاوڕێ (خورشید).

دیلان وەك جاران تووڕە بوو، کەوتە هاوار: تۆ چووزانی من ناوە حیزبی‌یەکەم (خورشید)ە. خۆ تۆ مەسئوولی من نیت، خەریك بوو جۆرەها توومەتی بە دووای نهێنی زانینی نەگونجانم بداتە پاڵ، کە بە ووتەیەك سەتڵی ئاوم کرد بە سەریداو خستمە پێکەنینو ئافەرینی لێکردم:

-کاکی برا، تووڕە مەبە، (دڕكو چقڵ)ەکانت هاوار دەکەن، لە ژیانی درێژی دۆستایەتیماندا دوو قسەی خۆشی ترم دەربارەی ئەم (خورشید)ە بە چاوی دیلاندا دانەوەیە هەیە. (کنگرو ماست بۆ وادەی خۆی).

پاش یەکگرتنەوەی سێ باڵە شیوعی‌یەکە (ح. ش. ع- القاعدة، رایە الشغیلة، وحدة الشیوعیین) و کۆنفرانسی دووەمی حیزبو بەرزبوونەوەی تەوژمی

کوردایەتی لەناو حیزبدا بە ڕابەرایەتی شەهید جەمال حەیدەری ڕۆژنامەکە ناونرا (ئازادیی کوردستان) لەم سەردەمەیاندا کە ماوەیەك محەمەد ساڵح دیلان و ماوەیەك دوکتۆر کەمال فوئاد مەسئوولی من بوون و ئەو سەردەمە ئیتر بە نووسەری دەرکەوتبووم و چەند کتێبی (ستالین و لیوشاوشی)م بۆ حیزب کرد بە کوردی داوای نووسینم لێکرا بۆ هەموو ژمارەیەك. ئەوەی بیرم بێت لە دوو ژمارەدا نووسینم هەبوو. ڕۆژنامەکەش دەرەنگ و بێ وادە دەردەچوو منیش لە کۆتایی ١٩٥٦دا چوومە سوریا، بەڵام لە یادگاری (ئازادی کوردستان)دا دەبێ ئەم یادگارە بگێڕمەوە.

ئەو سەردەمە کورتەی موعەلیمیم چەند جار بە (ئینزارو بە تەوبیخ) سزادرام یەکێکیان لەسەر نووسینێك بوو بە ئیمزای (ع. م) لە ڕۆژنامەی (ژین)دا چەند جارێکیش گوێزرامەوە، کە ماوەیەك لە گوندی قەمچووغە بووم، کارە حیزبییەکەمان لە دووکانەوە کە ئەو دەمە دەست درابووە دامەزراندنی بەنداوەکە تا سورداش و چەرمەگا-پێکەوە بوو سەر بە سلێمانی بووین. لەو ماوەیەدا لە مامۆستاکانی گوندی جاسەنە کاك یونس ئەحمەد سەعادەم ناسی کە لە دهۆکەوە نێررابووە سلێمانی، کاك یونس بیروباوەڕی سەر بە ئێمە بوو، هاتە ناو کاری حیزبییەوە پاڵاوتم بۆ ئەندامی. بەڵام بیرم لە بەشداری دەکرد لە نووسیندا. بە ئاگاداری دیلان و د. کەمال فوئاد شتێکم بۆ نووسی و کردی بە (بادینانی) و لە (ئازادیی کوردستان)دا بڵاوکرایەوە. ئێمە لامان خۆشبوو بەو بەشە دیالیکتەش بنووسرێت، بەڵام برایانی پارتیْ ئەو سەردەمە ڕایان وانەبوو. ئێستاکە هەردوو دیالێکت لە نووسیندا دەبینم نازانم بڵێم چی؟ تۆ بڵێی کارێکی باشمان کردبێت.

## بەشی دووەم:
## ئازادی بە ئاشکرا

شۆڕشی تەمووز ئەو کارە قووڵەی کردە سەر مێژووی عیراق کە باسکرا (لە شوێنێتری ئەم یاداشتەدا- ع. ر) کە ئازادی باڵی بەسەر هەموو لایەنێکی ژیاندا کێشاو حیزبە سیاسیيە نیشتمانپەروەرە (عەرەبیو کوردیو عێراقیيە تێکەڵەکان دەستیان دایە کارو مەڵبەندی ئاشکراکردنەوە. ڕۆژنامەش کەوتە دەرچوون. هەر زوو (الاهالی)ی پارتی نیشتمانیی دیموکراتی (الحزب الوطني الديموقراتي) ڕێگەی پێدرایەوەو کەوتە کار، هەموو ئەو کەسانەی سەردەمێك لە (الاهالي)دا بوون کەوتنەوە کارتێداکردنی -تاكو تەرا نەبن-، (الاهالي) وەك لە شوێنێتردا باسم کردووە هەموو قەڵەمێکی نیشتمانپەروەری دەگرتە خۆ. بەو پێیەی لە ساڵانی پاشایەتیدا لەوێوە دەستمان بە کاری ڕۆژنامەنووسی کردبوو، ئەمر عەبدلەجید وەنداوی منو حسین مەردانیشی پێکەوە بردەوە ڕۆژنامەکە. بەڵام کە لە سەرەتای ١٩٥٩دا ئورگانی مەرکەزیی حیزبی شیوعی (اتحاد الشعب) بە ئاشکرا دەرچۆوە. ئەوا بە پێی لیستەیەك کە لە بەردەمی شەهید جەمال حەیدەریدا بوو داوای لە منیش کرد کە سەرەتا لە پاڵ (الاهالی)دا بەشداری کاری ڕۆژنامەکەی خۆشمان بم. دواییش کە وورده وورده کاری (ئازادی)یش هاتە ناوەوە (پێش دەرچوونی) ئیتر وازیان لە (الاهالی) پێ هێنامو هەر لە مەڵبەندی (اتحاد الشعب) کە لە (باب الشيخ) بوو دوو خانوو یا دوو شوققە لەیەکدرابوو بۆ ڕۆژنامەو ڕابەریی حیزب، لەوێ جێگەیەکم درایەو کەوتمە کار.

هەر لە سەرەتاوە هاوڕێ جەمال باسی دەرکردنەوەی (ئازادی)ی دەکرد. لقی کوردستانی حیزبی شیوعی چۆوە هەواری کۆنو خۆشەویستی خۆی، شاری (کەرکوك)، چونکە لە هەموو ساڵانی کاری نهێنیدا (کەرکوك) شوێنی کارو خۆشاردنەوەی ڕابەرانی لقی کوردستان بوو. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٨دا کاك نافیعی

شەهیدو ئەحمەد غەفووری لە یاد نەچوومان لەوێ گیران. وا بزانم هاورێ جەمال حەیدەریش هەر لەوێ گیرا.. ساڵانی زۆر شوێن کارو خۆشاردنەوەی کاکەی فەللاحو کەمال مەحموودو مەجید عبدوڕەزاقو تەنانەت کەریم ئەحمەدو بەهادین نووریو بانیخیلانیو حەمید عوسمانیش بوو. شێخ عەلیی بەرزنجی لەوێ گیراو شەهید کرا. هاورێیان لایان وابوو (ئازادی) ئۆرگانی لقی کوردستانەوە دەبێ لە (کەرکوك) دەربچێت.

لە رابەرانی حیزب ئەو سەردەمە هاورێیان عەزیز محەمەدو نافیع یونسو کەریم ئەحمەد لەوێ دەژیانو کاریان لەوێ بوو بێجگە لەو رابەرانەی لە هەولێرو سلێمانی بوونو پێیان لە کەرکووك نەدەبڕی. لەبەرئەوە ڕای کۆمیتەی مەرکەزیو لق ئەوە بوو کە دەبێ لە کەرکووك دەربچێت. کاکە حەمەی مەلا کەریم ئەو سەردەمە لە کەرکووك دەژیا. کە لە سەرەتاوە بێجگە لە شەهید نافیع یونس کە دەبوو لێپرسراوی ڕۆژنامەکە بێت، (ئەحمەد غەفوورو کاکە حەمەو من) بە بنکەی کار دەستنیشان کراین، کاکە حەمە ڕای وابوو کە ڕۆژنامە دەرکردن لە کەرکووك زەحمەتە، لەبەرئەوە هانی منیشی دەدا کە باس لە بەغدا بکەم. بەڵام من لەو سەردەمەدا لام وابو کە حیزب هەموو شتێك لە ئێمە باشتر دەزانێت داوای ئیجازەی (ئازادی) بە ناوی کاك (نافیع یونس)ەوە کرا. چونکە ئەو سەردەمە هەر ناوی سەرنووسەر دەدرا بە میریو دەبوو بە پێی یاسا سەرنووسەر بەکالۆریۆسی هەبێت. ئیجازەکە دوواکەوت، وا دەزانرا کە دەبێ ئێستا لە بەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا بێتو بیری لێ بکاتەوە. هەر ڕۆژە نارۆژێك کاك ئەحمەد غەفوور هەواڵێکی بۆ دەناردم کە بیری هاورێیانی بخەمەوە تا بچنە لای زەعیم عەبدولکەریمو ئیجازەکە جێبەجێ بکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە کەوتبووینە خۆمان من لە بەغداوە زۆر شتم ئامادە کردبوو بە وێنەو هەندێ وێنەی زەنگوراف کراوەوە پەیتاپەیتا دەمنارد بۆ

کەرکووك یا خۆم دەمبردن. هاوڕێ جەمال حەیدەریشم بۆ ئیجازەکە وەڕس کردبوو.

ڕۆژێك بە کارێك سەری کاك موکەرەم تاڵەبانیم دا. دوکتۆر موکەڕەم ئەو سەردەمە بەڕێوەبەری گشتیی ئینحیساری تووتن بوو. باسی (ئازادی) و ئیجازەکراو دیارە ئاگاداری هەموو کەین و بەینەکە بوو. پێکەنی و ووتی ئاسانە. لەو ڕۆژانەدا زەعیم فوئاد عارف وەزیری ئیرشاد، واتە (ڕاگەیاندن) بوو، وا بزانم وەزیری دەوڵەت بو، پاش ئیستیقالەکەی حسین جەمیل بە وەکالەت ئەو کارەی دەکرد. دوکتۆر موکەڕەم تەلەفوونی هەڵگرت و لەگەڵ کاك فوئاددا کەوتە قسە:

-کاك فوئاد، ئەو پیاوەی ناردبووت هات، ئیشەکەی ئینحیساریم بۆ کرد. دیاربوو کاك فوئاد سوپاسی کرد ئەمیش کەوتەوە قسە:

-بەڵام کاك فوئاد منیش ئیشێکم پێتە، ئەوە چەند مانگە کاك نافیع یونس داوای ئیجازەی ڕۆژنامەی (ئازادی)ی کردووە کەچی تا ئێستا نەیدراوەتێ. دیارە ئیجازەش هەر بە دەست خۆتانە، لای وەزیری ئیرشادە.

کاك فوئاد وەڵامێکی دایەوە، زۆرم لا سەیر بوو کە کاك موکەرەم ووتی:

-ئەوە هاوڕێیەکی خۆمانم لایە، ناوی فلانەو کوڕی فلانەو دەبێ لە (ئازادی)دا کاریکات دەهێنێرم.

کاك موکەڕەم وتی: دەبچۆ لای تا تۆ دەچیت داواکارییەکە دەدۆزرێتەوە، لێ مەگەڕێ تا موافەقەتەکە چاپ دەکرێت و ئیمزا دەکرێت، وەعدێکیشی لێ وەرگرە بۆ (چاوپێکەوتنێك) بۆ یەکەم ژمارە. بەڵام وەرەوە تا پێکەوە پرسیارەکان دانێین و پێشت بڵێم چۆن وەڵامەکە دەنووسیتەوە. ڕێگەی نێوان ئینحسارو وەزارەتی ئیرشاد کە لە جێگەی ئەنجوومەنی وەزیرانی کۆندا بوو لە (سەرا یا قشلە) کۆنەکەی بەغدا هەر دە دەقیقە دەبوو بە پێ. کە چووم یەکسەر سکرتێرەکەی وەزیر کاك تەیموور هەورامی ناسیمیەوەو کردمییە ژوورەوە. ماوەی چۆن و چاکی و هەواڵی باوك و مامەکانم پرسینێك و

چاخواردنەوەیەکی خایاند کارەکە (اولیات) هاتە بەردەم کاك فوئادو وەعدەکەم بۆ چاوپێکەوتنەکە لێ وەرگرت کە زۆری پێخۆش بوو. هاتمە دەرەوە، لە کۆتایی دەوامدا چووم ڕەزامەندیی دەرچوونی (ئازادی)م وەرگرتو هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژە گەیاندمە کەرکووك. هەرچی (چاوپێکەوتن)ەکەی کاك فوئادەو لە (ئازادی)دا بە وێنەیەکی خۆیەوە کە بە خەتی خۆی پێشکەشی (ئازادی)ی کردووە، ئەوە یەکێکە لەو باسە دانسقانەی دەبێ دەربارەی ئەو پیاوە بەنرخە بگێڕێتەوەو ئەویش شوێنی خۆی هەیە.

ئیجازەکە لە نیساندا درا، (ئازادی) هەر تەواو لە یەکی ئایاری ١٩٥٩دا دەرچوو. کە چوومە (کەرکووك) باسی ئەوە کرا کە یەکێکمان لە بەغدا هەر دەوێت. زۆر ئیشی ڕۆژنامەکە دەبێ لە بەغدا بکرێت. منیش چووبوومەوە زانستگاو دووا ساڵم بوو. ڕای هاوڕێکان بە تایبەتی هاوڕێ عەزیز ئەوە بوو کە بۆ ئەم دوو مانگە خوێندنو بەکالۆریۆسێك لە کیس خۆم نەدەم بە تایبەتی کە لە بەغدا کار ڕادەپەڕێنرێت.

سەرەتا هەر لەژێر سەرپەرشتی کاك نافیعدا بە بەشداریی کاك ئەحمەد غەفووروو کاکە حەمە ڕۆژنامەکە دەرچوو. بەڵام دیارە زۆربەی کار چ لە ڕووی وەرگێڕانو چ لە ڕووی ئەرکی چاپخانەوە لەسەر کاکە حەمە بوو. (کاك عومەر عارف)ی لە یادنەچووشمان هاوکاریی لەگەڵ دەکردنو کونجێکی گاڵتە ئامێزی بە ئیمزای (شەن) دەنووسی. بەڵام هەر لەو ژمارانەشدا کە لە کەرکووك دەرچوون ئەو کەرەسانە دیارن کە لە بەغداوە دەچوون، بێجگە لەوەی کە لە ژمارە یەکەوە تا ژمارە ٥٨ لاپەڕەی ئەدەبم لەپاڵ کارەکانی تردا ئامادە دەکرد. گەشەیەك لە دڵی هەمووان دابوو کە ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بە کوردی لە (کەرکووك) دەربچێ. هەرگیز ئەو سڵاوە بە سۆزەم لەبیر ناچێتەوە کە مامۆستا گیوی موکریانی لە (هەتاو)دا بۆ (ئازادی)ی نوسیبوو. خۆ بەشیر موشیری ڕەحمەتی (ئازادی)ی پێش هەموو ڕۆژنامەکانیتر دەفرۆشت. ئەگەر کەسێك

داوای ڕۆژنامەیتری بکردایە. دەیووت: جارێ نۆرەی ئەمەیە، تا ئەمە تەواو نەبێ شتی تر نافرۆشم.

بەڵام کێشەو کاری وڵات بەو جۆرە هات کە گەیشتە کارەساتی ناخۆشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٩ لە کەرکووك. ئێوارەی پێشوو کاك جەمال بە پەلە بە ئیشێکی تر ناردمییە کەرکووك‌و شەولە مەڵبەندی لق، لە شەقامی ئەتلەس نوستم. کاکە حەمەش شەو لەوێ مایەوە. هەرچەندە ئەو هەر لە سەر ئەو ڕایە بوو کە ڕۆژنامەکە بچێتە بەغدا، بەڵام من کاروباری چوونە کەرکووکی خۆمم ڕێکخست. من گەڕابوومەوە کە کارو چەرخ بەو جۆرە هەڵسووڕا، کە هاوڕێیان کەرکووك چۆڵ بکەن، یان بچنە ناو ژیانی نیوە نهێنییەوەو ئیتر توانای دەرکردنی ڕۆژنامەی کوردی لە کەرکووك نەمێنێ‌و کاکە حەمە کاڵەو پیتاوو کەرەسەی ڕۆژنامە بپێچێتەوەو بێتە بەغدا.

## بەشی سێیەم‌و کۆتایی

### لە بەغدا :

هەوار هاتە بەغدا، تاقە ژوورەکەی بۆ کاری (ئازادی) درابوو، بوو بە دوو ژوور. کورسی‌و مێزێك بۆ کاکە حەمەش دانرا. کاك نافیع کەوتە ژیانی نیوە خۆشاردنەوەوە، نازانم ڕادەی مەترسیی گرتنی پاش کارەساتی کەرکووك چەند بوو، بەڵام بڕیاری حیزب وابوو کە نەیەتە مەڵبەند. ئیش وا ڕێکخرا کە هەموو ڕۆژێك من‌و هەندێکجار من‌و کاکە حەمە ببینین‌و ڕێ‌و شوێنمان بۆ دابنێت.

لەوە پێش کاك نافیعم دوور بە دوور دەناسی، لە بەندیخانەی بەغدا ساڵی ١٩٥٣، لەو هاتووچۆیانەی کەرکووکدا، بەڵام ئەو ماوەیەی کارم لەگەڵ کرد لە تەمووزی ١٩٥٩ وە تا شەوی ١٦ی مارتی ١٩٦٠ کە دووا ماڵئاوایی ئەوو گەلێك کەسی تری خۆشەویستم ئەو شەوە لە فڕۆکەخانەی بەغدا بوو کە هاتبوو بۆ ڕەوانە کردنم، دەڵێم ئەو ماوەیە لە نزیکەوە ناسیم. یەکێکە لەو کەڵە پیاوانەی

ژیان بە ناسینیان شادمانو شەرمەزمەندی کردوومو هەرگیز دیمەنیم لەبەرچاوە، نافیع پێش هەموو شت ئینسان بوو، هەستێکی ناسکی مرۆڤانەی هەبوو.

چەند لە رەفتاری رۆژانەدا ناسك بوو ئەوەندە لە هەڵوێستی مەبدەئیو باوەڕیدا رەقو پێ داگر بوو. کە دیمەنی سەربەرزانەی ئەو کوڕە قۆزەت دەبینی نەتدەزانی لە دەروونیدا چەند تەوازوعکارو پڕ ئەوازشە. خوێندەوارو شارەزا، خۆڕاگر لە بەردەمی خۆشیی ژیاندا. فیداکار بە هەموو مانای فیداکارییەوە.

سەرەتا دەبوو باری چاپخانە رێك بخەین، هەرچەندە لە سەرەتادا لە چاپخانەی (فەرید) لە شەقامی شێخ عومەر کەوتینە چاپی ئازادی، ئەو چاپخانەیەش هەر ئەوە بوو کە (اتحاد الشعب)ی لێ چاپدەکراو دیارە موڵکی حیزب بوو، بەڵام بە کرداردا بۆ (اتحاد الشعب) بە چاپخانەی خۆمان دەزانی کەچی بۆ (ئازادی) وا نەبوو، زۆر کۆسپ دەهێنرایە رێگەمان، بە راستی چ لە مەڵبەندو چ لە چاپخانە ئێمە وامان هەست دەکرد کە لە ژنە دۆمەکەین. مەڵبەندی حیزبو رۆژنامە چەند ئۆتۆمبێلی هەبوو. ئەگەر رۆژی چەند جار بۆ کاری (اتحاد الشعب) داوای ئۆتۆمبێلم بکردایە ئامادە بوو، بەڵام دەبوو (ئازادی) پاش دەرچوونی بدەم بە کۆڵداو بە پێ یان بە ئۆتۆمبێلی نەفەرو کرێ بیگەیەنمە فرۆشیارەکانو کۆلێجەکانی زانستگا، چیشمان هاوار کرد تا من لە وڵات بووم چارنەکراو بەرپرسەری مەڵبەند لە شکاتەکانمان تووڕە دەبوو، لەبەرئەوە پاش یەکەم ژمارەی چوار لاپەڕەیی مام ناوەندی کاکە حەمە ڕای وابوو تا هەموو بارێکی چاپەمەنی ئامادەنەبێ دەست نەدەینە قەڵەم منیش هەر بە لای ڕاکەی ئەودا دەچووم. بەڵام کاك نافیع دەرسێکی تری داینێ. با رۆژنامەکە دەرنگ دەربچێت، کەمو کووڕیی هەبێ، بە یەك لاپەڕە بێت، بەڵام هەر دەربچێتو بەرەبەر کەمو کووڕی چاربکەین، چونکە ئەوەی ئێمە دەمانەوێ وا زوو نابێو حیزبێکی کە ساڵەهای ساڵ بە رۆژنامەی نهێنی ڕاهاتبێ

با ئەم ماوەیەش لەسەر ئەویتر بێتو بەردەوام بن. ڕای ئەو ڕاست دەرچوو، بەرەبەرە ئیشمان باشتر دەبوو.

ئەو سەردەمە زۆر ڕۆژ بەو گەرمایە لەگەڵ کاك نافیعدا بەپێیان لە مەیدانی (النهضة)وە یان لە (باب المعظم)ەوە ڕوومانەکردە چاپخانە، کاك نافیع زۆرجار ڕۆژنامەیەکی دەگرت بە سەریەوە. دیاربوو شتێکی دەزانی، زۆری پێ نەچوو. گواستمانەوە چاپخانەی (وەفا) لای (حافظ القاضي)یەوە کە دیاربوو چاپخانەی خۆمانبوو، چاپخانەکەی (فەرید) لاینوتایپ بوو، باشتر بوو، نووسینی زۆرتری تێدا جێ دەبۆوە، ئەمەی (وەفا) تیپ چینی بوو، بەڵام نزیکتر، ئاسوودەتر، هەر ئازادیی لێ چاپدەکرا، ژمارەی لاپەڕەمان گەیاندە هەشت پەڕە. ژمارەی چاپکراومان گەیاندە پێنج هەزار کە تا ئەو سەردەمە هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێکی کوردی ئەوەندەی چاپ نەکردبوو. لە هەفتەی جارێکەوە بۆ هەفتەی دوو جارو ماوەیەکیش گەیشتە هەفتەی سێ جار بەڵام بە چوار لاپەڕە.

کاری نووسینو هەڵە پاك کردن دابەش کرا. کاك نافیع خۆی سەرووتاری دەهێنا، زۆرجاریش بە عەرەبی دەیهێنا یەکێکمان دەمانکرد بە کوردی، خۆی بۆ دوا لاپەڕە بە ناوی "سکاڵای ئازادی"یەوە وتەیەکی جوانی دەنووسی، لە ڕاستیدا ئوسلووبێکی جوان، بیری جوانی هەبوو، بەوپەڕی تەوازوعەوە دەیوت، دە ساڵی بەندیخانە لە کوردیی دابڕیوم، دەمەوێ فێرببمەوە، هەندێك جار کە تێبینیمان لە بارەی داڕشتنی کوردیەوە دەدایە بۆ جاری دووەم ئەوەی بە هەڵەمان دەزانی دووبارەی نەدەکردەوە، بەرەبەرە کارەکەمان ڕێکتر دەبوو. بە کردارو بە ڕەسمی لە نەقابەی ڕۆژنامەنووسان من بووم بە سکرتێری نووسین، دەمانویست دەستەی نووسەران فراوانتر بێت، هاوڕێکان چەند ناویان پێشنیاز کرد، کاکە حەمە بە تیژی نارازی بوو، دووایی کاك محەمەد کەریم فەتحوڵڵا کە لە کادرە پێشکەوتووەکانی پارتی بوو لەگەڵ دەستەکەی مامۆستا هەمزە

عەبدوللادا بوو تازە هاتبووە حیزبی شیوعی، بووە ئەندامی دەستەی نووسەرانو هەرسێکمان بە سەرپەرشتی کاك نافیع گەلێك لایەنی کارەکەو پێوەندیمان بە خەڵکەوەو بە باری ژیانی کرێکارو فەللاحەوە بەرەو پێشەوە برد لاپەڕە یا ستوونی جیاجیامان جێگیر کرد. بۆ پارمەتیدانمان لە کاری تەکنیکیدا ماوەیەك کاك جەمالی حسێن ئاغاو دووایی فاورووق مستەفا لە (ئازادی)دا کەوتنەکار.

ژمارەیەکی تایبەتیی ئازادی بۆ ئەو ڕاپۆرتەی کۆمیتەی مەرکەزی بوو کە لە کۆبوونەوەی تەواویدا بڕیاری لەسەر درابوو و گەلێك پێداچوونەوەو بە هەقو بە ناهەق ڕەخنە لە خۆ گرتنی تێدابوو. بە تەنیا فریای وەرگێڕانی نەدەکەوتین. لەبەرئەوە کاکە حەمەو کاك ئەحمەد حامیدو منو وەرمانگێڕاو بە درێژایی چەند سەعاتو چەند ڕۆژ لە (یانەی سەرکەوتن) لە ژووری گۆڤاری (هیوا) کە کاکە حەمەو دوایی منیش سەردەمێکی پاش شۆڕشی تەمووز سکرتێری نوسینی بووین لەگەڵ کاك نافیعدا دانیشتین بە وەرگێڕانەکەدا چووینەوە، بە ڕاستی کاك نافیع سەرنجی ووردی دەدایێ، کە لە نێوان خۆماندا خۆشحاڵیم بەرامبەر بەو سەرنجانەی دەردەبڕیو کاکە حەمە هەندێکجار دانووی لەگەڵیاندا نەدەکولا، یا لەگەڵ نافیعی نەمردا نەدەگونجا، دەیووت: ئەوە ئەو لە کۆمیتەی مەرکەزی شتێکیان بە گوێدا چرپاندووە ئێمە چی.

بۆ وەرگێڕانی زۆر ووشەو ئیستیلاح دانان، بە دەستپێشخەری مامۆستا برایم ئەحمەد زۆرجار بە تەلەفوون پرسمان بەو دەکردو لەگەڵ خەباتدا هەوڵی یەکخستنی ووشەو ئیستیلاحمان دەداو گوێمان لە ئامۆژگاریەکانی کاك برایم دەگرت.

بێگومان (ئازادی) ئەرکێکی بە کۆمەڵیشی لەگەڵدا دەکێشرا، نووسینی هەندێ هاوڕێی دەرەوەی دەستەی نووسەران، پەیامنێرە حیزبییەکان لە هەموو کونجێکی ووڵاتەوە، بە وەرگێڕان یارمەتیدانمان لە لایەن زۆر کەسەوە بە تایبەتی لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕانەکانی کاك کەریم حسین سۆران، لەو شتە

بەنرخانەن کە لە بیرناچێتەوە ووتارێکی گەورەو بەنرخی شەهید دکتۆر قاسملوو بوو دەربارەی جمهوریەتی کوردستان بە ئیمزای (ع. ووریا)وە.

کە هێشتا ئازادی لە کەرکووك بوو، لە چەند ژمارەدا بەچاو پێکەوتن یاداشتەکانی شێخ ئەحمەدی بەرزان بڵاوکرابوونەوە. ئەو یاداشتانە کاك عومەر عارف بە دەمی لە جەنابی شێخی وەرگرتبوو تۆماری کردبوون.

لە ١٩٦٠/٢/١٦دا بۆ خوێندن چووم بۆ یەکێتی سۆڤیەت، باری ئازادی گۆڕدرا، بۆوە بە هەفتانە، بەڵام چۆوە چاپخانەی فەریدو دیارە هەڵسوڕێنەری چاپخانەکە کاك نەژادی ئەحمەد عەزیز ئاغا بووبوو بە بەڕێوەبەری چاکتر بوو، ژمارەی لاپەڕەیان کردەوە بە هەشت لاپەڕە، مامۆستا گۆران، ئەحمەد دڵزار، حسین عارف چوونە ناو دەستەی نووسەرانی‌یەوە. پەیوەندیم بە نامە لەگەڵ کاك نافیعو کاکە حەمەدا نەبڕا، بەردەوام شتم بۆ دەنوسین. ئێمەی جیهان نەدیو ژیانی ئەو سەردەمەی سۆڤیەت سەرسامی کردبووین لەبەرئەوە زۆری نوسینەکانم دەربارەی ژیانی ئەو وولاتە بوون بە تایبەتی چەند ووتارێك بە ناوی (گەیشتمە دەریای ئازووف)ەوە کە ئێستاش شانازیان پێوە دەکەم.

زۆری نەبرد (ئازادیش) لەگەڵ زۆر ڕۆژنامەو گۆڤاری تردا داخران، عەبدولکەریم قاسم بەرەو دیکتاتۆریەتو بەرەو دوژمنی چەپو پاشان کوردیش برا، بە ڕاستی کارکردنمان بۆ (ئازادی) یان بەبێ موچە، یا بە نانەسکی یا مووچەی کەمبوو، بەڵام زۆر جار هەر لە مەڵبەند شەومان دەکردەوەو هەوڵمان دەدا ئەو ئەستێرەیە گەشتر بێت. بەشی ئەویش وەك هەموو ڕۆژنامەیەکی کوردی هەر ئاوابوون بوو. خۆزگە حیزبی شیوعیی کوردستان هەر بەو ناوەوە. بۆ یادی نەمری نافیعی شەهید ڕۆژنامەیەکی دەردەکردو لەسەری دەنووسی: "دامەزرێنەری نافیع یونس".

## دەنگی قوتابیان:

چەند جار یەکێتیی قوتابیانی عێراق‌و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان جیابووبوونەوەو چەند جار بووبوونەوە بە یەك. لە سەردەمێکی یەکگرتوویدا بوو هاوڕێم مەهدی عەبدولکەریم کە یەکەم سەرۆکی ئاشکرای یەکێتی قوتابیانی عێراقبوو. باسی سستی هەندێکیکرد، لە دەرکردنی گۆڤاری ئەو یەکێتی‌یەدا. ئێوارە چوومە بارەگا چی ڕەشنووس کۆبوبووەوە وەرمگرتن‌و یەکسەر چوومە چاپخانەی ئاسیاوێك، دوو شەو بە دیار ئەو ڕەشنوسانەو ڕێکخستنیانەوە خەریکبووم چی تەواو دەبوو دەمدا بە تیپچنەکان، هەندێك لە گەرمەسەکان کاك ئەحمەد حامیدو خوشکە نەسرین فەخری (دوکتۆر) پێکەوە ئامادەیانکردبوو. خێرا ووتارێکیشم بە کاك کەمال (د. کومال مەزهەر) نووسی. دوو شەو بە دیار ئەو گۆڤارەوە شتێکی خنجیلانەی لێ دروستبوو. کە وەرز بەرەو کۆتایی ئایار دەچوو لە بیرم بوو کە دوا لاپەڕە بۆ شەهیدانی ٢٩ی ئاياری ١٩٢٥ تەرخانبکەم‌و ووتەیەکی بە سۆز بۆ شەهیدانی ئامەد (دیاربەکر) و هەموو شەهیدانی باکوورو کوردستان بنووسم. ئەو چەند دێڕە زۆر دەنگیان دایەوە، کاردانەوەی لای برایانی پارتی بە دوو جۆر بوو. لایەك پێخۆشحاڵی‌و گەشەو لایەك ئاخ هەڵکێشانێك کە چۆن ئەوان لە گەرمەی چەپڵەڕێزاندا ئەو یادەیان لەبیرچۆتەوە. باوەڕ بکە کە هەر ئەو ڕۆژە هەموو دانەکانی ئەو ژمارەیە فرۆشرا. هەرگیز دیمەنی کاك ئەسعەد خێلانی (دوکتۆر)م لەبیر ناچێ. کە ئەوساش زۆر (ئەنتی کۆمۆنیست) بوو، بەڵام بە خۆشی‌یەوە زۆر دانەی ئەو ژمارەیەی لەبەر ئەو لاپەڕەیە لە زانستگادا فرۆشت.

د. کەمال لە باسێکی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا باسی ئەو تاقە ژمارەیەی کردووەو ئەوەی دەرخستووە کە من بە تەنیا دەرمکردووە. تاقە یەك دانەم پاراستبوو. جەمال خەزنەدار بۆ ڕۆژێك لێی وەرگرتم کە وێنەی بگرێ‌و بمداتەوە. هەر نەیدامەوە. ئیتر قوتابیان بە هەڵپە داوای ژمارەیتریان دەکرد.

بەڵام ئەو خوێنگەرمییە لای یاد ئەمر مەهدی عەبدولکەریم ئەماو منیش بە تەنیا هەقی دەرکردنیم نەبوو.

## هەڵمەت:

هەر باسی (دەنگی قوتابیان) گۆڤارێکی نهێنیی بیرخستمەوە. ئەویش گۆڤاری (هەڵمەت) بوو. ڕەنگە نووسین بۆ ڕۆژنامە نهێنییەکان چەند لاپەڕەی یاداشتیان بوێتو هەندێکیان لە کاتی باسی کاری حیزبیو نهێنیدا باس بکەمو ڕۆژنامەی شاخو بەشداریی ئەوەش هەرکاتو شوێنیتریان دەوێت. بەڵام ئەم گۆڤارە شوێنیتری هەیە لە یادمدا لەبەرئەوە چەند دێڕی بۆ دەنووسم.

ساڵی ١٩٥٣ بوو هەر لەبەرئەوەی قوتابیی دەرکراوی کۆلێج بووم پێوەندیم بە ڕێکخراوی قوتابیانەوە مابوو، کاك کەمال عەبدولکەریم (د. کەمال فوئاد)یش هەروەك من بوو. بەڵام ئەو لە پاڵ لێپرسراویی حیزبیدا (ح ش ع)، چ بۆ کاری حیزبیو چ بۆ کاری نهێنیی قوتابیان سەرپەرشتی بزووتنەوەی قوتابیانی دەکرد.

لەپاڵ کاری سیاسیدا چێژی ئەدەبی بۆ نووسینو خوێندنەوەی ئەدەبیشی ڕادەکێشاین.

-بۆ چ دەبێ ڕۆژنامەو گۆڤاری نهێنی هەر سیاسی بن؟

ئەم پرسیارانەمانکردو دەستمان دایە کار. یەکە یەکە یەکترمان دەدی. بە تایبەتی هەمووومان لەگەڵ کاك کەمالدا هەر بە ناوی پیاسەوە ڕۆژێك زۆربەمان لە باخچەی گشتی -کە تاقە سەیرانگای لاوانی شار بوو. لەسەر دوو کورسیی درێژی باخچەکە، وەك بە ڕێکەوت یەکترمان دیبێ، کۆبووینەوەو بڕیار درا گۆڤارێکی ئەدەبی شۆڕشگێڕ دەربکەینو بە دەست چەند دانەمان پێکرا بینووسینەوە. گۆڤار ناونرا (هەڵمەت) لەوانەی لەو کۆبوونەوەیەدا بوون ئەمانەم لە بیرە (داوای لێبوردن لەوانیتر دەکەم):

ڕێكخه‌رو هه‌ڵسوڕێنه‌ر كاك قادری میرزا كه‌ریم، كاك شه‌وكه‌وت عه‌زیز فه‌ره‌ج (ده‌رمانساز)، كاك فه‌ره‌ج عه‌لی (ئه‌ندازیار)، كاك فه‌ره‌ج ئه‌حمه‌د (فه‌ره‌ج به‌گ)، كۆچكردوو محه‌مه‌د ئه‌مین بابان (باوه‌مین). من ئه‌بیم هه‌موویان قوتابیی دوواناوه‌ندی بوون.

وابزانم كاك كه‌مال خۆی سه‌ررووتاری نووسیبوو. برای كۆچكردومان عه‌بدوڵڵا میدیا پارمه‌تی نووسین‌و كۆكردنه‌وه‌ی دابوو، له‌گه‌ڵ كاك قادردا هه‌ندێك شتمان به وه‌رگرتن‌و وه‌رگێڕانه‌وه ڕێكخست. دوو ژماره‌یان دایه ڕێكخراوه‌كه ئه‌ندامان كه‌وتنه نووسینه‌وه. له‌سه‌ر كاغه‌زی ته‌نك ده‌نووسرایه‌وه، تا كاربۆن بخرێته ژێری‌و چه‌ند دانه به یه‌كجار بنووسرێته‌وه. هه‌ر ژماره‌یه‌ك خۆی له ٥٠ لاپه‌ڕه ده‌دا.

ئه‌و سه‌رده‌مه بزووتنه‌وه‌ی ئاشتیخوازان‌و بانگی ئاشتیی ئوستوكهۆڵم‌و ئیمزا كۆكردنه‌وه هه‌ر له‌ناودا بوو.

من شیعرێكم نووسیبوو:

ئیمزاكه برا بانگی ئوستوكهۆم

بۆ نه‌هێشتنی بۆمبایی ئه‌تۆم

دیاره بۆ ڕێكی قافیه (ئوستوكهۆڵم)م كردبوو به (ئۆستوكهۆم) كه‌چی شیعره‌كان هه‌ر بڵاوكرانه‌وه. كاك هۆگر گۆران دوو پارچه شیعری داینێ:

كۆتری ئاشتی بخوێنه

هه‌رچه‌نده ده‌مانووت كۆتر ناخوێنێ به‌ڵام هه‌ر بڵاومانكرده‌وه.

دووه‌میان مه‌نه‌لۆژێك بوو بۆ هه‌ڵبژاردنی په‌رله‌مانی ١٩٥٣ نوسرابوو ئه‌م دێڕانه‌یم له‌بیره:

سبه‌ینێ ئینتیخاباته

جاران چۆن بووه هه‌رواته

به قسه‌ی ته‌حقیقاته

هەموو درۆو هەللاتە

وا تەحقیقات قۆڵ هەڵئەکات

وا تەحقیقات قۆڵ هەڵئەکات

بۆ ئینتیخابات

خۆش ئینتیخابات

(تەحقیقاتی جینائی، واتە بەڕێوەبەریی گشتیی ئەمن) ئەوەش بڵاوکرایەوە.

کاک شەوکەت ئەو سەردەمە شیعری دەنووسی. سروودی قوتابیان کە پاش شۆڕشی تەمووز بوو بە سروودی ڕەسمی نووسینی ئەو بوو. ئەوەش بڵاوبکرایەوە.

ساڵی ١٩٥٤ هەوڵماندا ئەو گۆڤارە زیندوو بکەینەوە بەڵام جەزرەبەی گرتن و قوتابی بە سەرباز کردن بوو بە کۆسپ. ئایا تۆ بڵێی لە (ئەرشیفێکدا) ئەو دوو ژمارەیەمان دەست کەوێتەوە؟

## هیوا

هیوا گۆڤاری (یانەی سەرکەوتن) بوو، یانەی سەرکەوتنی کوردان هەر لە ساڵانی سییەوە دەیویست گۆڤارێکی هەبێت. بەڵام دیارە تا ساڵی ١٩٥٧ ئەو ئاواتە نەهاتبووە دی. لە زروفێکی سیاسیی تایبەتیدا ئەو هیوایە هاتەدی. سەرنووسەر حافز مستەفا قازی بوو. پێش شۆڕشی تەمووز ١٢ ژمارەی لێ دەرچوو وا دیارە دەیانویست ڕێو شوێنی (گەلاوێژ) بگرن. بە بڵاوکردنەوەی هەموو بابەتێك کە ڕێگەی بدرێو بە کۆکردنەوەی زۆربەی نووسەران. بە تەمەن و پلەو ڕێبازی جیاوازەوە.

ساڵی یەکەمی (هیوا) لە شام بووم. گۆڤارەکە هەر لە یەکەم ژمارەی پاش شۆڕشدا چونکە ڕۆژنامەو گۆڤاری سیاسی نەبوو، ئەرکی خۆیی کرد بە سیاسی و

بە پشتگرتنی شۆڕش‌و هەر لە ڕێگەی کاک حافزەوە شیوعی‌یەکان لەو گۆڤارەشدا دەرکەوتن. کە هەندێ باری یانەی سەرکەوتن گۆڕا. ئیتر دوکتۆر هاشم دۆغرەمەچی کە بوو بە باوەڕپێکراو (معتمد)ی یانەکە وەك سەرۆکی یانە وابوو، گۆڤارەکەی دایە دەست ئێمە. کاکە حەمەی مەلا کەریم ژمارەیەکی بە یارمەتیی من دەرکرد. پاش ئەوە وازی لێ هێناو دوکتۆر دوغرەمەچی سکرتێری نووسینی بە من سپارد. سێ ژمارەم دەرکرد. لەسەرووتاردا باسی ئەوەم کرد کە دەبێ هیوا بگەڕێتەوە سەنگەری خۆی کە سەنگەری ئەدەبە. کۆمەڵێك ووتارم نووسی. شانازی بەو شێوە تایبەتی‌یەوە دەکەم کە بۆ (پۆستەی خوێنەران)م دانا کە وەڵام دانەوە هەر ناونووسین نەبێت. بەڵکو ڕێنوێنی ئەدەبیشی تێدا بێت. یانە پارەی نەبوو، نەیدەتوانی بە ڕێك‌و پێکی گۆڤارەکە دەربکات. بەڵام پاش ئەوەی من لە مانگی مارتی ١٩٦٠دا سەفەرمکرد، تواناکە باشتر بوو و ئەو برایانەی کاریان تێدا دەکرد کە چەند ژمارەیتریان دەرکرد. لە باکۆوە نووسینم بۆ دەناردن. لە ڕێی هیواوە (بەکاییف)م بە خوێنەران ناسی. ڕۆژانی کارکردن لە یانەی سەرکەوتندا لاوەستانیتری دەوێت کە دەبێ لە مەیدانی یادداشتی چالاکیی سیاسیدا بگەڕێمەوە سەری.

## التاخي- برایەتی

شەهیدی مەزن ساڵح یوسفیم بە بینین یەکەمجار لە (ئەشکەوتی سەردێمان) نزیك چیای کارۆخ لە ناوچەی باڵەك ناسی. بەڕێوەبەری ڕادیۆی شۆڕش بوو کە لەو ئەشکەوتەدا بوو. بەهاری ١٩٦٦ بوو، دووایی ڕادیۆ چووە کێوە ڕەشی ژوور حاجی ئۆمەران هەر هاتوچۆم دەکردن. ئەو سەردەمە بەرزانیی ئەمر لیژنەیەکی باڵای ڕاگەیاندنی دانابوو: سامی عەبدولڕەحمان، حەمید عوسمان، هەژار، ئەنوەر دڵسۆز، عیزەدین مستەفا، ئەمە پێوەندی لەگەڵ شەهید یوسفیدا پتەوتر کردم‌و تا چەند ڕۆژێك پێش شەهیدبوونی ئەو پێوەندی‌یەمان هەر پتەوتر دەبوو. لەبەرئەوە کە ساڵی ١٩٦٧ هاتە بەغداو

بڕیاری دەرکردنی ڕۆژنامەی (التآخي)ی عەرەبی (برایی) کوردی درا. من لە ڕیزی پێشەوەی ئەو کەسانە بووم کە داوای بەشداریی لێکردم. کاری ئەو سەردەمەم لەو دوو ڕۆژنامەیەدا هەروەك کاری پێشمەرگەیی بوو. کە لە کاری زانستگا دەبوومەوە ڕوومدەکردە ڕۆژنامە. تا کار هەبوایە دەمامەوە شەوانی هەینی لەگەڵ ڕەحمەتی ڕەفیق چالاكو شێرکۆ بێکەس بە دیار (برایی) هەفتانەوە لە چاپخانە شەومان ڕۆژ دەکردەوە.

ڕۆژنامە عەرەبی‌یەکە پڕکرابوو لە ڕۆژنامەنووسی هەمەڕەنگەی عەرەب. کە هەندێکیان چونکە کۆن خراپیان لە بارەی کوردەوە نووسیبوو لای ئێمە خۆشەویست نەبوونو دەکەوتنە بەر پلارو جوێنە خۆشەکانی ڕەفیق چالاك. ئەو تێکەڵەیە نموونەی پێوەندی‌یە جیاوازەکانی پارتی بوو بە دەستەو لایەنی جیاوازەوە. سەیدا ساڵح یوسفیش، چونکە پیاوچاك، دڵپاك، ئاسۆ فراوانو خێرخواز بوو ئەمانە لەلای جێگەیان دەبۆوە، بەمچەشنە لەو سەردەمەدا زۆر شتی ئەوتۆش بڵادەکرایەوە کە لەگەڵ هێڵە ڕەسمی‌یەکەی پارتیدا نەدەگونجا، بە تایبەتی لە بارەی ئابووریو بازاڕی ئازادەوە.

ئەم جۆرە ڕێبازە زیاتر لە لایەن حەبیب محەمەد کەریمی سکرتێری پارتی‌یەوە دەچەسپێنرا کە زۆر جار هەوڵی دەسەڵات سەپاندنی بوو بەسەر ڕۆژنامەداو زۆر کاری دابووە دەست(ڕەسمی ئەلعامیل) کە چ خۆی چ حەبیب ڕێبازو بیریان زۆر جیاواز بوو لەوەی سەردەمی (صدی المستقبل) ئەگەر ڕەسمی لە ڕووی شەخسیو برادەری پاراستنو وەفاوە نەگۆڕرابوو، ئەوا حەبیب لەم بارەیەشەوە شتێکیتر بوو.

(التآخي) چونکە یەکەم ڕۆژنامەی ئازادو ناحوکمەتی بوو پاش کودەتای چەپەڵی ١٩٦٣ لەبەرئەوە لە دڵو دەروونی خەڵکدا جێگەیەکی تایبەتی بوو. بە ڕاستی زۆر نووسەرو لایەنیش دەرفەتی ڕادەربڕینیان بۆ ڕەخسا. تەنانەت بەعسی‌یەکانیش لەوە بێ بەری نەبوون.

کاری من سەرپەرشتیی لایەنە ئەدەبییەکان بوو، چ ئەدەبی کوردیی کراو بە عەرەبیو چ ئەدەبی عەرەبی خۆی. هەر لە یەکەم ڕۆژیشەوە لە لاپەڕەی هەشتەمدا ستوونێکم هەبوو، چەند ناوێکی لێنرا (تجربة دم)، (ریشتی).. هتد بەڵام ئیمزاکە هەر (دلێر) بوو. هەندێك ووتاریش هەر بە ناوی خۆمەوە بوو. چونکە دەمێك بوو لە جیهانی ڕۆژنامەگەری دوور کەوتبوومەوە، گەلێك بیر، باس، ووشە.. هتد. کۆمەڵە بوو بوون، پەنگیان خواردبۆوەو ووردە کەوتنە دەرپەڕینو دەربڕین.

لە بارەی ئەو ستوونەوە زۆر شایەتیی ووتراوو نووسراوم لە لایە کە جێی شانازیمن.

عەبدولەلیك نووریی نووسەری ناودار بە جێگرەوەی ستوونەکەی شەهید عەبدولجەبار وەهبی، (ئەبو سەعید)ی دادەنا لە (اتحاد الشعب)ی پاش شۆڕشی تەمووزدا. چەند نامەی لە بارەوە دەهات. ڕۆژنامەیەکی کۆنەپەرست نووسیبووی: وا (التآخي) دەرچووەو هەشت پاچی بە دەستەوەیەو لەنگەری لای ئەو (ستوون)ەی من گرتبوو. مامۆستا سوجادی زۆر جار پێی دەووتم: کوڕە، ووتاری دوێنێت دەنگی داوەتەوە.

لەپاڵ نووسەرە عەرەبەکاندا –ئەو سەردەمە لە کورد عەبدولسەمەد خانەقا، عەبدوڕەزاق خالیدی، حامید ئەدیب بابان کاریان دەکرد، کۆمەڵێکی برایانەمان پێکەوە نابوو. ووتارەکانی خانەقا زۆرتر بە ئیمزای (جوامێر) بوو.

(التآخي) لەو سەردەمەدا چەند جار بۆ ماوەی کەم کەم دادەخرا. لە جەنگی حوزەیرانی عەرەبو ئیسرائیلدا بە تەئسیری سەیدای یوسفی ڕۆژنامەکە پاڵپشتی عەرەب بوو. ڕۆژانە نووسینی منیش هەر ئەو ڕێبازەی گرتبوو. بە تایبەتی شانازی بە ووتاری (الی اطفال دمشق)ەوە دەکەم.

ئەو سەردەمە ناکۆکیی نێوان پارتی بە سەرۆکیی بەرزانیو باڵی مامۆستا برایم ئەحمەدو مام جەلال (واتە: مەکتەبی سیاسی) زۆر تیژ بوو.

حکومەتەکەی ئەوڕەحمان عارف ئەم ناکۆکییەی تیژتر دەکرد. ئەوە بوو ئیجازەی بە ڕۆژنامەی (النور)یش دا. بەڵام هەموو هەوڵی سەیدا بۆ ئەوە بوو کە ئەو ناکۆکییە نەباتە سەر لاپەڕەکانی (التآخي) و وانەکەین جلی چڵکنی خۆمان لەبەرچاوی خەڵك هەڵخەین. با بڵێم: لەگەڵ گەلێك ناکۆکیی بیر یا ڕێبازو هەندێکی شەخسیشدا، یەك ووشەم بۆ ئەو ناکۆکییە نەنووسی، کە پلارێکی کاك ئەوشیروان لە (التآخي) منیشی گرتەوە. هەر دەستم نەدایە قەڵەمی ناکۆکی تیژکردن. (التآخي) لە ١٩٦٨دا داخرایەوە. شەڕ دەستی پێکردەوە. تا ڕێکەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠. پاش ئەوە بە ماوەیەك دەرچۆوە. ئەمجارە سەیدا یوسفی وەزیر بوو. پارێزەر جەرجیس فەتحوڵلا با ناوی لەسەر ڕۆژنامەکەش نەنووسرابێ. بەڵام سەرنووسەر ئەو بوو. شەخسیەتێکی تایبەتیی خۆیی هەبوو، عەرەبی نووسێکی باش، ئینگلیزی زانێکی باش. خوێندەوار. هەرچەندە لە ساڵانی چلدائەندامی حیزبی (الشعب)ی عەزیز شەریف بووبوو. لە مەسەلەی ١٩٥٩ی مووسڵدا حوکم درابوو، کەچی هیچ فڕی بە نزیکی لە مارکسیزم یا بیری چەپەوە نەبوو. کوردیی نەدەزانی، نازانم پێوەندی لەگەڵ پارتیدا لە کەیەوە بوو. بەڵام دەزانم ساڵی ١٩٥٩ کە گیرابوو شەهید مەلا ئەنوەری مائی هەوڵی بەردانی دەداو دوایی بەریدابوو. زۆر تووڕەو ڕای تایبەتی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا سیمای خوێندەواریی ئەو بە ڕۆژنامەکەوە دیاربوو. بە گشتی چونکە نووسینە عەرەبییەکەمی بە دڵ بوو، کۆمەڵێ ئەرکی دا بە سەرما لە نووسین، وەرگێڕان، لاپەڕەی ئەدەبی هەردوو زمان.. هتد.

لەم سەردەمەدا چونکە مامۆستا جەرجیس ئەو جێگەیەی لە پارتیدا نەبوو، سەرکردەکانیتر دەستیان دەخستە کاری ڕۆژنامەوەو بە ڕاستو بە چەپدا دەیانهێنا. دەبوو پاش ئازار زیاتر ڕۆژنامەکە ببوایە بە ئاوێنەی هەموو نیشتمانپەروەرانی عێراق. بەڵام لەو ڕووەوە بەرەو دووا ڕۆیشت. لەوە دەچوو هەندێك کێشە، بە تایبەتی پێوەندی دەرەوەی پارتی لەم کارەدا ڕەنگی

دابێتەوە، چونکە کە شەهید دارا تۆفیق بوو بە سەرنووسەر ڕێبازی پێشکەوتنخوازی دیارتر بوو. زۆر ڕۆژنامەنووسی سەر بە چەپ هاتنە ناو نووسەرانی (التآخي)یەوە. یا پێوەندییان لەگەڵ پەیداکرد. کەسانی وەك فائیق بەتی، محەمەدی مەلا کەریم، کامەران قەرەداخی، مەحموود بەیاتی، سامی ئەحمەد، کەوتنە کار لە ساڵانی دواییدا کاك فەلەکەدین کاکەیی بوو بە سکرتێری نووسینو کاك فەرهاد عەونی کارگێڕ بوو (نازانم لە نووسیندا تا چ ڕادەیەك بەشداربووبێ) یادگاری ئەم سەردەمەی (التآخي) زۆرن، بەڵام ئەوەی لەبیر ناچێتەوە.

ساڵی ١٩٧٣ لە کاتی شەڕی عەرەبو ئیسرائیلدا. وا ڕێکەوت کەس لە لێپرسراانی ڕۆژنامە لە بەغدا نەبوو. کاروبار بە ڕۆتینی لە لایەن نووسەرانو کارمەندانی ڕۆژنامەکەوە دەڕۆیشت. لە پڕ کە ئەو شەڕە دەستیپێکرد دەبوو هەڵوێستێك هەبێت. یەکەمجار بوو تێکۆشەری نەمر نووری شاوەیس بێتە (التآخي) و لە شوێنەکەی سەرنووسەر دانیشێو ئەرکی سەرپەرشتی بگرێتە ئەستۆی خۆی لە نیو سەعاتێکدا زۆر باسمانکردو ڕێو شوێن دانرا. کاك نووری هەموو ژیانی لە ڕووی بیرکردنەوەوە چەپ بوو. کۆمەڵێك یادگارم لەگەڵیدا هەیە لەم یادداشتانەدا باس دەکرێن. بۆ ئەو ڕۆژەی (التآخي) ڕێو شوێنی وای دانا کە پشتگیریی تەواو لە عەرەب بکەین، مانشێت، سەرووتار، دەنگوباس کە هەموو پێکەوە ئامادەمانکرد. ئەو ڕێگەیەی گرتبوو. ووتارێکم بە ناوی خۆمەوە نووسی. (انا كردي اكره الصهيونية) هەڵوێستەکەی (التآخي) لە زۆر ناوەندا باش پێشوازیکرا. شەهید دوکتۆر قاسملوو کە ئەودەمە لە بەغدا بوو، زۆری پێخۆشبوو، چونکە ڕەنگە زۆر کەس ئەوە نەزانن کە ئەو زۆر بە قووڵی لە ناوەڕۆکی ڕەگەزپەرستانەو فاشستانەی سەهیونیزم گەیشتبوو. لە ئاهەنگی باڵیۆزخانەی بولگاریادا بووین، بانگیکردم —ووتی: وەرە تۆیان دەوێت. کە هاتم لێخاچێف)ی باڵیۆزی سۆڤێت بوو لەگەڵ کاك نووری شاوەیس وەستابوو

پیرۆزبایی ئەو هەڵوێستەیدەکرد. لام سەیر بوو من باش بناسی- ڕوویتێکردم ووتی: ووتارەکەی تۆش زۆر جوانبوو.

دووەم یادگار:

دووجار (التآخي) شەڕە ڕۆژنامەی بوو. جارێکی پاش هەوڵی کوشتنی بەرزانی لەگەڵ (الثورة)ی بەعسدا ڕۆژانە سەر ووتاری هەریەکەیان هێرشبوو بۆ سەر لایەکەیتر، یا بەرپەرچی دانەوەی ئەوی تریانبوو. بە شانازییەوە دەڵێم لەم شەڕەیاندا چەندم داوا لێکرابێ، قەڵەمم خستەکار. ڕەنگە چەند کەسیتر لەمەدا بەشداربووبن. بەڵام بۆ ڕاستیو مێژوو دەنووسم کە ئێمە هەموو ڕۆژ (الثورة)مان دەخوێندەوە. کۆبوونەوەیەکی سێ کوچکیمان دەبوو. شەهید دارا تۆفیق، برادەرێك کە دەبێ جارێ ناوی نەبەم[١٩]، نووسەری ئەم دێڕانە. زۆر جار هەریەکە نوقتەی ئامادەمان لابوو. موناقەشەمان دەکرد، بیرەکانمان پوختە دەکرد ئەوسا ئەو برادەرە یا من لە ووتارێکدا داماندەڕشت. لە ڕاستییدا زۆری بیرەکان بیری کاك دارا بوون، برادەرەکەم ڕەنگە لە داڕشتنو ووتار نووسیندا لە پێشتر بووبێ. بەڵام منیش بەشداری نووسینو داڕشتنبووم. زۆرجار بیرۆکە یا پێشنیازی وەڵاممان هەر بە نووسین لێکدەداو سەرلەنوێ دامان دەڕشتنەوە.

دووەم شەڕە ڕۆژنامە پاش کوشتنی ١٢ لاوی شیوعی بوو بە دەستی عیسا سوار. دیارە بەو پێیەی کە یەکێکیان خوشکەزامبوو، ئاگاداری ئەو مەسەلەیەم شایەتیی خۆم بۆ مێژوو لە شوێنێکیتردا تۆمار دەکەم. بەڵام کە شەڕە نووسین لە نێوان (طريق الشعب) و (التآخي) دابوو بۆ بەشداری نووسین. من لە هەردوولا خۆم لێ لادا. دیاربوو کە لە هەردوولا کێ ئاگری تیژ دەکرد. جارێك بە ڕێکەوتن (کامەران قەرەداخی، جەعفەر یاسین، من) سێ ووتاری جیامان نووسی، کە ئەم ناکۆکییە سوودی دوژمنی کورد نەبێت سوودی کەسی تێدا نییە، ووتاری هیچمان

---

١٩-ئێستا ناوی دێنم- کاکە حەمە بوو. ٢٠٠٥/٢/١٠.

بڵاونەکرایەوە، چونکە ناکۆکی‌یەکە ڕێگەی دەنگی ئاشتی بەرزبوونەوەی نەدەدا. وابزانم ئەو دوو برادەرە ووتاری خۆیان بۆ (طريق الشعب)یش بردبوو بۆیان بڵاونەکردبوونەوە.

لام سەیر بوو ڕۆژێك دیلانی شاعیر کە هاتبووە بەغدا ووتی: یەکێك دەڵێ تۆش ووتارت لە (التآخي)دا لەو بارەیەوە نووسیوە. توومەز ئەو کەسە ووتارێك کە بە ئیمزای (مامەند) نووسرابوو وا تێگەیشتبوو کە منم، خێرا ڕوونکردنەوەیەکم نووسی‌و بردم. کاك دارا ووتی: ناو ناوی خوایە، خۆ ئەو ناوە موڵکی تۆ نی‌یە. دەتوانی لە (طريق الشعب)دا ئەوە ڕوون بکەیتەوە. بە ڕاستی من ئەوەم لا باش نەبوو، چونکە لەوێ بڵاوبکرایەوە ئەوەی دەگەیاند کە چوومەتە ئەو شەڕە نووسینەوە. دیاربوو بەکارهێنانی ئەو ناوەش لە لایەن برایەکی خۆشەویستەوە کە دەورانی فەلەك کردبووی بە پارتی هەربۆ ئەوە بووە کە شیوعی وابزانن من نووسیومەو ئیتر منیش لەو شەڕە نووسینەوە بگلێم. چونکە بە داخەوە کە زۆر خێرا کەوتبوونە بەینەوە. یەکێك لە گلەیی‌یەکانی هاوڕێ دوکتۆر ڕەحیم عەجینە بە (التآخي) لای مامۆستا عەبدولفەتتاح ئیبراهیم ئەوە بوو کە منی (قیادەی مەرکەزی) لە (التآخي)دا ئیشدەکەم، هاوڕێ عەزیز محەمەد لەم گلەیی‌یە سەرسامبوو و بە پەندێکی خۆشی کوردی وەڵامی دایەوە.

**برایی:**

سەرەتا موناقەشە لەسەر ئەوە بوو ناوی (برایی) بێت یا (برایەتی) ڕەفیق چالاك دەیووت: (برامان برایی کیسەمان جیایی)، کاك ڕەمزی قەزاز سوور بوو لەسەر (برایەتی) یەکەم دەستەی نووسەران بە سەرپەرشتی سەیدا صالح یوسفی کۆبووینەوە، کاك ڕەفیق، کاك ڕەمزی، کەریم بەگی زانستی، من. دەنگ بۆ (برایی) دراو کەوتینە کارو کار بەش کردن. بڕیاربوو کەریم بەگ هەر لە

بارەگای ڕۆژنامەکە دانیشێ‌و (متفرغ) بێت. بەڵام پێش دەست دانەکاری ڕاستەقینە وازی لە کارەکە هێنا. کاك ڕەفیق بوو بە (متفرغ)، کار دابەشکرا، من لە ڕووسی‌یەوە، لە عەرەبی‌یەوە وەرگێڕان‌و ووتاری کورت نووسینم درایە. زۆرجار سەرووتار بە عەرەبی دەهات‌و کاك ڕەفیق دەیکرد بە کوردی. ڕەفیق چالاك خاوەنی زۆر بەهرەی گەورە بوو. نووسینی کوردیی زۆر جوانبوو. پێش دەرچوونی ڕۆژنامەکە کۆمەڵێ ووتاری سیاسی ئامادە کردبوو. بیرکردنەوەی قووڵ نەبوو، بەڵام ئەو شێوە ئەدەبی‌یەی سیاسەتی پێدەنووسی، ئەو کوردی‌یە ڕەنگینە درەوشەیەکی دەدا بە نووسینەکەی. لەو سەردەمەدا پاش گەشتێکی سەختی ژیان‌و هەورازو نشێوی، بیری نەتەوەپەرستیی لا زاڵبوو، بۆ خۆشی‌و بۆ ژیانی نووسیی (هەڵسانەوەش هەیە).

کە کەریم بەگ وازیهێنا. من پێشنیازی هاتنی کاك شێرکۆ بێکەسم کرد. کاك شێرکۆ لە ئەشکەوتی سەردێماندا لەگەڵ سەیدا بوو. کاك ڕەمزی پشتیگرتم کەچی کاك ڕەفیق پێی باشنەبوو. لە ئەنجامدا کاك شێرکۆ بوو بە ئەندامی دەستەی نووسەران. سەیر ئەوەبوو هەر زوو لەگەڵ کاك ڕەفیقدا یەکیانگرت، چونکە ڕێبازی بیریان ئەو سەردەمە یەکبوو. وایان حساب دەکرد کە من‌و کاك ڕەمزی بەرامبەر بەو ڕێبازە دەوەستین کەوانەبوو. کاك ڕەمزی کوردێکی پاکی دڵسۆز بوو، ڕق‌و کینەی نەدەزانی. نەفسیەتی بەرز بوو. ڕای خۆی بە ئاشکرا دەردەبڕی. ئەو سەردەمە زیاتر بە مێژوو و بە ئەدەبی منداڵەوە خەریکبوو. وا دیار بو کە شەڕ بە کۆنە قین دەکرێت. کاك ڕەفیق کە لە یافا لە نێستگەی (کوردستان)دا لەگەڵ کاك ڕەمزی‌و مامۆستا گۆراندا ئیشی کردبوو، نێوانی لەگەڵ هەردووکیاندا خۆشنەبوو، ئەمە درێژەی کێشابوو لەگەڵ هەردووکیاندا پەردەیتری لەمەودووا هەبوو. کاك ڕەفیق تەنیا لایەنی توانست‌و بەهرەکەیی لێکدەدایەوەو وایدەزانی دەبوو هەموو کارەکە لە دەست ئەودا بێت. بە هەموو حاڵێك من نەبووم بە لایەن‌و توانیم لەنگەرێك لە نێوانیاندا ڕاگرم. کاك

ڕەمزی لە ڕۆژنامە دوورکەوتەوە. کە سەردەمێك داخراو پاشان ڕێگەی دەرچوونی درا. کاك ڕەمزی توانیی بە شێوەی گۆڤارو لە سلێمانی دەریبکاتو ناوەکەش بکات بە (برایەتی).

خۆشترین یادگاری لە یاد نەچوو ئەوەی ئەو شەوانەیە کە تا بەیانی لەگەڵ کاك ڕەفیقو کاك شێرکۆدا بەسەر مەکینەی چاپەوە دەوەستاینو یەکە یەکە ووتارمان دەدایە دەست تیپ چنو لەلای ئەوەوە بۆ لای دێر ڕیزکەرو لاپەڕە دروستکەر (چونکە چاپەکە لاینۆ تایپ) بوو. کە کاك ڕەفیق ووتارێکی بە دڵ بووایە بە دەنگی بەرز هاواریدەکرد (بۆڵد) واتە بە (بۆڵد ژمارە- ئەوەندە) لێدرێ.

کە یەکەم ژمارەی کوردی دەرچوو. کە خۆی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردی بوو پاش کودەتای شوومی ١٩٦٣ بە چەند ساڵ دەرچووبێ. بەرەبەیان بوو، هەر لەسەر مەکینەی چاپەکە ستوونی ڕۆژنامەی عەرەبیم بۆ (التآخي) نووسی:

اللهم باسمك افتتح خاني ملحمة مم وزين، وبلغته الكردية كتبها، كي لايقال ان الكرد، عديمو ادراك ومعرفة. اللهم إياك مجد.. حاجي قادری کویی و اليك رفع ترانتيله، بلغته الكردية، كي لايقال (إن هذه اللغة، لم يمجد بها الباري).

اللهم إنا قد كتبنا بلغتنا الكردية امس، واخذ الحرف الكردي من (برايی- التآخی) طريقه الى الاخيار من ابناء كردستان من جديد.

لغتي الكردية اضحت جزءا من كياني و وجودي، احببت لغة الضاد، اذ ادبني الزمن بأدبها، ومن تراثها استقيت معينا من الاحرف المضيئة، وبها غدوت منذ الصبا (انسانين) ان صح ان كل لسان عندالمرء انسان، وكان ذلك قبل ان اتفتح على لغات اخرى، لغات شعوب من عالمنا الفسيح.

اما هذه اللغة، اما لغة زردشت وميديا، و باباطاهر همدانی وخانی ومولوی وگۆران، فهي التي ولدت معي، بها تعلمت لفظه.. الام وكلمة الوطن، بها ناديت

ابي الذي مات وحيدا، دون ان تفسح لي الأيام العجاف الغابرة فرصة التطلع الاخير الى جدثه المسجى في اعماق سيوان الثلج والدماء.

بألفاظ كردية سميت كل ماني مرابع الصبا ومراتع الطفولة من ذكريات ومرح واحزان وارجوان. وفي اعماق احاسيسي ترسخت بتلك اللغة طبيعة كردستان الملهمة: هدير الشلال، روعة شجرة البلوط ورذاذ الربيع وهالة قوس قزح المزركشة بعد امطار غزيرة، بها سمعت شدو الرعاة وتراتيل المتصوفين والام واحلام المناضلين. وبها علمني الشيخ النودهي العظيم بأرجوزة (احمدي)، ومنذ الصبا كلمات من لغة القرآن.

بها سمعت من بيكس وپيرەمێرد وعبدالواحد و گوران روائع المجد والكفاح والبطولة في مجرى الكلمات الثورية المنطلقة التي زينت جيد الأدب العالمي الثائر.

سنين حرمت منها: فكان حنيني اليها، حنين الفطيم الى الرضاع. وددت لو احطم حروف المطابع ولااسمع صريرها المحبوب، اذ لاتقبل كلماتي، لاتوصل حرفي الكردي النابض بالدفء الى اعماق الوديان وقمم الجبال.

امس، صرت اكتب من جديد (تحمل برايى) ماأقوله مع الشمس الى هورامان وسيوان وبادينان. وتحت تلك الأيكة التي منها صنع مهد خانزاد الأميرة، وتحت افيائها تعلم صلاح الدين لغة الكرد- كما يقول گوران. هناك في شقلاوة الرائعة، تنطق كلماتنا بالحق ونفثات من آمال. قيل ان في البعاد والفراق حرقة، وفي الوصال اعظم فرحة. فهل هناك احب من هذا الوصل بالغتي التي بها اخذت سبيلى الى الناس، حيث لاوجود لنا دونهم. يالروعة هذا الوصال ويا لامنية الدوام وكره البعاد من شعور نبيل.

الاحد ١٩٦٧/٥/٧

## چەند پەراوێز بۆ باسی ئەو دوو ڕۆژنامەیە :

من ئەندامی پارتی نەبووم بەڵام لە یەکەم ژمارەی (التآخي)دا تا دووا ژمارەی لە مارتی ١٩٧٤دا نووسینم هەبوو. هەر لەو سەردەمەدا لەناو پارتیدا هەبوون کە لایننا‌خۆش بوو کەسانی وەك ئێمە لەوێدا بنووسین. بۆ ئەو سەردەمە دوو هەڵوێستی حەبیب محەمەد کەریمم بیرە: کە کۆن زۆر دۆست بووین، لە گرتوخانەی سەربازیی ئەبو غرێبەوە مارتی ١٩٥٣ یەکترمان ناسی. ڕۆژێك هاتە ژوور سەرم‌و ووتی:

-توخوا پێم بڵێ چۆن ئەم شتانە دەنووسی. چۆن ئەم بیرانە، ئەو ووشانەت بۆ دێت. دووەم: بۆ پارە وەرناگریت؟ وەك دەڵێن کە شەو دەمێننەوە، ئەوەی لە زانستگا وەریدەگری لێرە سەرفی دەکەیت. ئەمە قسانەم لە پەراوێزی ئەو چاوپێکەوتنەی حەبیبدایە کە ڕۆژنامەی خەبات (ژمارەیەکی نیسانی ١٩٩٨) لە یادی ١٠٠ ساڵەدا بلاویکردبۆوە. کە بە هەموو جۆر خۆی لەناوی من لاداوە. چ لە باسی لیژنەی ڕاگەیاندنی چیاداو چ لە باسی (التآخي)دا. بۆ خۆ لادان کە باسی ناوە خواستەمەنی‌یەکانیان لێکردووە دەڵێ لەبیرم نەماوە. بەڵام با بیری بخەمەوەو بە خوێنەران بڵێم:

دلێر- من بووم، جوامێر- عەبدولسەمەد خانەقابوو، (نصف عمود) بە ئیمزای (ابو علی) بوو کە ڕوشدی ئەلعامیل دەینووسی، (مسمار) ڕەسمی دەینووسی. حەللاج و (ابو پرشنگ) کاك فەلەکەدینی کاکەیی بوو. (مهذار) عەبدولغەنی ئەلەللاح بوو. چەند ووتاری مێژوویی لە سەردەمی سەیدا ساڵح یوسفیدا بە ئیمزای (ابو العلا)، بلاکرایەوە، یاد ئەمر عەزیز شەریف نووسیبوونی. بەرپەرچ دانەوەیان بە ئیمزای (ئیبن خەلەکان) ڕەحمەتی ڕەشید نەجیب نووسیبوونی. زۆرم پێخۆش بوو کە کاك حەبیب بە دەمیدا بێت بە باشی ناوی کاك دارا تۆفیق بهێنێت.

ئەوەش لە بارەی ئەو چاوپێکەوتنەدا ڕاست بکەمەوە کە چاپکەری خەبات لە چیا (سەعید- ابو شامل) نە ئەوە ناوی ڕاستەقینەیەتیو نە خەڵکی بەغدایە وەك کاك حەبیب دەڵێ-کوڕی خێزانێکی شیوعیییەو کە ئیزنم لێ وەرگرت. ناوی دەنووسمو باسی گەلێك کاری مەردانەی دەکەم. ﴿(کامیل)ی خاوەنی چاپخانەی (الحوادث)ەو خەڵکی ئەلقۆشە (٢٠٠٥/٢/١٠)﴾.

-هەر لە بارەی ئەو ووتارە عەرەبییەوە چەند ستوونیترەوە. فازیلی ئامۆزام (شەهید دوکتۆر فازیلی مەلا مەحموود) کە ئەوکاتە لەگەڵ مامۆستا برایمو مام جەلالدا بوو پاشان چووە ڕیزی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانەوە لەوە تووڕە بوو کە من لە (التآخي)دا ئیش بکەمو بە تەوسەوە باسی ئەم (اللهم)ەیەو چەند ئایەتی پیرۆزی قورئان هێنانەوەی لە نوسینەکانمدا دەکردو دەیووت: ئیشەڵلا پارتیو مەلا مستەفا دەتکەنەوە بە مەلا. کە دوا جار ساڵی ١٩٨١ ئەو خۆشەویستە نازدارەم لە ڤیەنا دیو تەواو لە بیری ئیسلامیدا نقوم بووبوو ئەوەم هێنایەوە بیر.

-(التآخي) و (برایی) بۆ ئەو سەردەمە هەنگاوێکی تەکنیکی پێشکەوتوو بوون بۆ ڕۆژنامەی کوردی. لە خانەو ستوون پۆلێن کردندا شتێکی تازەیان پێوە دیاربوو. (التآخي) زیاتر سنگی بۆ هەموو نووسەرە عەرەبو کوردەکان کردبۆوە. بەڵام (برایی) زیاتر بەرەو ئەو ڕێبازە نەتەوەیییە دەچوو کە کاك ڕەفیق کردبووی بە ڕێباز هەر لەسەر لاپەڕەکانی شیعری هەنگاوی دووەمی شاعیرانەی شێرکۆ بێکەسو بوونە شاعیری تەواوی حەسیب قەرەداخی (ب، خەبات) و نووسینەکانی نەمر ئازادی مستەفا بە ناوی (چاوێك)ەوە بڵاودەکرایەوە.

-لە دووای پانزەی ئازارەوە- کە سەردەمێ کاك سەعید ناکامو دووایی کۆمەڵە برادەرێکیتر خەریکی (برایەتی) بوون. من لە جاربەجار بۆ نووسین زیاتر پێوەندیم بە ڕۆژنامە کوردییەکەوە نەبوو. هەرچەندە مامۆستا جەرجیس فەتحوڵلا دەیووت: دەبێ وریابیتو ئاگات لە (برایەتی) بێت، چونکە سەعید

ناکام‌و محەمەدی مەلا کەریم کۆنە شیوعین‌و ڕەنگە بیری خۆیان فڕێ بدەنە ناو ڕۆژنامەکەوە.

زۆرتر من بە عەرەبییەکەوە خەریکبووم‌و بۆ کوردی نووسەر زۆر پەیدابووبوون.

**نووسەری کورد:**

ئەم گۆڤارە سێ خولی هەبوو. پاش دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کوردو کۆنگرەی یەکەم لە حوزەیرانی ١٩٧٠دا بڕیاری دەرکردنی درا. دەستەی نووسەرانی بۆ دانرا بۆ ئەوەی هەموو ئیشی یەکێتی نەکەوێتە سەر چەند کەسێك وا بە باش زانرا کە سەرۆك‌و جێگرو سکرتێری یەکێتی سەرنوسەر نەبن، د. مارف خەزنەدار کرا بە سەرنووسەر. بەڵام بە حوکمی ئەوەی سکرتێری یەکێتی بووم‌و کاك هەژار زۆرتر لە سەرەوە بوو وەك زۆربەی کارەکانی یەکێتیم کەوتبووە سەرشان. لە کاری گۆڤارەکە شەوە دوور نەبووم‌و هیچ نەبێت ووتارم دەنوسی.

ڕاستی د. مارف زەوقی کاری بیبلۆگرافی‌و کاری چاپخانەی هەبوو. (١١) ژمارەی بە باشی دەرکرد. بەڵام هەر لەسەر کاری گۆڤارەکە لەگەڵ دەستەی نووسەراندا بە تایبەتی لەگەڵ کاك جەلال دەبباغدا تێکچوو. کە ئەوەو گەلێك ناکۆکی تری کۆبۆوە لە کۆبوونەوەیەکدا کە خۆی نەهاتبوو، تەنیا من نەبم هەموو دەستەی بەڕێوەبەر نارەزاییان بەرامبەر نیشاندا، سەیدا ساڵح یوسفی سەرۆکی نووسەران بوو کە ئەودەمە ووتی: قەدرێ وی کێم بوو، قەدری وی کێم بوو، بێژنەوی بلا ئیستیقالە بکا. بۆ هەفتەی دوایی ئیستیقالەی لە جێگری سەرۆك خرایە بەردەممان، بە دەنگی هەمووان (من نەبم)م ئیستیقالە وەرگیراو منیان کرد بە جێگری سەرۆك. بەڵام کە هەندێکمان لامان وابوو بە سەرنووسەری گۆڤارەکە بمێنێتەوە ئەوە پەسەند کرا. بەڵام ئەو بەلای گۆڤاردا نەهاتەوە. تا پاش ئازاری

١٩٧٤ کە سەیدا ساڵحو زۆربەی ئەندامان چوونە شاخ، ئێمەش زوربەی ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری بڕیاری تەجمیدی کارکردنمان دا[٢٠].

پاش ڕاپەڕین چیرۆکنووسێك زۆر شانازی بەو چەند چیرۆکەوە کردبوو کە لەو ژمارانەی (نووسەری کورد)دا بڵاویکردبۆوە، ماڵی ئاوا کە لە جیاتی هەڵگرتنی مەسئولیەتی بڵاوکردنەوە لە لایەن ئێمەوە پلاریشی تێگرتبووین. کە لە شوێنێکدا ئیشارەتی ئەمەمکردبوو لە (برایەتی)دا لایان سەیر بوو گوایە (پرۆفیسۆرێك منەتی بڵاوکردنەوە بەسەر چیرۆکنووسێکدا دەکات!! نەخێر منەت نییە، بەڵام هەڵگرتنی مەسئولیەتی ئەو ١٢ ژمارەیە کە شاگوڵێکن بە سنگی ئەدەبیاتی بەراوردەوە دەبوو پاداشتی پلار نەبێ.

زۆرجار، یا بڵێم پاش بڵاوبوونەوەی هەموو ژمارەیەك دەکەوتینە بەر لێپرسینەوەو (ڕاپۆرت نووس) کاریان بۆ دەبوو. بەڵام هەر لە ڕیزی ئەوسای حکوومەتدا کەسانی وەك (کاك بابەکر پشەدەری‌و د. عەبدولستار تاهیر شەریف) هەبوون کە بە گەرمی بەرگریان لێدەکردین‌و قسەی ئەوانەیان پووچەڵ دەکردەوە.

پاش چەند ژمارە کاکە حەمەی مەلا کەریم لای وابوو کە ناوی بەسەر گۆڤارەکەوە بێت مانای وایە هەرکار دەکاو ئەمە زیانی بۆ مووچەی تەقاویتی یەکەی ڕۆژنامەنووسیی دەبێت. هەرچەند نەقابە ووتیان: مادام بێ پارە کاردەکات زیانی نییە، بەڵام ئەمە بە هیچ گوێچکەیەکی ئەودا نەچوو، بێ ناویش وازی لە گۆڤارەکە نەهێناو تا دووایی پێکەوە خەریکی نووسین، چاپکردن، ڕاستکردنەوە، حەماڵی بووین.

---

٢٠-برایان لە شاخ ژمارە (١٢)میان دەرکرد، خولی دووەم. پاش کۆنگرەی پێنجەم ١٩٧٨ بوو. من کە بووم بە سەرۆکی یەکێتی ڕام وابوو د. مارف هەر بە سەرنووسەری بمێنێتەوە. بەڵام دەستەی بەڕێوەبەر ڕایان وابوو کە خۆم سەرنووسەریش بم.

هەرچەندە بوونی سکرتێری نووسین مەرجی یاسایی نییە. بەڵام بێ گوێدانە نارەزایی توندی کاکە حەمە ناوی مومتاز حەیدەریم بە سکرتێری نووسین خستە لاپەڕەی یەکەمەوەو کاکە حەمەش. بە تکای مامۆستا عیزەدین فەیزی (کە بە ڕاستی برا گەورەمانبوو) ڕازیبوو. مەبەسیش ئەوە بوو کە کاك مومتاز. بەو هۆیەوە مووچەی تەقاویتی بدرێتێ کە تا ئێستاش وەریدەگرێ.

هەموو جارێك بە هەزار ڕەنجو هەوڵ پارەی چاپکرنی ژمارەکەمان پەیدا دەکرد. کەس نە مانگانە نە پاداشتی لە (نووسەری کورد) وەرنەدەگرت، بەڵکو زۆرجار لەگەڵ کاکە حەمەدا ئەرکی پێچانەوەو ناردنیمان لە ئەستۆ بوو. هەوڵی ئەوەمان دا کە (نووسەری کورد) دەنگی هەموو نووسەرانی کوردو هەموو ڕێبازو تەمەنێك بێت. بەرهەمی چاکی کەسی نەخستەلاوە. تەنانەت کە جارێك لەسەر چیرۆکێکی پڕ لەئەندێشەی زاتیی نووسەرێکی کۆچکردوومان گلەییمان هاتەسەر، وەڵامم ئەوە بوو کە ئەمە گۆڤاری من نییە تا هەموو سەر بەو ڕێبازە ئەدەبییە بێت کە باوەڕم پێیەتی، بەڵکو گۆڤاری هەموو نووسەرانی کوردە کە ئەم چەشنە لایەنەش دەنووسن.

لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیی نووسەرانی سەربەخۆی کورد لە لایەن ڕژێمی فاشستییەوە (نوسەری کورد)یش ئیجازەی نوێی درایەو بوو بە ئۆرگانی ئەو لقەی بۆ کوردیان جیاکردبۆوە. کە ئێمە هەرچەند مانگێك توانیمان لەگەڵ نووسەرە عەرەبەکاندا ئیدارە بکەین‌و وازمان هێنا. (نووسەری کورد) خولێکی دەرکرد. سەیر ئەوە بوو ئەوانەی ڕەخنەیان لە ئێمە دەگرت کە بۆچ چووینە لقی یەکێتی نووسەرانی عێراقەوە زۆربەیان بۆ گۆڤاری ئەو لقەیان دەنووسی گۆڤارەکەش دوور لە هەموو وێڵو وەفایەك لە یەکەم ژمارەوە کەوتە هێرش کردنە سەرم. ئەو برایانە گۆڤارەکەی خۆیان ناونابوو خوولی سێیەم. بەڵام کە (نووسەری کورد)مان پاش ڕاپەڕین ژیاندەوەو دوو جار دوو ژمارەیمان دەرکرد. ئێمەش ئەمەمان بە خوولی سێیەم داناو کۆسپ زۆر بوو لە ڕێگەماندا.

یەکێتیی نووسەران هیچ بوودجەیەکی نەبوو تا گۆڤار دەرکات. کە لە لایەن حکومەتی هەرێمەوە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٥دا یارمەتییەك دراین هەروەها هەڤاڵ مام جەلالیش دەستی گرتین ژمارەیەکمان دا بە چاپخانە ئەو ژمارەیە چاپ کرابوو، هێشتا بڵاونەکرابۆوە کە لە ٣١ ئابی ١٩٩٦دا دەستی بەسەردا گیرا. کە داوامان کرد ڕێگەی بڵاوکردنەوەی بدەن. چونکە لەسەر ڕێبازی یەکگرتووی یەکێتی نووسەران شتێکی سەر بە دووبەرەکی، سەربە خۆکوژی تێدانییە، دەنگی برایی‌و ئاشتییە، بەڵام وەڵام بە زمانی نووسەری برامان عەبدوڵڵا سەراجەوە ئەوە بوو: ئەو ژمارەیە ئێستا دەنکە کولەکەی تێدا دەفرۆشرێ".

ئەو ژمارەیەو چەند ژمارەیەکی تری خولی سێیەم یادگاری کاك محەمەد موکریشن بۆ ڕۆژنامەی کوردی، چونکە بە ڕاستی ڕۆڵی کاکە حەمەی خوولی دووەمی دەبینی بەشکم ئەو ئەرکەو ئەو سەرەنجامە چیرۆکێکیتر دوور لە ئەژدیهاو تۆڵە بخەنە سەر مەلۆی ڕەنجو ئازارو سەرفرازیی‌و سەدساڵەیی ڕۆژنامەگەریی کوردی.

## سیاسەت:

هەندێك جار دەچمەوە ئەو تاوەی وەك منداڵێك لە گێژاوی ژیاندا دیاردەیەکم دیبێت ڕەنگ‌و بۆی بەرەو هۆشکردنەوەی سیاسی پێوە دیاربێت.

وەك خەو شتێکم لەبیرە دەبێ ساڵی ١٩٢٨-١٩٢٩ بووبێت. بە هەموو حاڵێك پێش چوونە قوتابخانە. ڕەنگە هەر بیرەوەری‌و لەبیرنەچوونەوە بێ، یا گێڕانەوەی جار دووای جاری لەمەودووای باوکم بێت لە بیری منیدا چەسپاندبێت.

یەکەم چوونە بەغدا، هەندێك لە ئوتێل دابەزین، شەرێك لە گەڕەکی (الطوب) کە ماڵە ئاسیاوێکمان لەوێ بوو. دیمەنی پۆلیس کە بە دووای تاوانباردا ڕابکات لە هەمووی دیارتر کە دێرزەمان بەسەر زمانی باوکمەوە بوو،

بینینی ماڵی شێخی گەورە –شێخ مەحموودی مەلیك بوو. دیوەخانەکەی یا بە واتای ئێستا هۆڵەکەی موحەجەرەیەکی ناوەڕاست بەتاڵی تێدابوو –دیارە ئەوە خەڵکەکەی لە یەکتر جیادەکردەوە. شێخ خۆی لە سەرەوەی مەجلیسدا، لە ناوەڕاستدا دانیشتبوو هەر ئەوەندەم لەبیرە، بەڵام ئەوەی باوکم دەیگێڕایەوە ئەوە بوو کەوتبووم بابە –ئەمەیە مزگەوتەکەی شێخ مەحوود؟ شێخی مەزن ماچی کردبوومو فەرمووبووی:

-کوڕم، وایە تۆ شیرت پاکە، خۆزگە هەموو کورد وایان جەزا بدامایەوە.

چەند جارێتر لە ژیاندا بە خزمەتی شێخ گەیشتووم کە دەبێ لە شوێنو ساڵی خۆیدا باسی بکەم. بەڵام هەر ڕەنگە ئەوە سەرەتای سیاسەت بێتو باسی مەلیکی کوردو لەناوچوونی حکوومەتی کوردستان بیستنم بووبێت. هەر لەو سەردەمەدا هێشتا نەچووبوومە قوتابخانە کە قوتابییەکانم دەدی یەکی شریتێکی ڕەش بە یەخەیانەوە کرابوو- دەیانووت: ئینگلیز کوشتی (مەبەست مەلیك غازی بوو) یادگارەکەی ماڵی شێخو ئەم باسی کوشتنە یەکەم ڕقی ئینگلیزی لە دڵدا چەکەرە پێکردم.

دێمە سەر یەکەم چالاکیی سیاسیی –بەڵام پێشتر بە ئەرکی دەزانم هەندێك یادگاری باوکم بگێڕمەوە کە بە داخەوە تا ئێستا کەم باسکراون. هەر ئەو یادگارانەی ئەو وایان کردبوو کە هەمیشە ئامۆژگاریم بکات کە لە دوو شتەوە دووربم: سیاسەتو شیعر. بەڵام بە قسەم نەکرد، یا ژیانو لافاوی بەرەو هەردووکیانی ڕاکێشام. جا نازانم دەبوو بە قسەی بکەم یا نا؟ یا ئەگەر بە قسەم بکردایە نەخشەی ژیانم بۆ کوێ دەچوو؟

## برایەتیو یەکێتی

مامۆستایان عەلائەدین سوجادیو سەعید ناکام هەریەکەیان پاشبەندێکیان بۆ دیوانی سەفوەت نووسیوە، لەوێدا هەردووکیان لە چالاکیی سیاسیی ئەو

دوواون لە ناوەڕاستی سی ساڵەکانی ئەم[٢١] سەدەیەدا باسی کاری حزبیی ئەو سەردەمەی دەکەن. بەڵام بە کۆنکرێتی نەچوونەتە سەر باسەکە، کە دەبێ باسی حیزبی (یەکێتی) و پاشان (برایەتیو یەکێتی) بێت.

پاش ئەوەی شێخ مەحموود لە پیران هاتەوەو چووە بەغداو پاشان نەفیی ناسریەو عانەو حیللەو بەغدا کرا. کڵپەی کوردایەتی لە شاری سلێمانیدا دانەمرکایەوە. بەڵام دیارە وەك پاش هەموو نوشستییەك چەند جۆرە لێکدانەوە پەیدا دەبێت.

ئینگلیز خواکان هەموو وەباڵیان دەخستە ئەستۆی شێخ، گوایە شارەزانەبوونی ئەو لە دیبلۆماسیەتو ئێتیکێت بوو بە هۆی دڵ ڕەنجاندنی ئینگلیزو پشتکردنە تورك. گاڵتەو نوکتەی هەمەڕەنگیان لەم بارەیەوە بۆ خۆیو شێخ حەمە غەریب هەڵدەبەست. بەڵام خۆزگە ئەوانە دەمانو دەیاندی ئەو شێخەی ١٩١٩ زۆر لەعەگاڵ بەسەرەکانی کاربەدەستانی ئێستای کەنداوو عەرەبستانو زۆر لە سەرکردەکانی ئێستای سێ قارەی جیهانی سێیەمی ١٩٩٥ دیپلۆماسیەتو ئێتکێتی زیاتر زانیووە. هەر ئەوەندەیە عاشقی مەیو داوێن پیسی نەبووە.

هەر سەرەتا

بێگومان ئەم یاداشتە بەشی زۆری دەچێتە خانەی یادداشتی سیاسییەوە، چ سیاسەتی گشتیو چ باری گشتیی وڵاتو جیهانو وەك هەموو یادداشتێك لە ڕێگەی چالاکیی خۆمو بەشداریمەوە لە ڕووداودا دەچمە ناو جیهانی گشتییەوە.

بۆ یەکەم پێوەندیم، یا هوشیاربوونەوەم یا چوونە ناو جیهانی سیاسەت دەگەڕێم، هەندێکجار تاڵە مووی کۆنتر دەدۆزمەوەو لێم وندەبێت. بەهەرحاڵ ئەو تاڵە مووە هەر لە ماڵەوەو لە بنەماڵەوە دەست پێدەکات.

---

٢١-دەڵێم ئەم سەدەیە- سەدەی بیستەم، چونکە دڵنیام کە خۆم توانای چاپم نابێتو چاپەکە دەکەوێتە سەدەی بیستو یەکەم.

هاورێیەکی کۆنم خەریکی یادداشت نووسینبوو، شتێکم بیرخستەوە ووتی:

-ڕاستە پێوەندیی بە منەوە هەیە، بەڵام ئەوەیان یادداشتی تۆیە، لەناو یادداشتەکانی خۆتدا بینووسە وا ئێستا کە بۆ ئەو تاڵە مووە دەگەڕێم، هەندێ یادداشتی باوکم‌و مامم دێنەوە بەردەمم کە دەبوو ئەوان بیاننووسن، بەڵام کە ژیان ئەو دەرفەتەی بەوان نەداو لە یادو بیری مندا جێ ماون، ئەوا هەر دەبێ بچنە ناو ئەم یادداشتانەوە.

کە چاوم کردەوە یان هۆشم پەیداکرد، دەمزانی چ باوکم‌و چ مامم (ئەحمەدینی حاجی مەلا ڕەسووڵ- ن. ئاری) بە کوردایەتییەوە خەریکبوون‌و چەند چەرمەسەریشیان لە پێناویدا تووشبووە، بە تایبەتی مامم.

کۆنترین کاری نیشتمانپەروەریی هەردووکیان لە دروستکردنی حیزبی یەکێتیدا بوو کە دوایی بە یەکگرتن لەگەڵ حیزبی (برایەتی)دا بوو بە (حیزبی برایەتی‌و یەکێتی) و تا کۆتایی ساڵانی سی لە کاردا بوو.

بەو دوو یادداشتەدا کە مامستا عەلائەدین سوجادی‌و مامۆستا سەعید ناکام بۆ دیوانی (سەفوەت)یان نووسیوە، دیارە کە چالاکیی ئەو حیزبی (یەکێتی)یە لە ساڵی ١٩٣٤دا لە گەرمەیدا بوو.

زۆرجار داوام لە باوکم کردووە کە باسی ئەو دوو حیزبە بخاتە سەر کاغەز یا بۆ منی بگێڕێتەوە بەشکم لە دەرفەتێکدا بینووسم، وەڵام ئەوە بوو کە ئێمە سووێندمان بە قورئان‌و بە خاکی کوردستان خواردبوو کە ناپاکی لەگەڵ حیزبدا نەکەین‌و نهێنییەکانیشی دەرنەخەین، لەبەئەوە دەبێ چی هەبووە بە نهێنی بمێنێتەوە.

دۆستی دێرینی باوکم مەحموود فەهمیی فەقێ محەمەدی هەمەوەند، ئەو ماوەیە نەبێت کە خۆی ماڵێکی لە سلێمانی بوو. کە لە مۆرتکەوە دەهاتە سلێمانی لە ماڵی ئێمە دەبووە میوان. قسەو شەوچەرەی شەویان لەگەڵ باوکمدا یادگاری کۆن‌و باسی سەردەم‌و چمکی شیعرو ئەدەب بوو لەو یادگارانەدا باسی

حیزبی برایەتی‌و یەکێتیش دەهاتە کایەوەو دەرفەتیش بۆ تێهەڵقورتاندن‌و پرسیاریش لە هەردووکیان بۆ من دەڕەخساو ئێستا هەر لە پرسیارو لە یادگاری هەردووکیان‌و مامیشمدا دەتوانم ئەمەندە لە بارەی (برایەتی‌و یەکێتی)یەوە بنووسم.

حیزبی یەکێتی لە مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵ دامەزرا دینەمۆو کۆڵەکەی بزووتنەوە مەحموود فەهمیی هەمەوەند بووە. مەلا مستەفای سەفوەت وەك سکرتێرو کارگێڕ باوەڕی دراوەتێ. لەوە دەچێت لە دروشمی گشتیی سەربەخۆیی کوردستان زیاتر پرۆگرامێکیتری ئاشکراو پلە بۆ دانراویان نەبووبێت، هەرچەندە مامۆستا ناکام باسی یەك پرۆگرامیی خۆی‌و سەفوەت دەکات. وەك دەگێڕرایەوە دیارە لە پاڵ هەندێك کەسانی ناسراوی شار ڕاکێشاندا هەوڵی پێوەندی بە کوردە دەسەڵاتدارەکانی عەشایەرو حکومەت دراوە. بەم چەشنە لەناو ئەوانەدا کە ئەندامی حیزبەکە یا هەواداریبوون ناوی بەڕێوەبەری ناوچە (مدیری ناحیە) و قائیمقامەکان دەبرا.

لەوانەدا کە ناویان دەهات: فەقێ محەمەدی هەمەوەند (باوکی مەحموود ئەفەندی کە بەڕێوەبەری ناوچەی قەرەداغ‌و پاشان بازیان بووە)، شێخ یوسفی شەدەڵە، حسێن بەگی حەسەن بەگی جاف بەڕێوەبەری وارماوا بوون.

باوکم لە قائیمقامەکاندا زیاتر باسی ئیبراهیم ئەدهەمی دەکرد (باوکی کاك جاویدو کاك ساجیدی ئەندازیاری باپیری شەهید فیکرەت‌و یەڵمازو کاك عیسمەت- غەسسان رفاعی) کە قایمقامی چەمچەماڵ بووە، دەیووت کە بە ئیش دەچوومە کەرکووك لای ئەو میوان دەبووم، زۆر ستایشی پیاوەتی‌و مەردی‌و نیشتمانپەروەریی دەکرد. دەیووت: پاش ئەوە ڕۆژێك لە چەمچەماڵ لام دەدا دەچوومە کەرکووك‌و لەوێ میوانی شێخ مستەفای شێخ باقی دەبووم، کە لێپرسراوی حیزبەکە بووە لە کەرکووك.

نازانم زیاتر تەئسیری مەحموود ئەفەندی بووە یا هەر سەرنەگرتنی حکوومەتی شێخ مەحموود بوو وایکردووە کە لە سەرەتاوە ئەمان: دەستەی

یەکێتی خۆیان لە بەرەی شێخان‌و لە خاوەن دەسەڵاتە گەورەکان بەدوور بگرن. بۆ رووناکبیرێکی سەردەم گەڕاون، زۆریان بیر لە ئەمین زەکی بەگ کردۆتەوە، بەڵام دیارە ئەمین زەکی ئامادەی چوونە ناو چالاکیی سیاسی کوردی نەبووە، کە ساڵح زەکی بەگی ساحێبقران بوو بە موتەسەریف (پارێزگار)ی سلێمانی کۆمەڵی یەکێتی‌و برایەتی باوکمیان ڕاسپاردبوو کە لەگەڵیدا بدوێت ئەو ببێت بە سەرۆکیان. دەیگێڕایەوە دەیووت: چووم هەر لە ژوورەکەی خۆیدا باسم بۆ کردو داوای هاتنە ناو حیزبم لێکرد. دەیووت: زۆر پێکەنی‌و ووتی: مەلا مستەفا، من موتەسەریفی حکوومەتم، تۆش لە ژووری خاوەنی گەورەترین دەسەڵاتی ئەو لیوایەدایت، چۆن دەوێری داوای کاری وا ترسناکم لێ بکەیت. ووتم: قوربان من قسە لەگەڵ نەوەی ساڵم‌و کوردی دەکەم. دیسان بە پێکەنینەوە ووتی:

-کارەکەتان زۆر گەورەو پیرۆزە، بۆ چوونەکانتان ڕاستە، ئامادەم هەموو یارمەتیەکتان بدەم‌و پارێزگاریتان بکەم. بەڵام بۆ بوون بە سەرۆك یا ئەندامی حیزبی لێمببوورن. ساڵانێکی زۆر ڕابوردبوو، ساڵی ١٩٥٤ چوومە قەڵادزێ، باوکم نامەیەکی دابوومێ بۆ عەبدوڵڵا بەگی ئەحمەد بەگی تاپۆ (کە لە بەیتەرە) بوو عەبدوڵڵا بەگ ئەو ساڵەی لە قەڵادزێ بووم وەك کوڕی خۆی سەیری دەکردم، ئەوسا بۆم دەرکەوت کە پێوەندی‌و خۆشەویستیی نێوان ئەوو باوکم‌و مامم لە ڕۆژانی برایەتی‌و یەکێتی‌یەوەیە بەڵکو شتێکی سەیری کاری ئەو حیزبەی بۆ گێڕامەوە، کە چ باوکم‌و چ مەحموود ئەفەندی بە پێکەنینەوە ووتیان: ڕاستە ئێمە ئەوسا وا کارماندەکرد.

عومەر بەگی ئەحمەد بەگ- برای عەبدوڵڵا بەگ، قۆمیسەری پۆلیس بووە، خۆی ئەندامی ئەو حیزبە بووە، زۆر لە پۆلیسەکانیشیی خستۆتە کارو سوێندیان خواردووە کاتێ کە بەیاننامەیان بڵاوکردبێتەوە، زۆرتر ئەو بەیاننامانە بە خەتی کاك ناکام بوون‌و بە کاربۆن نووسراونەتەوەو شەو

پۆلیسەکان بە شاردا بڵاویان کردۆتەوەو سبەینێ عومەر بەگ خۆی دەم بە پێکەنینەوە بێسەرو شوێن گەڕاوە بە دووای ئەوانەدا کە بەیانیان بڵاوکردۆتەوە؛ گوایە کەسی پێنەگیراوە.

برازاکانی مەلا ئەسعەدی مەحوی (سۆران‌و ئاگرین) زۆریان لە بارەی حیزبی برایەتی‌یەوە بڵاوکردۆتەوە نازانم مامۆستا ناکام چەندی لەسەر (یەکێتی) لە یادداشتەکانی خۆیدا نووسیووە. بەڵام ئەوەندە دەزانم کە هەردوو حیزبەکە ماوەیەك بە ناوی (برایەتی‌و یەکێتی)یەوە بوون بە یەك. جا نازانم شێخ لەتیفی حەفیدو مەحموود فەهمیی هەمەوەند بوون بە یەك یا هەردووکیان لە پێناوی ئەو یەکگرتنەدا لادراون؟ لە ئەنجامی ئەو حیزبەش ئەوە دەزانم کە بە هۆی مەلا حەسەنی بیارەوە، جەمال بابانی وەزیری ئەو سەردەمە لێیان نزیکبۆوەو زوربەیانی بەرەو حیزبێکی عێراقی حیزبی جەمیل مەدفەعی برد. لەوێدا حیزبەکە تێکچوو. باوکم دەیووت: کە مەلا حەسەن هات‌و ووتی: تۆ هاوسوێندی ئێمەی، ووتم: نەخێر تەواو. من سوێندم بۆ حیزبێکی کورد خواردبوو. وەك بزانم ئیتر ئەوە دوواکاری حیزبایەتیی باوکم بوو. هەر لەو سەردەمەشەوە قینی لە حیزبایەتی بوو. لەبەرئەوە کۆششی مەحموود ئەفەندی لەگەڵیدا بۆ چوونە ناو حیزبی تەحرور سوودی نەبوو. کە ڕەحمەتی ڕەفیق چالاك لە چەند شوێن وتبووی ساڵی ١٩٤٧ حیزبی شیوعی داوایان لێکردم لە حیزبدا ڕێکی بخەم، ڕاستیی ئەوەم لە کاك ئەحمەد غەفوور پرسی ووتی: لە ڕاستیدا من (کاك ئەحمەد)- هەردی، مەحموود ئەفەندی هاتوچۆماندەکرد، بەڵام نەهاتە حیزبەوە. لە سەرەتای ساڵانی پەنجاشدا تەنیا ئیمزای هەندێك بەڵگەی ئاشتیخوازنی دەکرد.

## بۆ یادداشت نووسین

جەنگیز ئیتماتۆڤ لە سەرەتای (چەند لاپەڕەیەك لە ژیانمدا) نووسیویەتی:

(نووسینی گەشتی ژیان بۆ ئەوەی خەڵکیتر بیخوێننەوە بە چاپکراوی بڵاوبکرێتەوە کارێکی زۆر گرانە. کێ دەزانێ کامە باشترە: درێژە بە وەسفی

ژیـان یـا کورتکردنـەوەی؟ ئەگـەر زۆرت نووسـی هەنـدێك دەڵـێن: سـەیرکەن، درێژەیدایـەو زۆری لەسـەر ڕۆیشت، ئەگـەر کەمیشت نووسی دەڵـێن: پێویست ناکـات ئەگـەر شـتێکی سـەرنج ڕاکێشـەر نـەبێت بنووسـیت؟ بـە هـەموو حـاڵ نەنووسین باشترە..

کە پێویستە منیش بنووسم، هەوڵبدەم وا لـە چـل سـاڵ تێپـەڕیم، ڕەنگـە لـە ژیانمـدا شـتێك هـەبێت سـەرنج ڕابکێشـێت) ئـەو لـە پـاش چـل سـاڵە دەرفـەتی نووسـینی بـوو، وا مـن پـاش شەسـت سـاڵ لـە ژیـانێکی پـانۆ بـەرینو جـەنجاڵو هەمەڕەنگو پڕ مەینەتیدا دەنووسم:

## بەرەو سیاسەت

یەکـەم ڕووداوی سیاسـی کـە تێیـدا بەشـداربووم، خۆپیشـاندانەکانی شـەڕی ڕەشـید عالیـیە، بـەڵێ بەشـداربووم چونکە لـە پـاڵ پیـاوە گـەورەکانی شـاردا لـە تەنیشت باوکمەوە دەڕۆیشتم کە ئـەوانیش چوونە سـەربانی مزگـەوتی گـەورە، ئەوا لە تەنیشت میکرۆفۆنەکەوە بووم. یەکەمجار بوو میکرۆفۆن ببینـم، ڕەنگـە یەکـەمجاریش بێـت شاری سلێمانی میکرۆفـۆنی بـە خۆیـەوە دیبێـتو هـەرپێی بڵێ.. موکەبەرە.

شـەڕی ڕەشـید عـالی، خـەڵك ئـەو ڕووداوەیـان ناونـا، وەك کوشـتاری شەشـی ڕەشی ئەیلوولیان ناونا شەڕی بەردەرکی سەرا.

نووسـەرو مێژوونووسـانی عـەرەب بـە چـەند لایەنـە لـە بـارەی ئـەم ڕووداوەیانــەوە نووسـیوە. لـەناو کـورددا تـەنیا د. کـەمال مەزهـەر ئەحمـەد ووتـارێکی لـە بـارەوە نووسـیووە. هەرچـەندە کـاك کـەمالو مـن بەشـێکی زۆری گەشتی ژیانمان پێکەوە بڕیوەو لە زۆر شتیدا ڕامان یەکە، بـەڵام لـەو نوسـینەیدا لــە دوو ڕووەوە لەگەڵیــدا نــاکۆکم. یەکــەمیان: لــە چوارچـێوەی گشــتیی لێکدانەوەو جێگەدانانـدا بۆ ڕووداوەکە، کە نـەدەبوو بـە پێـی ئـەنالیزو بۆچونی

ئێمە، تەنیا ئەو عاتیفەیەی خەڵکی هەژاندبوو بۆ ڕاپەڕین دژی ئینگلیز وامان لێ بکات کە بە سۆزەوە ڕووکردنەوە فاشستی ئەڵەمان‌و بە پشت‌و پەنا دانانی بە هەڵەیەکی گەورە نەزانین، با پاڵپێوەنەر دوژمنایەتیی ئینگلیزیش بێت.

دووەم: کاک کەمال کە من زۆر یادگارم لە بارەی ئەو شەڕەوە لەبیر ماوە دەیتوانی داوای بکات بۆی تۆماربکەم. بە تایبەتی وا دیارە لە بیری خۆیدا دووای ئەو بەنگوباوانە کەوتبێت کە ئینگلیز خواکان بۆ باوکمیان درستکرد. لەبەرئەوە نە بە چاك نە بە خراپ ناوی ئەوی نەبردووە. من لێرەدا مێژوو نانووسم، لەبەرئەوە نەبە قووڵی‌و نە بە فراوانی ناچمە ناو باسی شەڕی ڕەشید عالییەوە، بۆ کەسێك کە بیەوێ شتێك لە بارەیەوە بزانێت، ئەوا سەرچاوە زۆرە. من تەنیا لە کوێ بیرویادگارەوە ئەو چەند دیمەنە دەگێڕمەوە کە باش لە بیرم ماون.

ئەوەی بیرمە —سەرەتا محەمەد عەلی ئەفەندیی خەلیفەی مەئمووری ئەوقافی سلێمانی، مەلاکانی سلێمانی‌و هەندێك لە شێخەکانی تەریقەتی لە دائیرەی ئەوقاف کۆکردەوە. خۆی پێشیان دەکەوت‌و چوونە مزگەوتی گەورە. لەوێ بەیداخەکەی کاك ئەحمەدیان هێنایە دەرەوەو هەموو لە گۆڕەپانی بەر مزگەوتی گەورەدا وەستان. میکرۆفۆنەکە لە سەربانی ئەوسای ڕووبەڕووی گۆڕەپانەکە دانرابوو. ئاهەنگ گێڕ یا (عەریف) مامۆستایەکی موسڵاویی قوتابخانەی فەیسەڵییە بوو کە سەرکیس ئەفەندییان پێدەووت. حەمە عەلییە فەندی بروسکە یا فتوایەکی خوێندەوە کە لە بەغداوە هاتبوو، ئیعلانی جیهاد (یا غەزا)ی بەرامبەر بە ئینگلیز تێداکرابوو. خەڵکەکە هەموویان دایانە نەعرەتەی ئەڵلاهو ئەکبەر، پاشان زۆر کەس خوتبەیان خوێندەوە، لەوانە تەنیا مەلا محەمەدی چورستانی‌و باوکمم بیرماوە. لە خوتبەکەی باوکم تەنیا (لبيك.. اللهم لبيك.. م بیرماوە) پاش خوتبەدان تەپڵ‌و دەف لە پێشەوەو موتەسەریف‌و سەرۆکی دائیرەکان لەگەڵیدا کەوتنە گەڕان بە شەقامەکانی ئەوسای شاردا

بەبەردەرگی سەرادا هاتنەوە بەر مزگەوتی گەورە. کە خەڵکەکە گەیشتنەوە بەردەرگی سەرا لە بن چەتری پۆلیسدا کە لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا بوو عەبدولواحید نووری وەستابوو لەبەر خوتبەی بۆ خەڵکەکە دا. کە گەیشتنەوە بەر مزگەوتی گەورە باوکم چۆوە سەر بانەکەو بە ناوی خەڵکی سلێمانییەوە بروسکەیەکی خوێندەوە کە بۆ ڕەشید عالی نووسرابوو و وەك دەردەکەوێ ئامادەیی خەڵکی موسڵمانی تێدا نووسرابوو بۆ غەزا. چونکە وەڵامنامەیەکی ڕەشید عالی بە برووسکە لە ماڵی ئێمە هەبوو تا چوونی من بۆ سوریە (١٩٥٦) مابوو. بڵاوەی لێکرا، بەڵام شار هەر لە جموجوڵدا بوو، فوتابیانی ئامادەیی جلی زەردیان لەبەرکردبوو. تیپی فریاکەوتن (اسعاف) دروستکرابوو، جێگەیان لە مزگەوتەکانی شاردا بوو، زەنگی فوتابخانەکان برابوونە سەر مزگەوتەکان، دیارە زەنگی چەماوەی ئاسن بوو کە بە پارچە ئاسنێکی تر لێ دەدرا. ئەمە بۆ کاتی فڕۆکە هاتن یا ئینزار بوو. ئەوەی بیرم بێت فڕۆکە هەر یەکجار هاتە سەر سلێمانی، خەڵکی پەشۆکان لە شار ڕایان کرد بەرەو گردی سەیوان. فڕۆکەکە تەنیا بەیاننامەیەکی کوردیی بە ناوی عەبدولئیلاوە بڵاوکربۆوە. کە وەسیی تەختی عێراق بوو و ڕایکردبووە ئەردەن.

شەڕی ڕەشید عالی بەو جۆرە تەواو بوو کە مێژوونووسان باسیانکردووە- بەڵام لەناو ئەنجامەکانیدا دوو شتی شەخسیم لە یاد ماوە:

پاش ڕاکردن ڕەشید عالیو دامو دەستەکەی وەسیو نوری سەعید هاتنەوە. لە سلێمانی ڕقو کینەی ئینگلیزخواکان لە هەموو کەس زیاتر بەرامبەر بە باوکم بوو. وەك خۆی دەیووت، هەر ئەو ڕقەیە کە لەسەر پشتگرتنی شێخ مەحموود لە حاجی مەلا ڕەسوڵیان هەڵگرتبوو. ڕۆژێك لە کۆڵان منداڵان بانگیان کردم.. باوکتیان گرت.. بە پێی پەتی ڕامکرد بەرەو سەرا، دیم باوکم دانیشتووە، مەلا مەحموودی مامم لەسەر کورسییەك بە تەنیشتێوەیە، چەند کەسێتری لێبوو نەمناسین. باوکم بە دەنگی بەرز بە قۆمیسەرە پۆلیسەکەی

دەووت: مـــن قســـە ناکـــەم، وەڵام نادەمـــەوە تـــا موتەســـەریف (پارێزگـــار) و بەڕێوەبەری پۆلیس (مودیری پۆلیس) نەیەنە ئێرە. چونکە ئەوان کە نوێنەری حکوومـەت بـوون لەگـەڵ منـدا لـە پـێش ئـەو خەڵکـەوە دەڕۆیشـتن کـە هـاواری مردنـی ئینگلیزمـان دەکـرد، ئەگـەر ئـەوە تـاوان بووبێـت ئـەوانیش هاوبەشـن، پۆلیس منیـان کـردە دەرەوە بـە قـوڵپی گریانـەوە هاتمـەوەماڵـەوە. بـاوکم بـە کەفالەت بەربوو. بەڵام دووەم شت کە لە بیرم مابێت باوو گاڵتـە پێکـردن بـوو. ئینگلیزخواکان لە لایەکو بە داخەوە شێخ لەتیفی حەفیدیش کە داخی زەمانی برایـەتیو یـەکێتیی لـە دڵـدا بـوو زۆر لایـەنی ژیانیشـی بـە گاڵتـە گرتبـوو، خوتبەکەی باوکمیان هەڵگێڕابۆوە (لبيك اللهم لبيك.. یان کردبوو بە (غەزایەو ئەچـم، ناگەڕێمـەوە.. هتـد) ئەمـە لای بـاوکم جێـی شـانازیبوو، بـەڵام مـن بـە منداڵی زۆر پێی پەست دەبووم. وا بـزانم ئەوانـەی باوکمیانناسیبێ دەزانـن کـە ئەوە پلەی قسەی ئەو نییە. لێرەدا با گەردنی کاك ئەوشیروان مستەفاش ئـازاد بێـت کـە سـاڵی ١٩٦٧ لـە هێـرش بـۆ سـەر ئەوانـەی لـە ڕۆژنامـەی (برایـەتی)دا دەنووسن بە عیزەدینی مەلا مستەفای بەخوا هەر ئەچم ناوی بردبووم.

## یەکەم بەیاننامە

زۆر زوو لـە تەمـەنی منداڵیـدا زەنگێکـیتری کـاری سیاسـیو نهێنی دای بـە گوێمدا. هاوینی ١٩٤٤ بوو لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییەوە دەرچوو بووم بۆ پـۆلی شەشەم، ماڵی مامم (ن. ئاری) و کارەکەی لە هەڵەبجە بـوون. منـیش زۆر هـاوین مامم لە کوێ بووایە ڕوومدەکردە ئەوێ.

دیاربوو لەو سەردەمەدا دوکانەکەی کاك عەبدوڵڵای سمایلە فەندی سـەرتاش جێگـەی دانیشـتنی ئـەو خوێندەوارانـەی شـاری هەڵەبجـە بـوو کـە دەمیـان لـە کوردایـەتیو لـە سیاسـەتو شـیوعێتی دەدا یـا پێوەیـان خـەریکبوون. بەوێـدا ڕەتبووم یەکێك لە دووکانەکە هاتە دەرەوەو بانگیکردم. کاك نووریی حەمـەمین

ئاغا بوو کە ئەودەمە مامۆستای سەرەتایی بوو لە هەڵەبجە. پرسیی ئەچێتەوە ماڵەوە؟ ووتم. بەڵێ. زەرفێکی گەورەی دانەخراوی دایە دەستمو ووتی: ئەوە بدە بە مامت. لێم وەرگرت، کە سەیرێکی ناوەکەیم کرد خێرا هاتە سەرم ووتی: سەیری نەکەیت، دەرینەهێنیت. وەك برووسکەیەك بە لەشمدا هاتبێت لە شتێك گەیشتم، بە ڕاکردن چوومە ماڵەوە، لە دەرگاوە پرسیم مامم نەهاتۆتەوە، خۆم کرد بە ئاودەستداو لەوێ کەوتمە سەیرکردنی کاغەزەکان. ئەوەی لێی تێگەیشتم سەر ناوی لاپەڕەیەکی تایپ بوو. (نداء الى المثقفين العرب) پاشان ژمارەیەکی (یەکێتی تێکۆشین) بوو کە بە پەلە چاوم پێداگێڕا. چونکە نە ووتارەکانم پێدەخوێندرایەوە نە تێیان دەگەیشتم. سەیری دەنگوباسەکانم کرد هەواڵێکی فوتابخانەی هەڵەبجە سەرنجیڕاکێشام. باسی بەڕێوەبەری تاقە فوتابخانەکە بوو کە هەموو شەو بە خواردنەوەو قومارەوە شەو دەباتە سەر. لەم بڵاوکراوانە ئەوەندە فێربووم کە خەڵك هەن دژی میری کاردەکەنو بە نهێنی شت دەنووسنو چاپی دەکەنو بڵاوی دەکەنەوە. کە پاش ٣٤ ساڵ لە کتێبخانەی ڕۆژهەلاتیی لەندەن دوو ژمارەی (یەکێتیی تێکۆشین)م دی چوومەوە سەر ئەو هەواڵەو لە دڵی خۆمدا ووتم: دەبێ کام مامۆستا ڕقی لەو پیاوە باشە بووبێت کە ئەو سا بەڕێوەبەر بوو لە خواردنەوەو قوماری ئەو بەولاوە کەرەسەی تری نووسینی نەبووبێت؟ یا دەبێ ئەو سەردەمە خواردنەوەو قومار چەند کارێکی ناپەسەند بووبن کە تاوانبارکردنی کەسێك بەو دوو کارە لە پلەی مامۆستاییو پیاوی پەروەردەکردنی کەم بکاتەوە.

مامم تا کۆتایی ژیانی هەر بە کوردێکی نیشتمانپەروە دەژمێررا. وەك بزانم لە حیزبی برایەتیو یەکێتی زیاتر نەچۆتە ناو حیزبێکیترەوە، تا شۆڕشی تەمووز بیروڕای بەرامبەر بە کۆمۆنیستان چاکبوو، بەڵام پاش تەمووز گۆڕرابوو. لەو یادگارانەی شانازیی پێوە دەکرد زۆری دەگێڕایەوە، دیتنی هاوڕێ فەهد بوو، لە ڕاستیدا من وامدەزانی کەسێکیتر بەو تێگەیشتووە، بەڵام لە

ساڵانی دووای تەمووزدا چ لە بەغداو چ درەنگتر لە دەرگەڵە هاوڕێم ساڵح ڕازقی وەك ئەو باسی ئەو دیدارەی بۆ گێڕامەوە، لەبەرئەوەی شێوەی ئەو دیدارە ناوەڕۆکێکی سیاسیو بایەخداری لە ڕووی کاری هاوڕێ فەهدەوە هەیە دەبێ تۆماری بکەم. ساڵی ١٩٣٩ تا ١٩٤٢ مامم لەسەر کوردایەتی لە کوردستانەوە گوێزرایەوە بۆ دیوانیە. دەیووت: پاش گەیشتنی دیوانیە لەگەڵ چەند فەرمانبەری عەرەبدا بووین بە دۆست —وەك دەرکەوت یەکێکیان ساڵح ڕازقی بوو. شەوێك هاتبوو بەدووایداو ڕێکوڕەوان ووتبوویان هاوڕێ فەهد دەیەوێ بتبینێ- ئەمێکی دوور لە شیوعێتیو کاری نهێنیی ئەوانەوە ئەمەی زۆر لا سەیر بوو. دەیووت: لە ماڵی دکتۆر ڕەشید مەعتووق یەکترماندی، دوکتۆر مەعتووق پزیشکێکی لوبنانی بوو، سەردەمێکیش لە سلێمانی بوو. لە ساڵانی پەنجادا لەناو ئاشتیخوازانی لوبناندا دیاربوو. هاوڕێ فەهد لە سەعات زیاد باسی کوردستانو باری ژیانو بزوتنەوەی کوردی لێپرسیبوو. دەیووت: زۆر بە ووردی گوێی لێگرتمو خۆشی ڕای لە بارەی مەسەلەی کوردەوە زۆر باشبوو.

ساڵح دەیووت: لەو سەردەمەدا کورد (بە تایبەتی کوردی خوێندەوار) بە دەگمەن دەگەیشتنە عەرەبستان، کە بە هاوڕێ فەهدمان ووت کوردێکی ئاوا لێرەیە، وەك شتێکی گەورەی دەستکەوتبێت حەزیکرد بیبینێو زۆر شت لەوەوە بزانێ، کە خەڵکیتر نەیدەزانی یان پێیان نەدەووت.

تۆزێ دەچمە پێشەوەو تابلۆیەکیتری ئەم چەشنە پێوەندییانەی هاوڕێ فەهد تۆمار دەکەم.

ساڵی ١٩٥٦ کاك کەمال فوئاد (دکتۆر) لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ لای تێکۆشەری ناودار ئیسماعیل حەقی شاوەیس، کاك کەمال سڵاوی سەرکردەیی حیزبی شیوعیی گەیاندیو لە بارەی بڕیارەکانی کۆنفرانسی دووەمەوە پرسیاری لێکرد. مامۆستا شاوەیس بە درێژی لە نزیکبوونەوەی بیری ئەوسای حیزب لەگەڵ (جەمالیزم) دوواو بەراوردی ئەوەی دەکرد لەگەڵ (کەمالیزم) داو

بە جیاوازی دەزانین (جەمالیزم: نیسبەتە بۆ جەمال عەبدولناسرو کەمالیزم نیسبەتە بۆ مستەفا کەمال) مامۆستا شاوەیس لە قسەکانیدا جیاوازیی ئەم رایانەو رای کۆنفرانسی لەگەڵ رێبازی هاوڕێ فەهددا باسدەکردو هەر بە (فەهدی موعزەم- المعظم) ناوی دەهێنا. کە دووایی ئەمەم بۆ شەهید جەمال حەیدەری گێڕایەوە، ووتی: هەرچەند ئیسماعیل شاوەیس بهاتایە بەغدا هاوڕێ فەهد دەیناردین بەدوویدا دەیدی. کاک ئەنوەری مەلا حەمە ئاغاش (ئەنوەر محەمەد- کە لە شیوعیە دیارەکانی سەردەمی هاوڕێ فەهد بوو)، ئەو باسەی بۆ کردم، ئەویش دەیووت: کە هاوڕێ فەهد داوای لێبوردنی لێدەکرد کە بە هۆی باری خۆشاردنەوەوە خۆی ناچێتە ئوتێل بۆ لای.

ئەمە رەفتارێکبوو کە لەمەودوا گۆڕرا، هەندێ مەسئوولی لەمەودووا خۆشاردنەوەیان بە بیانوویەك دەزانی کە خۆیان بەسەر خەڵکدا بادەن‌و بە هۆی فیزی بزانن‌و خۆیان تەنانەت پیشانی دایك‌و باوکیشیان نەدەن.

## یەکەم پرۆتێست‌و یەکەم خۆپیشاندان

۱-رەنگە یەکەمجار نای خۆت لە رۆژنامەدا ببینێ بۆ منداڵێکی ۱۲-۱۳ ساڵی شتێکی خۆشبێ. ساڵی ۱۹٤٦ قوتابیانی ناوەندیی کۆیە لەسەر بە ناهەق دەرکردنی شەش قوتابی لە خوێندن مانیانگرتبوو، کەوتنە خۆپیشاندان، لێیانگیرا. بەڵام ساڵ ساڵی بەرزبوونەوەی هوشیاری‌و بزووتنەوەی ئازادیخوازی‌و دیموکراتیبوو. هەموو قوتابیانی عێراق یەك رۆژ مانیانگرت. واتە پاڵپشتیی رەمزیی قوتابیانی کۆیەیانکرد. لە قوتابخانە یەکی دە فلیسان لێ سەندین‌و ئیمزایەکیان پێکردین (بەوانەی نەدەترسان‌و ئیمزایانکرد)- دە فلسیش ئەو سەردەمە رەنگە بۆ زۆر قوتابیی ناوەندی رۆژانەی رۆژێکی بووبێت بروسکەی نارەزاییمان‌و ناومان لە رۆژنامەی (الوطن)ی (پارتی گەل)ی عەزیز شەریفدا بڵاوکرایەوە. بۆ ئیمزاکەران جێی شادمانی بوو، ترسنۆکەکان مۆرەیان لێدەکردین. بەڵام بەرێوەبەریی

قوتابخانە چونکە ناهەقیی دەرکردنەکەی قوتابیانی کۆیەی دەزانی، لەگەڵمان نەدووا. قوتابیانی کۆیە بەردران، گێڕرانەوە سەر خوێندن، بەڕێوەبەر گوێزرایەوە، سەرکەوتنێك بوو گەشەی بە دڵی هەمووان داو تینی دایە بەرمان بەرەو پێکەوەنانی لەوەدووای یەکێتی قوتابیان[٢٢].

٢-ڕەنگە بۆ من یەکەمجار بێت. دۆستی دێرینم، دادەوەری بەدادو نیشتمانپەروەر کە پار (١٩٩٥) بێ وادە کۆچیکرد کاك ئەحمەدی حاجی ساڵحی قاسم کە لە من گەورەتر بوو. وابزانم کە من لە پۆلی دووەم بووم، ئەو لە پۆلی پێنجەم بوو، واتە ئەو سەردەمە هاوڕێ نەبووین (وا بزانم من بچووکترین قوتابی قوتابخانەکە بووم)، لە حەوشەی قوتابخانەدا بانگی کردم، لام سەیر بوو بە چرپە گەوتە قسە: سبەینێ نومایشی وەرزشیی هەموو قوتابخانەکانی شارە (اسعتراض). پاش تەواوبوون خۆت وون مەکە. ئێمە بۆ خۆپیشاندان بۆ بەردانی بەرزانی‌یەکان دەگەڕێینەوە ناو شار ئەو کاتە (مایسی ١٩٤٧) باسی هەندێك خۆپیشاندانی بەغدامان بیستبوو. بەڵام لای خۆمان نەماندیبوو. کە پاش نومایش دەستکرا بە هاوارو (هوتاف) هەر لە سەیرانێکی خۆش، شتێك لە نومایش خۆشتر دەچوو. هەندێك ڕایان کردو خۆیان شاردەوە. سەد کەسێك زیاتر بەڕیز بەرەو شار هاتین نومایش لە دەشتی وەیس (دەشتی تەیارەخانە) بوو، (گەڕەکی عەقاریی ئێستا) تا لای سەراهاتین، زۆر ڕێکوپێك نەبوو، تاقە هاوار بۆ بەردانی بەرزانی‌یەکانبوو، چەند هاوارێکیش بە زیانی مستەفا بەرزانی بەرزبۆوەو یەکدوو جار هاواری بەردانی فەهدو هاوڕێکانی کرا. وەك دووایی بۆم دەرکەوت ڕێکخەر پارتی ڕزگاری بوو و تاکو تەرا شیوعیی یا (تەحرور) هاتبوون.

---

٢٢-تاوانی ئەو قوتابیانە ئەوە بوو داریان بە دزیی بەڕێوەبەرەوە لە ژووری دار هەڵچنینی قوتابیانەوە بردبوو سۆپای ژووری دەرسخانەیان پێ گەرم کردبوو.

گەورەترین خۆپیشاندانی شار لەو ساڵەدا لە حوزەیرانی ١٩٤٧دا بوو. من لە سلێمانی نەبووم، هاوین بوو بۆ سەردانی ماڵی مامم (نەجمەدین) چوو بوومە حەویجە (ئەوکاتە فەرمانبەری کشتوکاڵبوو لەوێ) ڕۆژێك مامم لە دائیرەکەی چەند فەرمانبەرێکی بانگکرد. منیش لەوێ دانیشتبووم ڕۆژنامەیەکی بەغدای بەدەستەوە بوو هەواڵی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرە کوردەکەی خوێندەوە، ئەوەی لە بیرمە ڕۆژنامەی بەغدا هەندێك لە دووا ووتەی سەر سێدارەیانی نووسیبوو. منیش بە دەم گریانی مامەوە دەستمکرد بە گریان. یەکێك لە فەرمانبەران کە لە عەشیرەتی عوبەیدی لای حەویجەو سەر بە ماڵی شێخ نازمی عاسی ئەلعەلی بوو زۆر بە سۆزو خەفەتبارییەوە پرسیی:

-تتصور الاكراد ينسون هذا (واتە: لات وایە کورد ئەمەی لەبیر بچێت).

مامم بە قوڵپی گریانەوە ووتی: هەرگیز لەبیرمان ناچێتو تۆڵە دەستێنین.

تا سێ ڕۆژ مامم لەوبەر (واتە بەری ناوچە یا ناحیەی حەویجە کە — مەلحەیان پێ دەووت) لە ماڵی بەڕێوەبەری ناوچە (مدیری ناحیە) دادەنیشت. زۆر لە فەرمانبەرانی کوردو عەرەبو خەڵك دەهاتن. بە بێدەنگ (لە شێوەیەکی بێدەنگی پرسەدا) دادەنیشتنو باسی ئەو کارەساتەو هەر چوار ئەفسەرەکە دەکرا.

بەڕێوەبەری ناوچە ڕەحمەتی عەبدوڵلا عەزیز بوو، کە لەمەودووا لەوە گەیشتم کە یەکێکە لە پیاوانی پەروەردەو نووسینو کوردایەتی. ئەو سێ ڕۆژە منو کوڕەکانی خۆی (ئەژادی سەداد) دادەنیشتین. کە قۆمیسەری پۆلیس دەهات بێدەنگ دەبوون.

ئەو دیمەنە تابلۆیەکی ئەوسای ژیانی خەڵكو هەستی نیشتمانپەروەریی توێژی جیاجیای کورد بوو. دەنگوباسی سلێمانی زوو گەیشت. کێچ کەوتبووە کەوڵم، زوو ماڵئاوایمکردو هاتمەوە. هاوەڵەکانم جوامێر مەجید سەلیمو محەمەد کەریم فەتحوڵلاو مستەفا ساڵح کەریم کە لەیەك پۆلدا بووینو هەر لە

پۆلی یەکەمی ناوەندیەوە هەرچوارمان سەرمان لە سیاسەت دەخورا باسی بێبەریبوونی منیان لەو خۆپیشاندانەدا دەگێڕایەوە.

ڕۆژی ١٨ی حوزەیران ناردبوویان بە دووای کەس‌و کاری (قودسی‌و خۆشناو)دا کە بچنە بەغداو پێش بە دارا کردنیاندا بیانبینن ئیتر بە گەیشتنی ئەو هەواڵە شار شڵەژابوو، لە هەموو کونجێکەوە خۆپیشاندان‌و هاواری (عەفوی عام، بۆ زابتەکان) بەرزبووبۆوەو بەرەو سەراو پاشان بەرەو ماڵی موتەسەریف چووبوون. تا نیوەشەو دەوری ماڵی موتەسەریفیاندا بوو، لە نیوە شەودا چەند کەسێك (وەك دەیانووت بە پێشڕەوی مامۆستا برایم ئەحمەد) چوبوونە ژوورەوە، تەلەفونێك یا برووسکەیەکیان بە موتەسەریف کردبوو. موتەسەریف (حەسەن تاڵەبانی) دڵنیای کردبوون کە پەیمانیدراوەتێ نەخنکێنرێن. بەڵام دەمەوبەیان لە بەغداوە تەلەفونکرابوو کە گۆڕیان بۆ هەڵکەنن وا تەرمی (قودسی‌و خۆشناو) دەگەنە سلێمانی.

محەمەد مەحموود قودسی خەڵکی سلێمانیبوو، باوکی ئەفسەری عوسمانی‌و پاشان ئەفسەری عێراقیبوو، کە خانەنشینکرا هاتەوە سلێمانی‌و دوکانی وێنەگریی دانا. باوکی لە کاتێکدا لە قودس ئەفسەر بووە، ژنێکی چەرکەسی هێناوەو نۆبەرەکەی محەممەد لە قودس لەدایکبووە. لەبەرئەوە بە قودسی ناوی دەرکردبوو. شەهید مستەفا خۆشناو خێزانەکەی (زەکیە خان) خەڵکی سلێمانیبوو، لەبەرئەوە خۆی‌و کچەکانی هاتبوونەوە سلێمانی. هەر لەبەرئەوە تەرمی ئەویش هێنرایەوە سلێمانی.

هەرچی شەهید خەیروڵڵایە برایەوە هەولێرو شەهید عیززەت عەبدولعەزیز برایەوە ئامێدی. تاقە کوڕی خۆشناو پاش شەهیدبوونی باوکی بە چەند مانگێك لەدایکبوو و ناونرا (ئازاد).

شار تەواو خرۆشابوو، چی ئوتومبیل لەبەردەستدا بوو خەڵکی سوارکرابوو بەرەو کەرکووك. خەڵکیتر بەپێ بەرەو دەشتی وەیس‌و مشیرئاوا (کە ئێستا

لەناو شاردان‌و ئەوسا شوێن چاوەڕێکردن‌و بە پیرەوە چوونبوو). هەر یەکسەر فائیق بێکەسی شاعیر سروودێکی نووسیبوو بە کۆششی خۆی ئاوازی بۆ دانرابوو و تیپی سروودی قوتابخانەکان کۆکرابوونەوەو فێری سروودەکە بووبوون لە دەشتی وەیسەوە تا سەیوان دووبارەیانکردبۆوە:

ڕۆژی گریان‌و ماتەمە

عالەم دڵی پڕ لە غەمە

بۆ جوانەمەرگانی وەتەن

لەسەر وەسیەتی خۆیان لای گۆڕی مەحموود جەودەتەوە نێژرابوون. سێ ڕۆژ لە مزگەوتی گەورە پرسە گیرابوو لە جیاتی حافزی قورئانخوێن، دەنگخۆشترین کەسانی شار (محەمەد ساڵح دیلان‌و عەبدولقادری مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا ڕەسووڵ) فاتیحایان ناوبەناو پاش خوێندنی ئەم ئایەتە دادەدا (ولاتحسبن الذين قتلوا في سبيل الله امواتا بل احياء عند ربهم يرزقون).

کاک ڕەفیق (برای قودسی) برادەرم بوو هەموو ڕۆژ دەچوومە ستۆدیۆکەی. شیعرەکانی بێکەس‌و کۆمەڵێ شیعریتری ئەو بۆنەیەی لای کۆبووبۆوە. پێکەوە کەوتینە نووسینەوەیان‌و بڵاوکردنەوەیان. من لە هەموویان نوسخەیەکم بۆ مامم‌و نوسخەیەکیم بۆ (ئەژادو سەداد)، یا باوکیان نارد.

## بەندیخانە.. دیمانەت بەخێر

یەکەمجاری چوونە بەندیخانەم لە ١٩٥١/٣/١٧دا بوو، کە لە پۆلی پێنجەمی ئامادەییدا بووم. ئەمەیان هێشتا ماوە بچمە سەر باسکردنی، بەڵام ئەم بەندیخانەیەی ئێستا لێی دەدوێم شتێکیترەو ڕەنگە جیابێت لە بەندیخانە دیتنی هەموو کەس.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٦ و سەرەتای ١٩٤٧دا بوو، مەهاباد هەژا بوو، کۆمەڵەی (ژ. ک) بەرەو حیزبی دیموکراتیی کوردستان بوون‌و ئاڵای موقەددەسی کۆماری

کوردستان هەڵکردن دەچوو. لە هەڵەبجەوە هەواڵی گرتنی مامم (ئەحمەدین) هات. باوکم بە پەلە پرووزێ خۆی گەیاندە هەڵەبجە. لە رێگە ئوتومبیلیان خراپ بووبوو لەناو بەفردا مابۆوە. پاش چەند رۆژێ هاتەوە. ئەوەی دەیگێڕایەوە ئەوە بوو بۆ پشتگیریی مەهاباد چەند جموجووڵ لەو ناوچانەدا کرابوو. لە بەیاننامە بڵاوکردنەوەو تەقە لە مەفخەری پۆلیسی دەوروبەری هەڵەبجە کردن.

حکوومەتیش کۆمەڵێ مامۆستای قوتابخانەکانی گرتووەو لە فەرمانبەرانیش تەنیا مامم گیراوە. پاش چەند رۆژێك هەموویان هێنان بۆ سلێمانی. من بە پەلە خۆم گەیاندە بەندیخانە بۆ دیتنیان. لە سەرەتاوە لە گرتووخانەی پشت سەرا (مەوقیف) بوون. کە زۆر لەبەر پەنجەرەکەدا وەستام، یەکێك لە گیراوەکان بە چاوەشی پۆلیسەکەی ووت: ئەو منداڵە چییە، با لەبەر پەنجەرەکەدا نەوەستێت بێتە ژوورەوە بۆ لامان. ئەخێر چاوەش قسەکەو کارەکەی لا سەیر بو دەرگای بۆ کردمەوەو چوومە ژوورەوە چەند سەعاتێك لەگەڵیاندا بووم، لە هەندێك قسە دەگەیشتم لە هەندێك نا، هۆش‌و تێگەیشتنی سیاسی بەرەو ژوور دەچوو. دووایی بردیاننە بەندیخانەی سەرەوە، کە تا ئێستا هەر بەندیخانەیە. منیش بوو بە پیشەی هەموو رۆژەم. لە ماڵەوە خواردنیان دەدامێ، دەمبرد بۆیان‌و خۆشم دەچوومە ژوورەوە، ئەوان دڵیان بەو منداڵە زرت‌و زیتە خۆش دەبوو کە کەمێك لە سیاسەت دەگەیشت، منیش شت فێردەبووم. لەناو مامۆستا گیراوەکاندا شێخ مەحەمەد ئەمینی بابەشێخ (کاردۆخی) و شێخ سەفائەدینی برای‌و هاوڕێی خۆشەویستی لەمەو دووام کەمال مەحموود فەرەجم لەبیرە، کە برانە بەندیخانەی سەرەوە رەئووف یەحیاو فایەقی مەحموود ئەفەندی (برای قودسیی شەهید)یان لەگەڵ بوو. کە ئەوانیش هەر لەسەر نیشتمانپەروەری گیرابوون. بە رۆژ دەیانبردن بۆ دادگا، بۆ موحاکەمەکردن. بە شێوەی ئیداری موحاکەمە

دەكران. موتەسەریف خۆی (مارف جیاووك) موحاكەمەی دەكردن. شایەتی خۆیان لەناوچەكەو لە پۆلیسەوە بۆ هێنابوون، شێخ محەمەدی شێخ حیسامەدینی تەوێڵەیشیان بۆ شایەتی بانگ كردبوو. هەموو تەنانەت خزمەكانی خۆیشی (شێخی كاردۆخیو شێخی سەفادینو شێخ تایبو شێخ عابید) لە شایەتیيەكەی بێتاقەت بوون.

پاش دادگاكە دەهاتنەوە بەندیخانە من ئەچوومە لایان ڕەووف یەحیا نیو سەعاتێك دەچووە ژوورەوەو ئەوسا دەهاتە هەیوانی بەندیخانەكە (یا بەرحەوشەكە) و دەیووت: فلیمی ئەمڕۆمان شتەوە. بە چەند دەنگی جیاواز ڕووداوی ئەو ڕۆژەی دادگای دەگێڕایەوە. بە تایبەتی باش لاسایی جیاووكو حەسەن ئەفەندیی- موعاونو نوێنەری پۆلیسی دەكردەوە. ئەوە یەكەمجار بوو كاری ئەو هونەرمەندە هەڵكەوتووە ببینم.

وەك ووتم: گرتنی ڕەووفو فایەق لەسەر مەسەلەیتری نیشتمانپەروەریبوو. پۆلیسەكان لەبەردەرگا باسی كاك فایەقیان دەكردو دەیانووت: ئەرێ بابە كوڕی مەحموود ئەفەندی عەردیان هەیە، موڵكیان هەیە، گەنمو جۆو برنجیان هەیە، چی؟ بەیاننامە بڵاودەكاتەوە باسی زوڵمی حكومەتو ئاغا دەكات لە فەللاح؟

دووایی هەموویان بە زامنی (كەفالەت)ی شەخسیو كەفیلی كەسێكیتر كە هیچ كارێك نەكەن زیان بە ئاسایش بدات (كە لەو سەردەمەدا باو بوو) بەردان. بەڵام مامم بڕیارێكیتری بۆ خرایە سەر كە دیسان گواستنەوە بوو بۆ دیوانیە، هۆكەش وەك لە گێڕانەوەی كاك ڕەووف یەحیادا دیاربوو ئەوەبوو موتەسەریف لێی پرسیبوو: دەڵێن لە شایی ماڵی حامید بەگی جافدا تۆ لە حاكمی بەریتانی چوویتە پێشەوە، بەیداخێكی بچوكی كوردستانت پێبووە (ئەودەمە بەیداخەكەی خۆیبوون لە سووریەو لوبنانەوە لەسەر ئاسن دەهات، خەڵك دەیانكرد بە یەخەیانەوە) بە حاكمەكەت ووتوە: میستەر شۆتەر، ئەمە

بەیداخی کوردستانە، ئەگەر ئێوە بۆمان هەڵناکەن، رووس بۆمان هەڵدەکات[٢٢].

مامم سەرەتا ئینکاری کردبوو، دووایی موتەسەریف پێی ووتبوو یەک سوێند دەدەم، بڵێ: بە سەری تۆ ئەمەم نەکردووە. مامم ووتبووی بەسەری جیاووک بە درۆ سوێند ناخۆم، کاک رەووف لە گێرانەوەکەیدا دەیووت: بەڵێ جیاووک قوتبی کوردایەتی‌یە، (بە پێکەنینەوە) نابێ بە درۆ سوێند بەسەری بخورێت. بۆ سبەینێ لە قوتابخانە جوامێری مارف جیاووک لە زمان باوکی‌یەوە ئەمەی دەگێرایەوە. دیارە باوکی زۆری پێخۆشبووبوو بەڵام بێسوود:

## نەورۆزەکان

نەورۆز لە لای هەر میللەتە لە میللەتەکانی رۆژهەڵات مێژوویی‌یەکی تایبەتیی هەیە، سیمای گشتیی یەک‌و سیمای تایبەتی جیا. چەند جار لەسەر ئەو مێژووەم نووسیوە لای کورد. وەک هەموو لایەنەکانی کوردایەتی هەر لە شیعرەوە هەڵوقڵاوە (مەلای جزیری، خانی، پیرەمێرد، گۆران.. هتد) هەرچی جەژن کردن‌و ئاهەنگ گێرانە لای گەلانیترو کورد، ئەوەش مێژووی خۆی‌و گۆرینی خۆی هەیە.

ئێمە بەر سەردەمی ئاهەنگ گێران‌و بەرەوپێشبردنی نەورۆز بۆ پلەی ئاهەنگی نەتەوەیی‌و رەمزی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد کەوتین کە داهێنەرو رابەرەکەی پیرەمێرد بوو.

---

٢٢-لە قسەی خۆشی سلێمانیدا دەگێرنەوە کە رەحمەتی عیزەت تۆپچی (عیزەتی فاتەی خولە درێژ) کە ئەفسەرێکی کورد پەروەری قسە خۆشی (باوک عەرەب بوو) لە سوپای عوسمانی‌و سوپای شێخ مەحمووددو پاشان سوپای عێراقدا عەقید بوو. لەو ئاهەنگەدا هاوار دەکات: کورد نەبێ بە بۆلشویک، بە شیوعی رزگاری نابێت، کە ئاور دەداتەوە شۆتەر لە پشتی‌یەوە وەستاوەو مۆر دەبێتەوە، ئەمیش بێ پەراو دەڵێ: بەشەرتێ ئینگلیز رازی بێ.

ساڵی ١٩٤٥ و ئاهەنگی سەرکارێزی وەستا شەریف- پەنا گردی مامەیارەو شیعری ٢٧ ساڵەی بێکەس (لە ڕووی ئەدمۆنسی چەپەڵ‌و دوژمنی کورد)دا، یا گۆران ووتەنی (لە ڕووی شیری ڕووتدا)، دەنگی دایەوە. ئێمە لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییدا بووین، بەر تیپی سروود نەکەوتبووم، لەبەرئەوە نەگەیشتمە ئەو خێوەتەی بێکەس شیعرەکانی تێدا خوێندبۆوە. بەلام هاوپۆلمان کاك فەرەیدوون عەلی ئەمین بۆ سبەینێ هەمووی بۆ گێڕاینەوە. ئەوەشی دەووت کە ئەدمۆنس شەو تا درەنگ بە موتەسەریفی ووتووە (کە مارف جیاووك) بوو- ئای فایەقە چوێر چیی پێکردم. درەنگ ئەوەمانزانی کە بێکەس ئامۆزای باوکی فەرەیدوون بوو.

-نەورۆزی ١٩٤٦ قوتابیی پۆلی یەکەمی ناوەندی بووین. عەسری ڕۆژی ٢٠ی مانگ لە هۆڵی قوتابخانەکەمان کە لە سەرووی شار لای خەستەخانەوە بوو (دوایی بوو بە سەرەتایی غازی، پاشان شێخ مەحموود) ئاهەنگی نەورۆز گێڕرا. لە قوتابیان عومەر کەریم عەزیز، محەمەد ئەحمەد تەها (کامەران موکری) ئاهەنگیان بە سۆزەوە دەبرد بەڕێوە. بە جووتەش پارچەی (ئەولادی وەتەن)ی حەمدییان لە شێوەی دیالۆگدا پێشکەش کرد. لەو ئاهەنگەدا بێکەس بە گەرمی هاواری کرد:

بەهار نامەوێت جوانیت ببینم

ئەمرۆ من بە دڵ پەستو غەمگینم

دوژمنی لالەو گوڵ‌و نەسرینم

کە ئەو لە شیعرەکانی بۆوە (أ. ب. هەوری) پارچەی (خۆت هەڵتەکێنە گرانە کۆڵت)ی خوێندەوە لە قوتابیان تەنیا ووتارێکی کاك عەزیز عەبدوڵلا (دادوەر)م لە بیرە. دووا کەس ڕێگەیاندام، یەکەمجار بوو ڕووبەڕووی خەڵکانێکی ئاوا بکەومە گوتار. پارچەیەکی شێخ سەلام‌و پارچەیەکی مامم (ن. ئاری)م خوێندەوە کە خۆی پێی لەبەر کردبووم‌و بە شێوەکەی ڕەمزی نەفەندی ئەمخوێندەوە:

بۆ سەرلووتکەی شاخ، بۆ سەر لووتکەی شاخ

لەسەر لووتکەی بەرزی شاخ

هەڵئەکەین بەزۆر بەیداخ

ئەوەندە بچووك بووم مێزەکە لە من بەرزتر بوو، هەر دەستپێکرد کاك عومەر هەڵیگرتمەو خستمیە سەر مێزەکە، کە لێبوومەوە پیرەمێرد هەستا، لەبەرئەوەی دەموپلی قسەکردنی نەبوو زۆر کەم لەم کۆڕە گەورانەدا قسەی دەکرد یا شیعری دەخوێندەوە، لەو کۆڕەدا پەنجەی بۆ من درێژکردوو ووتی: (کورگەل با من بمرم، پیرەمێرد بمرێ، من کە منداڵێکی وا بچوکی کوردم دی وا بە خوێنگەرمی هاواری کوردو کوردستان دەکات باکم نی‌یە با بمرم).

ئاهەنگ براپەوە بە شەو بە پێی بەرنامەی پێشوو هەر قوتابی‌یەی شاپڵیتەیەکی ئامادە کردبوو. ئاگردران‌و چووینە سەر شەقامەکانی شار، بە دەم گۆرانی‌و سروودەوەو هەندێ دروشمیش بەرز دەکرایەوە. نازانم لە خۆوە بوو یا ڕێکخراو بوو، چەند جار دەووترایەوە:

بژی کوردو کوردستان، بژی عەشرەتی بەرزان

بێگومان من هێشتا نەگەیشتبوومە ئەوەی ئاگاداربم، بەڵام دیاربوو ڕێکخەری هەموو ئەم ئاهەنگ‌و خۆپیشاندانە ئەو حیزبە نهێنی‌یانە بوون کە لە مەیداندا بوون (ڕزگاری‌و لقی ژ. ك) ئەمجارە بەشداریی شیوعی لەبەرچاو نەبوو (کاك عومەر ئەو سەردەمە لە ڕزگاری بوو، پاشان تا ١٩٤٩ لێپرسراوی قوتابیانی پارتی بووە ١٩٥٠ بوو بە شیوعی).

بۆ سبەینێ لە حەوشەی قوتابخانەدا کۆیانکردینەوە. موتەسەریف (مارف جیاووك) هات، زۆر لە خۆپیشاندانەکە تووڕە بوو، خوتبەیەکی دا، کوردی‌یەکەی لای ئێمە سەیر بوو. دەیپرسی: ئەوانەی دەڵێن بژی بارازان، بۆچی خۆیان نەچوون لە بارازان، نەماندەزانی لەگەڵ کێیەتی، هەندێك قوتابی دەیانووت لەگەڵ تۆفیق قەزازێتی، بەڵام خوا هەڵناگرێ ووتەیەکی خراپی بە کورد یا بەرزان نەووت.

قسەکانی پیرەمێرد تا ماوەیەکی درێژ وەك مەدالیایەك وابوو بەرەو زۆر لایەنی کوردایەتیی دەبردم.

## نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧

جارێك هاورێم کان فەرمیدوون عەلی ئەمین لە باسی ئەوەدا کە لە کتێبێکدا نەورۆزی یەکەی پیرەمێردم بە ئەنجامی راپەرینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ی گەلی عێراق دانابوو، نووسیبووی ئەوە ئەنجامی بەداراکردنی ئەو چوار ئەفسەرە کوردەیە (عیزەت، خەیروڵڵا، قودسی، خۆشناو) پیرەمێرد ئەو ساڵە نەورۆزی نەکرد. بەڵام لە راستیدا ئەو ساڵە پیرەمێرد لە سەر دابی خۆی لە کارێزی وەستا شەریف نەورۆزی خۆی کردو چوار ئەفسەرەکەش لە پاش نەورۆزی ئەو ساڵە لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧دا بە دارا کران. ئەگەر پیرەمێرد غەمگینیش بێت ئەوە بۆ تێکچوونی کۆماری کوردستان بوو:

لە هەر سێ لاوە شایییە بەرپێزە
خەنەبەندانمان خوێنی ئازیزە

بەڵگەی من وەك لە باسی نەورۆزی ١٩٤٨دا دێت زۆرن‌و ئەم دێرانەش باس لە سەرکەوتن دەکەن‌و لە نشوستی نادوێن‌و ئیشارەت بۆ (سنگی کچان) هەر باسە لەو کچەی لەسەر پردی بەغدا درێ بە دوژمن‌و گوللەبارانی دا.

چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێ پەستبوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکانبوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار

................

تا ئێستا رووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا

(تاکو پاریش) ئیشی زیرەکانەی پیرەمێردە، کە کانوونی دووەمی ١٩٤٨ بۆ کورد ساڵی پارە، چونکە ساڵی کورد لە نەورۆزدا دەستپێدەکات.

هەرچی ئەو نەورۆزەی ١٩٤٧ه و من بیرم دێت ئەوەیە کە بە دزیەوە پێیان ووتین رووبکەینە سەر گردی مامەیارە. لەوێ دەیان قوتابی کۆبووینەوە. ئەمجارە دیاربوو شیوعیەکان رێکخەربوون. چونکە کردنەوەو گێرانی ئاهەنگ بە کاك عومەر عارف (قاپ رەش)[٢٤] سپێردرابوو، کاك ئەکرەم یامولکیو کاك مستەفات ئەمین** رۆلی دیاریان بوو. تەنانەت کاك مستەفا بە هەموو خوتبەدەرانی دەووت: باسی ئیستعمارتان لەبیر نەچێت. لە خوتبەدەرانی تر شێخ سەعیدی بۆسکانی (ئەندازیار)م بیرە، مەدهۆشی شاعیر یەکێك لە پارچە سیاسیەکانیی خوێندەوە کە لە گەلاوێژدا بێ ئەو نیوە دێرەی تا نووتە لە مارف جیاووك (میرم سەرۆکی یانەیە) بلاوکراوەتەوە. دووایی تێگەیشتم کەئەم ئاهەنگە شیوعیو لقی (ژ. ك) رێکیانخستبوو. رزگاری بەشدار نەبوون. کاك عومەر عارف کۆتایی ئاهەنگی بە دروشمی (بژی پرۆلیتاریای عالەمی) هێنا.

کە پێیان ووتم: ئاهەنگی نەورۆزەو وەرە مەدالیای یادی پیرەمێردم هەر لە دلدا بوو. خۆم بە پێگەیشتووتر دەزانی لەبەرئەوە بەیانی تا عەسر خۆم خەریك کرد. گوایە شیعر دەنووسم. شتێکی مندالانەی ساکارم رێکخست، لە راستیدا بەوەی باشە لە بیرم نەماوە چ بوو، بەلام دەزانم کە کێشو قافیەی رێکبوو، ناوێکی بەرزانیشی تێدا هاتبوو. بەوەشی باش بوو بە هاندانی کاکی یامولکی ئەوەندەیان چەپلە بۆ لێدام کە کەسیش بە باشی گوێی لەو شیعرە سادانە نەبوو. بە هەموو حالێك، بەرهەمو زاتی مندالێکی ١٢-١٣ سالانە بو، بەلام بەلگەی پەرەسەندنو فراوانبوونەوەی بزووتنەوەی نیشتمانی بوو.

---

٢٤-کاك عومەری تێکۆشەر، قسە خۆش، مامۆستایەکی سەرکەوتوو بوو، ژیانێکی مەردانەی بردە سەر. باوکی عارف عورفی شاعیرێکی باشبوو لە مندالیەوە ئەنکی (قاپ رەش) یا قاپو قول رەشی ناو نابوو. ئەم ناوە هەر مایەوەو بەوە دەناسرایەوە.

**ئێستاکە بە هەلەی چاپدا دەچمەوە (١٩٩٩/٨/٢٩) کاك مستەفا هەفتەیەکە کۆچی دووایی کردووە. بە داخەوە ئەم دێرانەشی نەدی.

## نەورۆزی ١٩٤٨

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە

جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشیو بەهاتەوە

بەم سرووده محەمەد ساڵح دیلان (نەمر بێت) ئاهەنگی نەورۆزی لە بناری گۆیژە لە دەشتی تووی مەلیك (ئێستا گەڕەکە) کردەوە. بەهارێکی خۆشبوو، وولات لە گەشەی سەرکەوتنی هەڵمەت (وثبة)دا بوو، هەندێ ڕۆژنامەی ئازاد دەرچوبون، ئەو گەشی ئازادییە بوو کە لە شوێنیتردا باسدەکرێت. ئەم شیعرانە پیرەمێرد نووسیبوونی. کاك محەمەد ساڵح خۆی ئاوازی بۆ دانابوو. بە دەنگە خۆشەکەی خۆی، کە ئەگەر خۆشترین دەنگیش نەبێت، یەکێکە لە دەنگە هەرە خۆشەکانی کورد دەیووت: پیرەمێرد چۆن ئەو شیعرانەی نووسیبوو، ئەوە دەبێ مامۆستا برایم ئەحمەد لە یادداشتی خۆیدا بیگێڕێتەوە.

بەڵام ئەوەی من لە بیرمە ئەو ساڵە حیزبەکان ئاهەنگی نەورۆزیان لەناو بەرنامەی چالاکیی سیاسی خۆیاندا گرتبووە ئەستۆو ئیتر پیرەمێرد نەورۆزی نەکرد. لە لایەکەوە لە ڕۆژنامەی (ژین)دا نووسیی (ئەم ساڵ لە سایەی حیزبی حیزبابەوە نەورۆزەکەشمان نەکرد) لە لایەکیترەوە ئەم شیعرانەی نووسیو دابووی بە مامۆستا برایم ئەحمەد کە لە نەورۆزی پارتیدا بخوێندرێتەوە.

حیزبی شیوعی ئاهەنگی نەورۆزیان لە حەوشەی قوتابخانەی ناوەندیی کۆندا کرد (کە بووبوو بە قوتابخانەی غازی) لەبەردەرگا پاسەوانیان دانابوو تا نەیەڵن سەر بزێوو دروشم دەر (هوتاف کێش)ە بزوێوەکانی پارتی بکەنە ژوورەوە، منیش ئەو سەردەمە بە یەکێك لەوانە ژمێردرابووم، لەبەردەگا دۆستی شیرینی لەمەو دووام کاك غەفووری مەلا تایەر ڕێگەی چوونە ژوورەوەی لێگرتم، منیش ئیتر چەندیان هاوارکرد نەچوومە ژوورەوە.

بەم چەشنە لەم ئاهەنگەدا نەبووم کە بە ناوی (شیوعی یا تەحرور)ەوە کرا.

هەرچی ئاهەنگی پارتی دیموکراتی کورد بوو. ئەوە هەر لە ڕۆژی نەورۆزدا، لە ڕۆژی ئاهەنگەکانی جارانی پیرەمێردا لە تووی مەلیك کرا.

منو هاوڕێی ژیانم کاك محەمەد کەریم فەتحوڵڵا (ئەبو سامان) ئەودەمە چووبووینە پارتییەوە. لە پۆلی یەکەمی ناوەندییەوە، پێکەوە بووین لە خوتبەدانی لیژنەکانی قوتابخانەداو پاشان لە خۆپیشاندانەکانی هەڵمەت (وثبة) و لەوە دووا خووتبەی بۆ نووسراومان دەخوێندەوە داوا لە هەردووکمان کرا شتێك ئامادە بکەین کاکمە حەمە شیعرێکی دەخوێندەوە نازانم کێ نووسیبووی:

دەچمە بەرمەیدانی دوژمن یا حەڵاڵ کات گەردنم

نامەوێ ئەم ژینە تاڵە، یا وەتەن یا مردنم

پارچە شیعرێکی بۆ من پەیداکرد، بە پێشەکییەکی دەسکاری خۆمەوە دابووم بە لیژنەی ئاهەنگ.

لەبەرئەوە لە هەولێر شێخەکانی تەریقەت ئاهەنگی نەورۆزیان بە ناوی جەژنی مەجووسەوە قەدەغە کردبوو. لێرە مەلایەکیان هێنا، یەکەم ووتار ئەو خوێندییەوە. ئەویش ئەندامی پارتی شێخ ڕەووف شێخ سەعیدی تەکیە بوو. ووتارە سیاسییەکە کە دیار بوو ڕای ڕەسمیی پارتی بوو لە لایەن دیارترین خەتیبی ئەو سەردەمەوە محەمەد ئەحمەد تەها (کامەران موکری)یەوە خوێندرایەوە. کاك تەها بابان (پارێزەر) منداڵبوو -یا بڵێم لە ئێمە منداڵترو قوتابیی سەرەتایی بوو ووتاری یەك سەعاتیی لەبەردەکردو لەم بۆنەو ئەو بۆنەدا پێشکەشی دەکرد. ئەویش ووتاری خۆی لەبەر خوێندەوە. لەپڕ بوو بە ئاژاوە. گۆڕەپان تێکچوو. شیوعییەکان کاری خۆیان بەو جۆرە ڕێکخستبوو. بەڵام کە هاتبوون بۆ ئەم ئاهەنگەی پارتی. ڕەحمەتی تەهای شێخ جەلال (سەید تەها) کە لە تێکۆشەرانی حیزبی شیوعیو خەتیبە دیارەکانی شار بوو، هەستابوو هوتاف کێشابوو. دایاننابۆوە، ئیتر قسەیەك لەمانو یەکێك لەوان، تا

گۆڕەپانەکە هێمن کرایەوە کات بەسەر چووبوو، شیوعی کشانەوەو ئاهەنگیان بەجێهێشت. مامۆستا برایم ئەحمەد خۆی سەرپەرشتی دەکرد. بە بەندەکانی بەرنامەدا چۆوە، زۆربەی لادا. لەوانە بەشەکەی من بوو. لەو یادگارە خۆشانەی لە بیرناچێتەوە ئەوەبوو ووتاری کاك عوسمان دانش بەر لادانەکەی مامۆستای برایم کەوت (ئەودەمە دانش لە —ژ. ك-ەوە چووبووە ناو پارتی‌و هێشتا نەبووبوو بە شیوعی)، لەگەڵ مامۆستا برایمدا کردی بە هەڵا، دەیووت: من شەونخونیم بەسەریەوە چەشتووە. لەبەر قوتیلەی نەوت نووسیبوومەوە. ئەم قسانە سوودیان نەبوو. ئێمە زۆرمان لا سەیر بوو کە پیاوێکی گەورەو بە دیمەنی وەك دانش بە قوڵپی گریانەوە بەرەو شار ببێتەوە.

کە گزنگێکی ئازادی یا دیموکراتیەت لە کلاوڕۆژنەی وولاتدا دیار دەبوو، ئاهەنگی نەورۆز بە ئاشکرا دەکرا، لە ساڵانی زەبروزەنگی سەختیشدا گڕی نەورۆز خۆی دەشاردەوە، ئەوە بوو لە ١٩٤٨ەوە بۆ ١٩٥٤ ئاهەنگ نەما، پیرەمێرد مردبوو، حیزبەکانیش دەبوو زۆر لە خۆشاردنەوەدا وریابن. ساڵی ١٩٥٤ کە (ئاگری شینی ئیرهابی، عورف —هەردی وەتەنی-) کەمێك ڕەوێوە، بزووتنەوەی ئاشتی سەری هەڵداو پتەو بوو، هەر لە تووی مەلیك پارتی‌و شیوعی بە ناوی ئاشتیخوازانەوە ئاهەنگیان پێکەوە گێڕابوو، مامۆستا گۆران بەشداربوو. دیلان ئەمجارە داستانە شیعری (کوندە بەبووی شەڕ)ی خوێندبۆوە. بە داخەوە لە سلێمانی نەبووم‌و هەر ئەوەندەش ئاگاداربووم.

ئاهەنگی نەورۆزو بیرەوەری جارێکیتر لە ساڵی ١٩٥٩ و هۆڵی کۆلێجی زانیاریی بەغداو ئامادەبوونی زەعیم عەبدولکەریم قاسم‌و دەرچوون لە پەیمانی بەغدا دێتە ناو مەیدانی ئەم بیرەوەریانەوە، کە ئەودەمە لە پلەیەکی بەرزووورترو ڕۆڵێکی دیارترەوە بەشداربووم.

# نەورۆزی ١٩٥٩

کوردە نەورۆزە، نەورۆزی ئەمساڵمان ئێجگارە بە سۆزە، بەمجۆرە ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٥٩م دەستپێکرد، بەڕێوەبەری ئاهەنگ یا عەرەب ووتەنی (عەریفی حەفلە) و فارس وتەنی (مجری) بووم. بە راستی ئەوە خۆشترین نەورۆز بوو تا ئێستا لە ژیاندا دیبێتم. هەر لەبەر ئەوە نا، کە ئەو عەبدولکەریم قاسمە خۆشەویستەی ئەوسا یەکەمجار بوو خۆی بێتە ئاهەنگەکەوەو تا دووایی دانیشێت، بەڵکو ئەوەی دەیگێڕمەوەو ئەو سەرنجانەی پیشانیاندەدەم ئەو راستییە دەردەخەن.

یەکەمجار بوو کورد لە عێراقدا لەژێر باڵی حکوومەتێکی عێراقیدا (حکوومەتی کوردی شێخ مەحموود نا) جۆرە سەربەستییەك ببینێ پاشان لەگەڵ کەمێك وورتە وورتی نێوان پارتیو شیوعیدا، دەمێك بوو کورد ئەوەندە یەکگرتوو نەبوو، ئەوسا هەر یەکسەر پاش شکاندنی پیلانی شەواف بوو کە کورد زۆر لە سەرکەوتنی دەترسا.

دیارە لە کوردستان، لە هەموو کونجێکدا ئاهەنگی نەورۆز گێڕابوو، بەڵام ئاهەنگی سەرەکی ئەمەی بەغدا بوو.

ڕۆژی نەورۆز هەرچی کوردێ هەیە بە فەیلیو بەغدایی‌و قوتابیی زانستگاو سەدان میوانی شارەکانەوە لە بەردەم یانەی سەرکەوتن‌و کۆڵانەکانی دەوروپشتیدا کۆبوونەوە. هەرچی ئوتومبێلی خۆی هەبوو هێنابووی‌و سیخناخی کردبوو. بۆ ئەوانیتریش چەند لۆریمان گرتبوو. لە پشتی لۆری یەکەمدا شوێنێکی بەرز دروستکرابوو، کاك حەیدەری دەنگخۆش لە هەولێرەوە هاتبوو میکرۆفۆنی بۆ دانرابوو بەناو هەموو شەقامەکانی بەغدادا، بەناو چەپڵە ڕێزانی خەڵکدا. زەردو سوور سووراپنەوە. هەموو بە کچ‌و کوڕەوە جلی کوردیمان لەبەر کردبوو. ڕۆژێکبوو لە ڕۆژەکانی ژیان‌و یەکگرتوویی‌و یەکدڵیی

کورد. خۆشەویستی جەماوەری عەرەب و شاییان لەگەڵ کورددا، دڵخۆشبوون بەو ئازادییەو ئاهەنگی خوتبەدان، یا کۆڕگرتن بە هۆی باری وڵات و یاخیبوونی شەواف ەوە لە مووسڵ، تا کپ کردنەوەی ئەو یاخیبونەو کوشتنی شەواف خۆی دوواخراو کەوتە ئێوارەی ٢٤ی ئازار.

ئاهەنگ لیژنەی هاوکاریی پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان و حیزبی شیوعیی عێراق ڕێکیانخست. بەڵام زۆربەی ئەرکی کارەکەی ڕۆژی نەورۆزو ئاهەنگەکەش خرابووە ئەستۆی ئێمە –لیژنەی قوتابیان لە یانەی سەرکەوتن.

هۆڵی کۆلێجی زانیاریمان لە هەموو شوێنێ بە باشتر زانی دەرگای کۆلیج و هۆڵ و ڕێگای ئەعزەمییەمان بە دروشمی نەورۆزو دروشمە سیاسییەکانی ئەوکاتە ڕازاندبۆوە.

بەشێکی زۆر لە بلیت یا کارتی بانگکردن باربۆی لە دەوڵەمەندەکانی بەغدا پێ وەردەگیرا. زۆریشی درا بە حیزبەکان و ڕێکخراوەکان و هەموو کاربەدەستان و باڵیۆزەکانی وولاتان بانگ کرابوون.

دکتۆر کەمال مەزهەر کە ئەو دەمە پێکەوە لە پۆلی چوارەمی کۆلێجی پەروەردە بووین ڕیپۆرتاژێکی گەورەی لە بارەی ئەو ئاهەنگەوە لە گۆڤاری هیوادا بڵاوکردەوەو هەر لەو کاتەوە هەست و سۆزی برایی و خۆشەویستی بەرامبەر منیش جووڵاندبوو ئاوڕێکی لە چالاکیی ناو ئەو ئاهەنگەم دابۆوە. نامەوێ ئەم یادداشتە وێنەی ئەو ڕیپۆرتاژە بێت کە ئێستا لە بەردەممدا نییە. بەڵام دەمەوێ هەندێك تێبینی دەرخەم کە لە دووتوێی ئەو ڕیپۆرتاژەدا ئەوسا نەدەنووسران.

وتەی بەخێرهاتن دکتۆر سدیق ئەترووشی کە دۆستی هەموو لایەکبوو خوێندییەوە. دوایی ووتاری ئەفسەرە ئازادەکانی کورد عەقید فەتاح شاڵی پێشکەشی کردو نۆرە هاتە سەر پارتی دیموکراتی کوردستان سکرتێری ئەو سەردەمە مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا قسەیکرد. ئەوسا شەهید جەمال حەیدەری

ووتاری حیزبی شیوعی خوێندەوە. من هەریەك لەمانەم بە پێشەکی‌یەکی ڕازاوەوە پێشکەش کرد. پاش ئەمە دەنگی دەنگۆخۆشان‌و ئاوازی بڵندی سرودو گۆرانیی کوردی‌و عەرەبی بوو. دووا شت‌و وتاری لەبەری زەعیم عەبدولکەریم قاسم بوو.

یەکەمجار بوو پاش شۆڕش زەعیم تا دوواییو ماوەی چەند سەعات لە ئاهەنگێکدا دانیشێ.

ڕاسپێررابووم ڕیپۆرتاژێك لە بارەی ئاهەنگەکەوە بۆ ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب)ی حیزبی شیوعی بنووسم. هەر شەو درەنگ نووسیم‌و بەیانی زوو گەیاندمە ڕۆژنامە. ئەو ڕۆژنامەیەی کارم تێدا دەکرد -الاهالی- گلەییان لێکردم کە هیچم بۆ نەنووسیون، ناچار خدوری خدوری کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی حیزبی دیموکراتیی نیشتمانی‌و لە سەرپەرشتکارانی ڕۆژنامەکە خۆی ڕیپۆرتاژی نووسیبوو بیانووی من ئەوە بوو کە ڕانەسپێرراوم.

لەپاڵ ڕیپۆرتاژدا شەهید جەمال حەیدەری تێبینیی خۆم (انطباع)ی لێ پرسیم. من کە لەسەر شانۆوە سەیری دەموچاوو ڕەفتاری عەبدولکەریم قاسمم دەکرد ئەم تێبینی‌یانەم دا بە دەستەوە:

-کە مامۆستا هەمزە باسی ئەوەی دەکرد چۆن کورد لە چیاوە هاتنە خوارەوەو دەوری مووسڵیان گرت‌و بەشداری دامرکاندنەوەی بزووتنەوەی عەبدولوەهاب شەواف بوون، تەواو زەعیم عەبدولکەریم کە ئینفیعال زوو بە دەموچاویەوە دیاری دەدا، لەوە دەچوو کە کەوتبێتە بەر منەتی کەسێك کە نەیدەویست منەتی هەڵگرێ.

-کە کاك جەمال حەیدەری داوای مافی بەڕێوەبەری‌و ڕووناکبیری کوردی کرد کە (ببێتە سەرەتایەك بۆ ئەوەی کورد هەموو مافی نەتەوەیی خۆی دەستکەوێت)، هەرەك خەڵکەکەی لە خەوی خۆشی‌و بێداری ڕاستکردەوەو وەك شتێك هەبێت لە بیریان چووبێت‌و دەمێکە لە خۆشیی ئازادیی چەپڵەلێدان

باسی ناکەن، زەعیم عەبدولکەریمیش هەر ئەوە بە ڕوخساریەوە دیاربوو و ڕاچڵەکی.

-بە کاك جەمالم ووت: عەبدولکەریم قاسم کوردی فەیلیە. پرسی چۆن، ووتم: چیم ووتارو گۆرانیو هەڵپەڕکێ پێشکەکرد هیچیان ئەوەندەی هەڵپەڕکێی کوردی فەیلیو جلو بەرگو دەهۆڵ زوڕنای لوڕستان نەیهەژاند. هەرکە ووتم: (کۆنترین خەڵكو نیشتەجێی بەغدا کە تا ئێستا هەر لە بەغدانو ماون، قارەمانانی ڕاپەڕینەکان، شۆڕەسوارانی ڕاپەڕینی تشرینی دووەمی ١٩٥٢- کوردی فەیلی)، ئیتر عەبدولکەریم قاسم دەستو پێی دەدا بە یەکداو تا ئەو هەڵپەڕکێیە تەواو بوو ئەو هەموو لەشو گیانی هەڵدەپەڕی. ئێستا زۆر شت لە بارەی ڕەگەزو دایكو باکی قاسمەوە دەووترێت. بەڵام من ئەوەم دیو کاك جەمال نەماوە تا یادی ئەو قسانەم بکاتەوەو بیسەلمێنێ. بەڵام ڕۆژگاری کوردو عەبدولکەریم قاسم بە جۆرێکیتر ڕۆیشت. ئەوەندەش بڵێم کە خۆی کەوتە قسەکردن ئەو شەوە بڕیارێکی گەورەی خۆی کرد بە دیاری بۆ گەلی کورد ئەویش دەرچوونی عێراق بوو لە پەیمانی بەغدا کە جێگرەوەی پەیمانی سەعد ئاباد بوو. یەکێك لە مەبەستەکانی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی کورد بوو لە هەر شوێنێکی کوردستان بێت.

### هەر لە پەراوێزی ئەو ئاهەنگەدا دوو یادگار تۆماردەکەم

١-لە دوکانەکەی مامۆستا بەشیر موشیر هەموو شت باسدەکرا ڕووداوو کاری ڕۆژ دەخرایە سەر مێزی موناقەشە. مامۆستا بەشیر خۆی بانگکرابوو. خۆم کارتم بۆ بردبوو. (ژمارەی کارتیش هێندەی کورسییەکانبوو، نووسرابوو کارتەکانتان لەگەڵ خۆتان بهێنن)، بەڵام ئەو بێ کارت هاتو کارتەکەی خۆی دابو بە نزاری کوڕی. کێش دەیوێرا مامۆستا بەشیر نەکاتە ژوورەوە. مامۆستایەك کە بانگکرابوو و خۆی هاتبوو گلەیی ئەوەیکرد کە مامۆستا عەلائەدین سوجادیمان بانگ نەکردووە لە ڕاستیدا ناوی مامۆستا سوجادی هەبوو، دەبوو کەسێکیتر کارتی بۆ بەرێت بۆی

نەبردبوو. مامۆستا جەمال نەبەز بانگ کرابوو بەڵام نەهاتبوو. بۆ سبەینێ ١٩٥٩/٤/٢٥ کە باسی ئاهەنگەکە کەرەسەی موناقەشە بوو: مامۆستایان بەشیر وابزانم هەژارو یەکێکی تر باسی قسەکانی کاک جەمال حەیدەریان دەکردو گلەیی ئەوەیانبوو کە ووتاری پارتی باسی مافی کوردی تێدا نەبوو و مامۆستا بەشیر دەیفەرموو: ئافەریم شەیوعی، خلف الله علیکم کاک جەمال نەبەز دەیووت: بەڵێ ئەمانەن مامۆستا برایم ئەحمەد پێیان دەڵێت ڕەشەکانو دەڵێ من قەت پێیان ناڵێم سوورەکان، دەبا حیزبەکەی خۆی هەڵوێستێ وەك ئەوانبوایە[٢٥].

٢-سەیر ئەوە بوو لای خەڵك، کە ئەو سەردەمە هەموو ئاهەنگێکی وا گەورە، بە تایبەتی کە زەعیم بچووایە، یەکسەر بە ڕادیۆو تەلەفیزیۆن بڵاودەکرایەوە. بەڵام بۆ ئەو ئاهەنگە نە ڕادیۆو نە تەفەلزیۆن نەهاتبوون، ئێمەش چونکە بە تەمای هاتنی ئەوان بووین، تۆمارکەر (ڕیکۆردەر- مسجل)مان نەهێنابوو، کە زەعیم هاتە بەردەمی شانۆکە (نەچووە سەر شانۆ) ئەفسەرێك میکرۆفۆنی بۆ گرت. من دەستم کرد بە نووسینەوەی ووتارەکەی. نەك پێ ڕانەگەم. کاک ئەمیر حەوێزی –کە ئەوسا ئەفسەری ئیحتیات بو، بە چەکەوە لە پشت زەعیمەوە بوو بە ئەفسەرێکیتری ووت، ئەویش دەستی دایە نووسینەوە لەسەر نووسینەوەی هەردووکمان ووتارە گرنگەکەی زەعیم درا بە ڕادیۆو تەلەفزیۆنو ڕۆژنامەکان.

بۆ سبەینێ کە ووتار بڵاودەکرایەوەو ئاژانسەکانی جیهان باسیان لە کشانەوە لە پەیمانی بەغدا دەکرد. ئەوەی کە ئاهەنگ پیشان نەدراوەو ووتار بە دەنگی زەعیم خۆی نییە بە سەد جۆر لێك دەدرایەوەو دیارە لە بەرەوژووریش مەسەلە کەوتە بەر لێکۆڵینەوە. ئەودەمە ئەفسەری تێکۆشەر دۆستی دیارو مەزنی کورد سەلیم ئەلفەخری بەڕێوەبەری گشتیی ڕادیۆو تەفەلزیۆن بوو،

---

٢٥-ئەم قسانەی کاک جەمال پێش دامەزراندنی کاژیك بوو کە لە ١٤/ نیسانی/ ١٩٥٩دا دامەزراوە.

بێگومان ئەو کاری وای نە لەگەڵ زەعیم‌و نە لەگەڵ کورد نەدەکرد ڕاستیش هەر ئەمە بوو:

ئەودەمە حیزبی شیوعی دەستی دەڕۆیشت لەناو هەموو کورددا کاك ئەحمەد عوسمان ئەبوو بەکریان هێنابوو کردبوویان بە بەڕێوەبەری ئێستگەی ڕادیۆی کوردیی بەغدا. کاك ئەحمەد لیسانسی مەتیماتیکی هەبوو ئەو کاتە یەك دێڕیشی نەنووسیبوو. کاك جەمال حەیدەری‌و ڕەنگە کاك عەزیز محەمەدیش بیری سەردەمی سالآنی چلی ئەحمەدیان لە خەیاڵدا بوو، هەروەك هەڵوێستی ئەم لەگەڵ ئەودەمەی کاك حەمیدی برایدا نەبوو کە بووبوو بە یەکێك لە سەرکردەکانی پارتی. لەبەرئەوە لەناو هەموو ڕوناکبیری کوردو کاری ڕادیۆ زاناندا ئەو دەسکە گوڵی برادەرانیبوو. سەلیم ئەلفەخری کاك ئەحمەدی ڕاسپاردبوو کە کاری ڕادیۆو تەلەفزیۆن بردن بگرێتە ئەستۆو خۆی پشتی لێکردبۆوەو ئەحمەدیش هیچ باسی لا نەکردبۆوە. کاك ئەحمەد لەناو بانککراوانی ئاهەنگدا حسابی بۆ نەکرابوو و کارتی بۆ نەچوو بوو.

ئیتر بەمجۆرە هەقی خۆی کردبۆوە. نازانم عەقید سەلیم ئەلفەخری وەڵامی خۆیی چۆن دابۆوە. بەڵام دەزانم کاك جەمال بۆ ئەحمەد تێکەوت‌و لە سزادان ڕزگاریکرد. ئەم مەسەلەیە لەبەرئەوە بە درێژی باسدەکەم. چونکە لەم ڕۆژانەدا یادداشتەکەی سەیدای جگەرخوێنم خوێندەوە. باسی ئەوە دەکات کە کاك ئەحمەد عوسمان لە ڕادیۆی کوردی کاری نەداوەتێ‌و شیوعی‌یەکانی لەوەدا بە گوناهبار زانیووە. دیارە کاك ئەحمەدی باش نەناسیوە کە هێندە گوێی نەدەدایە حیزب[٢٦].

* * *

---

٢٦-هەر بەو شێوازەی ئەم یادداشتانەی پێدەنووسیم، باسی ئەوڕۆژەکانم تەواوکرد، ئەوسا دێمەوە سەر هێڵی یادداشتەکان‌و لە منالی‌یەوە تێهەڵدەچمەوە.

## بەرەو حیزبایەتی

بەو جۆرە لەو تەمەنەدا کەوتمە جموجوڵی سیاسی. دیاربوو باری سەرنجی زۆر لەو هاوەڵانەم ڕاکێشابوو کە لە من گەورەتر بوونو خەریکی حیزبایەتی بوون. شەوێکی هاوینی ١٩٤٧ بوو هەر بە ناوی گەڕانەوە ڕووەو بەردەرکی سەرا ڕۆیشتم. لەوێ دوو کوڕی گەڕەکی خۆمان کە بە تەمەن کەمێك لە من گەورەتر بوونو لە خوێندنیشدا ئەگەر هەردووکیان نەبووبن یەکێکیان لە من لە پێشەوە تر بوو، بانگیان کردمو کە زانیان هەر بۆ گەڕان هاتووم ووتیان با پێکەوە بەرەو لای باخی گشتی بچینو بێینەوە. لەبەر دەرکی سەراوە تا باخی گشتی چوار جار بە دەم قسەوە هاتینو چووین. بۆم دەرکەوت کە هەردووکیان ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردنو یەکی ناوێکی کوردیشیان لە خۆیان ناوە نازانم هەر ئەوە ناوی حیزبیەشیان بوو یا هەروایان لا باشبوو ناوی کوردیان هەبێت. کاك مەحموودی حەمەی ئەوڵی بووبوو بە (سەربەست) کاك عەبدوڵڵای حەمەی حاجی ئەلیاس بووبوو بە (سەرسام)[٢٧]. لەو پیاسەیەدا یەکتریان بە سەربەستو سەرسام بانگ دەکرد. بیروباوەڕەکەیانم زۆر بە دڵ بوو. بەڵام ئەو ناو گۆڕینە عەقڵی نەدەگرتم. شەو هانیاندام لەگەڵ برادەرە نزیکەکانم قسە بکەم لە هەموو کەس نزیکترم جوامێر بوو. چیان بۆ باسکردم، بۆم باسکرد، دڵی گرتی، ئێوارە منو ئەو لەگەڵ ئەو دوو برادەرەدا کۆبووینەوە. هەرچوارمان پێکەوە چووینە لای کۆنترینو بەتەمەنترین تێکۆشەری گەڕەك کاك ئەحمەدی دادی، کە ئەو سەردەمە برینپێچی نەخۆشخانەی مەعاریف (پەرومردە) بوو، کۆمەڵێ قسەو باسی بۆ گێڕاینەوە، بە

---

٢٧-کاك عەبدوڵڵا- دووایی بە ڕەسمی ناوی خۆی کرد بە میدیا لە ساڵانی پەنجادا چیرۆکنووسێکی دیاربوو. ڕێبازی سیاسی بەو جەشنە دەستی پێکردو دووایی وەك ئێمە بەرەو حیزبی شیوعی چوو.

تایبەتی لە بارەی جمهوریەتی کوردستانەوە. چونکە ئەو خەڵکی پێنجوێن بوو پێوەندیی نزیکی بەو ڕووداوانەوە هەبوو، وابزانم سەفەری مەهابادیشی کردبوو. هەفتەی ئەبرد منو جوامێر بووینە ئەندامی شانەیەكو كاك مەحموود ڕێكخەرمان. کە لە ساڵی خوێندنی ١٩٤٧-١٩٤٨دا چووینەوە قوتابخانە دەستمانکرد بە ڕاکێشانی هاوتەمەنەکانی خۆمان- قوتابیانی پۆلی سێیەمی ناوەندی.

وولات بەرەو هەڵچوون و ڕاپەڕین دەچوو، لەبەرئەوە هەموو کەس لەو تەمەنەدا دەمی لە سیاسەتەوە دەدا. بیرۆکەکان ساکارو کتێب کەم، بەڵام تینووی خوێندنەوەو فێربوون بووین. لەناو کوڕانو مێردمنداڵو لاوانی گەڕەکدا ئەوانەی سەر بە پارتی بوون زیاتر بوون بەڵام لەو پۆلەدا کە تێماندا دەخوێند هەر زۆر کەم بووین، زۆرتر سەر بە حیزبی تەحرور بوون. ئێواران باخەکەی تەکیە (تەکیەی شێخ مارف) کە چاپخانەکەی حاجی فەرەجی حەمە مرادی تێدا بوو شوێن دانیشتنو کۆبوونەوەمانبوو بە دەوری چاو قسەی خۆشی حاجی فەرەجو پاقلە تایبەتی‌یەکەی ڕەحمەتی مستەفای حاجیدا کۆدەبووینەوە. ئەوانەی کە شتیان دەزانی کەمبوونو لەناو تەحرووردا لە ئێمە زیاتر بوون. زۆر جار كاك حیلمی عەلی شەریف دەهاتو لە کتێبێکدا چەند باسێکی بۆ لێکدەداینەوە. کوڕانی گەڕەکیتریش دەهاتنو دە پانزەیەك لێی کۆدەبوونەوە. لەبەرئەوەی پارتی ئەو سەردەمە خۆی بە مارکسی دەزانی کتێبو دەرسو کەرەسەی لێکدانەوەی ئەو دانیشتنانەو شانەکانیش هەر ئەو چەند کتێبە مارکسی‌یانە بوو کە بە عەرەبی هەبوون.

ئێستا سەرم سووڕدەمێنێ کە كاك حیلمی قوتابیی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی چیی لە ئێمەی پۆلی دووەمو سێیەم گەیاندووە. هەر ئەوەندەم لە بیرە لە چەند دانیشتندا مەسەلەی نیشتمانیو مەتریالیزمی دیالێکتیکی بۆ لێکداینەوە.

## بەرەو ڕاپەڕینی کانوون

شار کەوتبووە جووڵە، لە چاپخانەکاندا، لە قوتابخانەدا موناقەشەی نێوان پارتیو تەحرور بوو. هەر تاقمە بە جیا دەچووین بۆ سەیران. قوتابخانەی ناوەندیو دوواناوەندی کە پێکەوە بوون پێنج پۆلی لێ بوو. چووە ناو بینای تازەوە لە گەڕەکی چوارباخ، ئەوەی بە سانەوەی سلێمانی ناسرا. پێشتر مامۆستای کوردمان کەمبوون. مامۆستا ئەحمەد ئیبراهیم (ئەحمەد قازی) کە دەرسی تەئریخی تەبیعیو حەیوانو نەباتی لە پۆلی جیاوازدا دەووتەوە. مامۆستا جەلال نیهال –کیمیای دەوتەوە، مامۆستا ساڵح سەعید کە زۆر تواناو بە بەهرە بوو مێژووی دەوتەوە.

ئەو ساڵە ١٩٤٧-١٩٤٨ بەڕێوەبەر مامۆستا وەدیع فەتحوڵڵا میرزا گوێزرایەوە بەغداو، مامۆستا جەلال نیهال بوو بە بەڕێوەبەر. دوو مامۆستای تازە دەرچوومان بۆ هات کە هەردووکیان دەرچووی بەشی کۆمەڵایەتی واتە مێژوو و جوگرافیا بوون. مامۆستاکانی پێشوومان پێوەندییان بە سیاسەتو حیزبایەتییەوە نەبوو. بەڵام ڕاست بووبێ یانا وا بڵاوبۆوە کە ئەم دوو مامۆستایە یەکێکیان پارتیو یەکێکیتریان تەحرورە. لە ڕاستیشدا هەردووکیان لە کاتی بەرەو ڕاپەڕینو پاش ڕاپەڕینو لە دەرسدا گەلێ باسی سیاسیی بەنرخیان بۆ دەکردین. مامۆستا کەمال ئەحمەد سەعید (ئەحمەد بەگی سەعید بەگ) جوگرافیای پێ ووتینو مامۆستا محەممەد محەممەد ساڵح (دکتۆر محەممەدی حاجی حەمە ساڵح بەگ) مێژووی پێ دەووتین. جۆری دەرسو پێوەندیی نێوان مامۆستاو قوتابییان گۆڕی.

لە بارەی ڕاپەڕینی کانوونەوە نووسیبووم:

"یا جیل المخاض، هل تذکر کانون؟

اکنا شبابا مغامرین، نقتحم اللهیب ونهزأ بالنیران؟ لابل کنا حماسة لا تحد، وایمانا وعزما واستصغارا بمن کانوا قد تنکروا للشعب.

جسر وفتاة ووثبة ويوم شهيد، واخت تشق عليك الجيوب ياقيس ويا جعفر ويا قاله جاوشين. كانت اول اسطورة احلاف (مجها) الشعب ومحاها بالدم القاني.

شهيد اسمر وآخر ابيض اللون من لون الثلوج، ولكن لون الدم واحد.

على الجسر (لطختان) من الدم، كتبت شعار مرحلة طويلة:

على صخرة الاتحاد العربي- الكردي نحطم الاستعمار وعملاءه ومشاريعه ومعاهداته وكان انتصار ومتنفس.

مواكبنا ذهبت الى النجف الأشرف، لتزين مضاجع الشهداء بالنرجس والاقحوان.

وجاءت المواكب السمراء الى سيوان

اتذكرون؟

هناك التقينا، وفي ايديكم اكاليل بقيت على مراقد خوشناو وقدسي وقاله جاوشين وعبدالواحد تمجيدا للتضحية الكردية، للشجاعة في هذا المجرى الدائب، وللفكر الكردي النير.

## كانون

معركة شمولية اولى، معا رفعنا الاكف، معا انطلقت افواهنا الصارخة، هتاف العربي والكردي اندمجا.

يوم لبت السليمانية وكوى واربيل- بغداد والنجف. استنجد الغي بالرصاص، ومعا استنجدنا بالصف الواحد والايمان والتآخي.."

هەروەك چەندەها جاریتر چووومەتەوە سەر باسی ڕاپەڕینی کانوونو نووسیوومە:

مدينه الوثبات والضحايا!

هل تذكرين ذلك الصباح الكانوني، القارص البرد، حين جاءتنا الاخبار الداهئة؟

معـا توثبنـا، وقـدمنا معـا في يـد ضـحايا وبيـد وعلـى صـخرة القـوميتين المتأخيتين اسقطنا حكومة ومسحنا من ارضنا عار حلف اثم..

وفيما تلت من ايام..

معا قدمنا الثمن..

ياليل العراق! في قلب دجى الارهاب، وقفنا سورا منيعا، نحلم بالذكريات، بايام النصر وذلك المتنفس. في كبد الظلام انْشدنا للصبح الأغنيات، قلوبنا كانت عامرة بالايمان فأنشدنا معا..

لابد عائدة الى عشاقها

تلك العهود وان حسين ذواهبا

الخميس ١٩٩٨/٥/١٨

لەبەرئـەوەی مـەودای بڵاوبوونـەوەی ووشـەی کـوردی ئێـستا لـە سـنووری باشووری کوردستانەوە گەیشتۆتە هەموو کوردستانو کورد زمانی جیهان، پـێم باشە هەر خۆم ئەو چەند دێڕەی بە عەرەبی نووسیبوومن بیانکەم بە کوردی:

-ئەی نەوەی ژانو ژێ، کانوونت لەبیرە؟

ئـەرێ کۆمـەڵێك لاوی هەڵچـوو و سـەرکێش بـووین، دەچـووینە نـاو ئـاگرو گـڕەوەو گاڵتـەمان بـە کڵپـەی ئـاگر دەکـرد؟ نـەء.. بـەڵکو ئەوەنـد خـوێن گـەرمو خاوەن ئیمـانو عـەزم بـووین ئەوانـەمان بـە بچووك دەزانـی کـە پشتیانکردۆتە میللەت.

کانوون..

پردو کچێکو راپەڕینو ڕۆژی شەهید بوون، خوشکێك بـوو بـەرۆکی بـۆ تـۆ دەدڕێ، ئەی قەیسو ئەی جەعفەرو ئەی قاله چاوشین.

یەکەم ئەفسانەی ئەو پەیمانانـە بـوو کـە گـەل نـەفرەتی لێکـردو بـە خـوێنی سـوور سـڕیەوە.. شـەهیدێکی گـەنم ڕەنـگو یـەکێکی سـپی لـە ڕەنگـی بـەفردا، بەڵام ڕەنگی خوێن هەر یەکبوو.

(دوو پەڵە)ی خوێن وا بەو پردەوە، دروشمی قۆناغێکی درێژیان نووسیوە:

"لەسەر بەردی یەکێتی عەرەبو کورد ئیمپریالیزمو نۆکەرو پرۆژەو پەیمانی ووردو خاش دەکەین. سەرکەوتنو هەناسەدانێك بوو.

کەژاوەی ئێمە بۆ نەجەفی ئەشرەف دەچوو تا گڵکۆی شەهیدان بە نێرگزو گوڵاڵەو برازێنێتەوە.

کەژاوەی گەنم ڕەنگیش بەرەو سەیوان هاتن.

لە بیرتانە؟

لەوێ یەکمانگرت، چەپکە گوڵتان پێبوو خرانە سەر مەرقەدی خۆشناوو قودسیو قالە چاوشینو عەبدولواحد تا قوربانیی کوردو ئازایەتی لەم تەوژمە نەوەستاوەداو بیری گەشی کورد بە بەرزبگرن.

## کانوون

یەکەم شەڕی ئیقلیم گیربوو، پێکەوە دەستمان بەرزکردەوە، پێکیشەوە پڕ بە دەم هاوارمان کرد، هاواری عەرەبو کورد تێکەڵبوون. سلێمانیو کۆیەو هەولێر چوون بە دەنگی بەغداو نەجەفەوە.

زۆردار پەنای بردە بەر گوللە، ئێمەش پێکەوە پەنامانبردە بەر یەك ڕیزیو باوەڕو برایەتی.

(ڕۆژنامەی التآخي)

## ئەوەی دووەم

## شاری هەڵمەتو قوربانی

ئەو بەرەبەیانە ساردو زوقمەی کانوونت لەبیرە، کە هەواڵی دڵو لەش گەرم کەرەوەمان بۆ هات؟

پێکەوە ڕاپەڕین، بە دەستێك پێکەوە قوربانیمان دا، بە دەستێکیش لەسەر بەردی دوو نەتەوەی بە برا بوو حکومەتێکمان ڕووخاندو شەرمەزاریی پەیمانێکی تاوانبارمان لەسەر خاکی خۆمان سڕییەوە..

لە ڕۆژانی دوواییدا..

پێکەوە نرخی ئەوەمان دا..

ئەی شەوی عێراق! لە جەرگەی شەوە زەنگی زەبرو زەنگدا، بووین بە شورایەکی پتەو، خەومان بە یادگارەکانمانەوە، بە ڕۆژانی ئەو سەرکەوتن‌و ئەو هەناسەدانەوە دەبینی.

لەناو جەرگەی تاریکیدا سروودمان بۆ بەیان دەووت، باوەڕ دڵمانی ئاوەدان کردبۆوەو دەبووە مایەی گۆرانی‌و سروود:

ئەو ڕۆژانە هەر بۆ عاشقانیان دێنەوە

یا بەڕۆیشتووش زانرابن[٢٨]

پێنج شەممە

١٩٩٨/٥/١٨

لە باسی ڕاپەڕینی کانووندا دەبێ بێمەوە سەر ئەو شتانەی لەمەوبەر نوسیومن‌و ئەوانەیان لێ هەڵبژێرم کە بە کەڵکی ئەم یادداشتانە دێن.

ساڵی ١٩٩٨ لە ژمارە ١٥٣، ١٥٤ی ڕۆژنامەی (الاتحاد)دا کە لە سلێمانی دەردەچێ ووتارێکی دوو زنجیرەیم لەسەر ئەو ڕاپەڕینە بە عەرەبی نووسی: زنجیرەی یەکەمیان کە لاپەڕەیەکی تەواوی ڕۆژنامەکەی گرتبۆوە. زۆری ئەو لاپەڕەیە کە باسی لە کاری ڕۆژانەی ڕاپەڕینەکە دەکات لەو سەرچاوە مێژووییانەدا هەیە کە باسی ڕاپەڕینەکە دەکەن، ئەوە بۆ مێژوو نووسینەوە دەست دەدات، بەڵام من

---

٢٨-شیعری "جەواهیری"یە.

لێرەدا ئەو ووتانە تۆمار دەکەم کە لە سەرچاوەی لەبەردەستدا نەبوو و دەگمەندا هەن، یا هەر بەسراون بە یادگارو یادداشت نووسینەوە.

سەرەتا نووسیبووم بەلیفترین شت، یا ڕەوانترین شت لە بارەی ئەو ڕاپەڕینەوە ئەوەیە کە سەرکردەی نیشتمانپەروەری نەمری سوریا خالید بەکداش نووسیبووی:

"اعجوبة، كلا ليست بالاعجوبة، لو لم تكن لكانت تلك هي الاعجوبة[1]"

نووسەرو ڕەخنەگری گەورەی میسر دوکتۆر محەمەد مەندوور لەو بارەیەوە نوسیبووی:

"بەڵام گەورە ئیستیعماریەکان باشیان نەقەبلاندبوو گەلی عیراق دەرسێکی دانێ لە بیریان نەچێتەوە.."

پاشان نووسیبووی:

"گەلی ئازادی عیراق وولاتەکەی خۆی لە ئیستیعمار[2]و بەندایەتی ڕزگارکرد، گەلانیتری عەرەبو پێش هەمویان گەلی میسر ڕێگەی ئەو دەگرن، چونکە نابێ لە گەلی عیراقی برای نیشتمانپەروەری و پیاوەتیی کەمتر بێت، ئێمە لێرەوە لەم شوێنە بە شەرەفەوە سلاو بۆ گەلی عیراق دەنێرین، سلاوی بە بەرزگرتنو قەدرزانین".

سەرکردەی بزووتنەوەی نیشتمانیی میسرو سەرۆکی حیزبی حیزبی وەفدی میسری مستەفا نەلنوحاس پاشا ووتبووی:

"ئەمە ئەنجامێکی مەنتیقیی کارێکی حسابیە.. ئەوەی لە عیراق ڕوویدا لە میسرو شوێنیتر لەسەر زەویی خوا ڕوودەدات، مادامی کار بە پێی ئارەزوو دەڕواو بە پێی قانوون ناڕوات".

کە لە بارەی ئەو وەزارەتەوە لێیان پرسی کە پاش ڕاپەڕین دروستبوو ووتی:

".. ئەگەر مەبەس لە دروستکردنی ئەم وەزارەتەی دووایی ڕێگە خۆشکردن بێت بۆئەوەی لە ڕێی نوێنەرانی ڕاستەقینەی گەلەوە بدرێتە دەست گەل، ئەوە

مژدەی خێری تێدایە. بەڵام ئەگەر مەبەس هێمن کردنەوە بێت بێ پاك کردنەوەو بە هەڵەقەیەکی بۆشدا سوڕانەوە بێت‌و ڕوو نەکرێتە ڕێگەی ڕاست‌و چاکەی شەخسی‌و ئارەزووی خۆیی بخرێتە جێگای پاراستنی چاکەی عیراق‌و مەسەلەی نیشتمانیی ئەو. ئەوا عیراق یەك هەنگاو ناچێتە پێشەوە، بەڵکو چەند هەنگاو دێتە دواوەو ئەو خوێنە زۆرەی خاکی بەغدای ئاودا بە خۆڕایی دەڕوا، چۆن ئاوی باران دەڕژێتە ناو دەریای گڵەوە".

لە عیراقیش زۆر نووسرا، زۆر ووترا، جەواهیری جارێکیتر لە چەند پارچە شیعری بەرزدا گەشایەوە. لە کوردستان ژمارەیەکی تایبەتیی ڕۆژنامەی نهێنیی "ڕزگاری"م لە بیرە کە ڕۆژنامەی پارتی دیموکراتی کورد بوو، بە ووشەو سڵاوێکی ڕەنگین دەستی پێکردبوو کە سەرکردەی پارتی مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا نووسیبووی‌و ئەم سەرەتایەیم لەبیر ماوە:

"سلام من ربى كردستان الفواحة بعبق البطولات. سلام من قلوب الراقدين في سفح سيوان وفي سهل اربيل وتحت ظلال الصنوبر في العمادية، مضاجع الشهداء مصطفى خوشناو ومحمد قدسي وخيرالله عبدالكريم وعزت عبدالعزيز..

لە زنجیرەی یەکەمدا یەك بە دووای یەکداهاتنی ڕووداوەکان تۆمارکراوە، چ باسی ئەو وەفدەی چوو لە بەندەری پورتسماوس لە بەریتانیا پەیمان ببەستێ، چ بەیاننامەی حیزبە ئاشکراو نهێنی‌یەکان دژی پەیمانی کۆلایەتی‌و باسی خۆپیشاندانەکانی بەغداو هەڵوێستی پیاوە سیاسی‌یەکان. باسی لیژنەی هاوکاریی نیشتمانی کراوە —کە بۆ ڕێکخستنی چالاکی‌و خۆپیشاندان دروستبوو لە:

١-نوێنەرێکی حیزبی شیوعی.

٢-ڕەشید عەبدولقادر- نوێنەری پارتی دیموکراتی کورد

٣-شەهید عەبدوڕەحیم شەریف- نوێنەری پارتی گەل

٤-شەهید کامیل قەزانجی- لەو چەپانەی لە حیزبی دیموکراتی نیشتمانی دەرچووبوون.

"ساڵح جەبر پەیمانەکەی بە قەڵەم نووسی، ئێمە بە خوێن سڕیمانەوە". "دادگا بۆ وەزارەت دانان". "بڕووخێ وەزارەتی برسیکردنو تیرۆر". "بڕووخێ ئیمپریالیزمی ئەنگلو- ساکسۆنیی- سەهیونی". "کۆتی بیست ساڵمان بە سێ ڕۆژ سڕییەوە"

ئەمانە لە دروشمەکانی ڕاپەڕین بوون.

"سەرکەوتنێکی گەورە بوو بە خوێنی گەل نووسرا. یەکەم بزووتنەوە بوو لە مێژووی ئەو حکوومەتەی عیراقدا کە لە ساڵانی بیستەوە دروستبووبوو. کە عەرەبو کوردو هەموو عیراقییەکان تێدا بەشداربن (تورکمانو ئاسووریو ئەرمەنی) و لە کوڕانی هەموو ئاینو تایفەو مەزهەبێك.

گەلی کورد ڕۆڵی دیاری خۆی هەبوو. لە بەغدا بابولشێخو کوردی فەیلی لە ڕیزی پێشەوە بوون. لە کۆلێجەکانی بەغدادا (ئەو دەمە زانکۆ نەبوو) قوتابییە کوردەکان ڕۆڵێکی سەرکردانەی بەرچاویان هەبوو. لەو یادداشتانەدا کە نوێنەرانی قوتابیانی کۆلێجەکاندا دابوویان ناوی: قوتەیبەی شێخ نووری- نوێنەری کۆلێجی پزیشکی، خەلووق ئەمین زەکی- نوێنەری کۆلێجی حقووق، دەبینی. هەمووش شایەتی ئەوەن کە تێکۆشەری کۆچکردوو عومەر مستەفا ناوی (دەبابە)ی لەو ڕاپەڕینەوە بەسەردا دابڕا. چونکە لە ڕیزی پێشەوەی خۆپیشاندانەوە دەڕۆیشتو لێدانو گوللەباران جێی خۆی پێ چۆڵ نەدەکرد. هەروەك لەناو سەرکردەکانی قوتابیاندا ناوی کۆچکردوو ئەنوەری مەلا حەمەغا- خانەی بەرزی مامۆستایان- عومەری عەلیی مامە شێخە (الشیخ)- ئەندازیاری بە ڕێکخەر دەبینی.

هەرچی تۆماری شەهیدانە ئەوە لە پاڵ ناوی شمران عەلوانو جەعفەری جەواهیریو قەیسی ئالووسیو ئەستێرەگەشەکانیتردا ناوی کوردانی ئەمری وەك: قادر سدیق، جوامێر فەیلی، عەبدولقادر عەبدوڵڵا (قالە چاوشین) و حسین حاجی عەلی قەتتانی فەیلی دەبینی (کە تا ١٩ی شوبات بە دەم برینەوە ناڵەی دەهاتو ئەوسا مرد، باوکیشی لەتاو ئەو تاقانەیەی سوێی بۆوەو مرد).

لەناو بریندارەکانیشدا ناوی: فایەق شەوکەوت، ئەحمەد وەلی، عەلی محەمەد، سەعید مستەفا، سالم مەندەلاوی، قادر عەبدوڵڵا، حسین رەزاخبانۆ، نازم محەمەد بەشقەو جەمیل پەڵداو تێکۆشەرانیتری کورد دەبینی.

لە بەشی دووەمی ئەو زنجیرەیەدا کە زۆری بۆ وەرگێڕانی ئێرە دەشێ نووسیبووم:

باشترین شایەتی لە بارەی بەشداریی کوردەوە لەو ڕاپەڕینەدا ئەومیە کە ڕۆژنامەی "الاهالی"ی ئۆرگانی حیزبی نیشتمانیی دیموکراتی بە سەرۆکیی کامیل ئەلجادرچی لە شوباتی ١٩٤٨دا نووسیبووی:

کورد بەشداری بزووتنەوەی نیشتمانین

وەسفێکی ئەوەی لە سلێمانی ڕوویدا

سلێمانی بێبەش نەبوو لە شەرەفی بەشداربوون لە بزووتنەوەی نیشتمانیو خۆپیشاندانو مانگرتنو کۆڕی ماتەمدا کە یەك بە دووای یەکداو ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر دەبێتو هەموو چینە هوشیارەکانی گەل لەوێ تێیدا بەشدارن.

لەو کاتەدا کە لە بەغدا خوێن هەڵئەچوو، سلێمانی هەڵچوو و شۆڕشگێڕو هەڵمەتەبەر بوو. مان گرتن گرتیەوەو خۆپیشاندان بەردەوامبوو، کچانو ژنان لە پێشەوە دەڕۆیشتن. کچانی قوتابیو منداڵانی باخچەی منداڵو کەیبانوو و پیرێژنیان تێدا دەبینرا. بە دڵی ئاسنینەوە لەگەڵ قوتابیی قوتابخانەو خاوەن کارو پیشەوەران لە پیشەسازو کشتوکاڵکەرو مامۆستاو بازرگانان دەڕۆیشتن. کە ئەمانەش لە هەموو چینێکی گەل بوون. خەتیبەکانیش لە هەردوو ڕەگەز بوون (ژنو پیاو-ع) بێ پشوو یەك قسەی ئەدا بەویتر. هەموو باسی زیندووکردنەوەی برایی کوردو عەرەبیان دووبارە دەکردەوە، کورد لە پێشڕەویی ئەوانەدا بوون کە لەگەڵ برای هاوخەباتی خۆیاندا بەرامبەر بە ئیمپریالیزم قوربانی دەدەن. نە دوکانێك، نە کۆگایەك نەما دانەخرێت. بەمجۆرە سلێمانی

ئامادەیی خۆی پیشان دا کە لە پێشڕەویی مەیدانی خەباتدا بێت. ئەم هەستە لە شاری سلێمانیدا نەوەستابوو، بەڵکو دەوروپشتیی تا سنوور گرتبۆوە.

لەو دیمەنە ڕەنگینانەی لەوێ دەبینرا ئەوەبوو کە کچێکی بچووك بێ یارمەتیی کەس دڕی بە خۆپیشاندەرە کۆبۆوەکان داو سەرکەوتە سەر لۆرییەكو لەبەر کەوتە خوتبەدانو بە زمانی خۆی (مەبەس کوردییە –ع-) ئەوەی ووتی وا دەگەێنیت: "ئەی گەل، ئەگەر ئاگر لە خۆم بەرنەدەمو خۆم نەسووتێنم، ئەگەر ئێوە کچان خۆتان نەسووتێنن، ئەگەر لاوانی ئەمڕۆ خۆتان نەسووتێنن، ئەگەر ئێمە هەموومان خۆمان نەسووتێنین. چۆن لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکی دەچین، چۆن ئەم ڕێگە سەختو دڕکاویو تاریکە درێژە ڕوون دەکەینەوە، کێ لە ئێمە شایانتری هەڵگرتنی مەشخەڵی ئازادییە"[٣].

ڕۆژی گەیشتنی تەرمی شەهید کاك عەبدولقادر عەبدوڵڵا، کە لە قوتابیانی سلیمانی بوو (قوتابی نەبوو –ع-)[٤] بۆ دووا ئارامگای –گۆڕستانی شەهیدان لە لایەن هەموو خەڵکی سلیمانییەوە بەڕێ کرا. وەفدی قەزاو ناحیەکانو دێهاتی دووریش بەشداربوون. هەرچەند چاو پڕ لە خوێنو جگەر سووتاو و دڵ بە ئازار بوو، بەڵام هەلهەلە کێشانیش نەدەبڕایەوە.

کاك کازم جەعفەر[٥] لەناو خەتیبەکاندا بوو، ووتی:

"ئەی میللەتی بە قەدر: تکام وایە چەند تاوێك بە خوشووعەوە بوەستین، بۆ سڵاو لە گیانی ئەو شەهیدانەی گیانی بێ تاوانو خوێنی پاکیانیان بە قوربانی بە ئازادیی ئێمە بەخشی. با ئێستا سڵاو لە چەند گیانێك بکەین کە بە ناهەق کێشراون بەڵام بەرزبوونەوە، لە خوێنێکی پاك کە ڕێژرا تا ڕێگەی بەردەوامبوونمان لە خەباتدا بۆ بە تەواوی ئازاد بوون بۆ تەخت بکات. ئەوەتا گیانی شەهید عەبدولقادرو گیانی هەموو شەهیدان بە ئاسمانی ئێمەدا دەگەڕێن. داوامان لێ دەکەن کە شۆڕشگێڕانە بەرامبەر بە زوڵمی ئیمپریالیزمو زۆرداریی بەردەوام بین تا دەگەینە ئەنجام. شۆڕش

ڕووبەڕووی ئیمپریالیزم بۆ هیممەتی گەلێکی هوشیار کە ساڵانی زۆر تاڵیی ئازاری ئیمپریالیزمی چەشتووە گران نییە.

ئەگەر بو شۆڕش هەڵمەت نەبەن، ئەم چیایانەتان پێ حەرامە. برایینە. ئێستا خۆم لە نێوان دوو هۆی ناکۆکی یەکدا دەبینم، کە زۆر لەگەڵ یەکتردا ناکۆکن، هۆی ئازاری تاڵ بۆ جیابوونەوە لە کەسانێك ئاواتمان ئەوە بوو هەر شان بە شانی یەك لە خەباتدا بین بۆ بەجێ هێنانی ئامانجەکانمان، بەڵام لێیان جیابووینەوە. هۆی شادی بۆ ئەم هوشیارییەی هەموو چینەکانی گرتۆتەوە. ئیتر نە کورد ماوە، نە عەرەب ماوە، تەنانەت نە محەممەدیو عیساییو مووسایی ماوە، هەموو ئەبن بە یەك دەستو یەك دڵ، بۆ یەکگرتن.

ئەی گەل: ئەگەر مەبەس لە بزووتنەوەی نیشتمانیمان هەڵچوون نییە بەرامبەر بە وەزارەتێك، یا بۆ ڕووخاندنی وەزارەتێك نەبێت ئەوەی لە بارەیەوە دەووترێت، ئەوەیە کە خزمەتکاری ئەمینی ئیمپریالیزمی ئاغای بێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە دەرسێکی کاریگەر بدەین بەمجۆرە وەزارەتانەو بە کلکەکانی ئیمپریالیزم تا یەتی بەرەڵاییان بۆ بەر نەدرێت گاڵتە بە سادەترین مافی گەلو داخوازەکانی بکەن، تا تاوانی ئەوانەی پێش خۆیان دووبارە نەکەنەوە.

مەبەس لەم بزووتنەوە نیشتمانییە ئاشکرایە. ئێمە هێشتا لە سەرەتای ڕێگەیەکی سەختو گرانو دڕکاویداین. بەڵکو لە سەرەتای سەرەتاداین. دەبێ بە وریاییو خۆگری هەنگاو بنێین. هێشتا نانی گەل هەر تاڵان دەکرێت. هێشتا نەخۆشی هەر لە ناوی دەبات. هێشتا نەزانی زوربەیی گرتۆتەوە، هێشتا ئیمپریالیزمی تاوانبار بیر لە بەکارهێنانی شێوەی جیاجیای تاوان دەکاتەوە تا ڕەنجمان بە با بدات، وەك لە ڕابوردوویەکی زۆر نزیکدا لەگەڵ دراوسێکانماندا بە کاری هێنا.

دەمەوێ کۆتایی شایی شەهیدی گرانبەهامان عەبدلقادر بە سڵاو لە گیانی شەهیدە گرانبەهاکانمان بهێنم کە هەتاهەیە بە زیندوویی دەمێننەوە. سڵاو بۆ

بزووتنەوەی نیشتمانیمان لە پێناوی ئازادبووندا لە ئیمپریالیزم. با برایەتیی کوردو عەرەب بە بەرز بگرین. بڕووخێ هەموو ئەو پەیمانانەی بە ئیمپریالزممانەوە دەبەستن. بە تایبەتی پەیمانی جەبر- بیفن، بڕووخێ پەرلەمانی ساختە، بڕووخێ هەموو خائنێکی پەروەردەی ئیمپریالیزم"[٦].

هەر لەو بەشی دووەمەدا نووسیبووم:

**یادگار:**

بە ڕاستی کوردستان پارچەیەك ئاگر بوو. ئەوەی لە ساڵی پێشووە گردبووبۆوە. لەناوبردنی کۆماری کوردستان، بە داراکردنی چوار ئەفسەرەکە. گرتنی سەدان لەوانەی لە مەهابادەوە گەڕابوونەوە (بە منداڵو ژنەوە- لە بەرزانییەکان) لەناو تەلبەنددا. ئەمانە گڕی تۆڵەی بەرامبەر بەو وەزارەتەو پەیمانەکەی تیژ دەکرد.

هەولێر ڕاپەڕی، خۆزگە لەو تێکۆشەرانەی ئەو زەمانە کە ماون یادگاری خۆیان دەنووسی. کۆیە ڕۆڵی خۆی هەبوو. سلێمانیش بەو جۆرە بوو کە باسکرا.

قوتابیانی دووا ناوەندی (سانەوی)ی سلیمانی لە ڕیزی پێشەوە بوون. بەیانیان زوو لەبەر دەرگای چوونە دەرەوەی قوتابخانەدا کۆدەبووینەوە. پاش ئەوەی خوتبەیەك دەدراو چەند هوتاف دەکێشرا ڕوومان دەکردە بەر دەرکی سەرا.

ڕۆژی یەکەم دەرگایان لەسەر داخستین. پۆلیس هاتن بۆ ئەوەی دەورەی قوتابخانە بدەن. معاونێکی پۆلیس خۆی کرد بە حەرەمی قوتابخانەداو کەوتە هەڕەشەی گرتنو تەقەکردن.. هتد. بەڵام قوتابیان پاڵیان پێوەناو شانیان نا لە دەرگا تا کرایەوەو بە کۆمەڵو بە گرمە چوینە سەر جادەو ڕوومانکردە ناوەڕاستی شار.

لە بەیانییەوە خۆپیشاندان لە قوتابخانە بەردەوامبوو. کۆبوونەوەی دووای نیوەڕوان لە ناوەڕاستی ئەوسای شار (لای حەوزی ناوبازاڕ)، یا لەبەر دەرکی سەرا بوو.

ڕۆژی ٢١ی کانوونی دووەم. کە لە نزیك سەراوە بووین لە جادەی تازە (شەقامی مەولەویی ئێستا). ئوتومبیلێکی موسەلەحەی پۆلیس دڕی بە خەڵکەکە داو ڕێی بۆ خۆی کردەوە. هوتاف بەرزبۆوەو زوربەی قوتابیان کەوتنە خوێندنەوەی ئەم دێڕانەی هەردی:

باروووتو قورقوشمو پۆڵا

گوللەی زۆرداری ناقۆڵا

زنجیری سەد بەندیخانە

ڕەشاشی دەستی بێگانە

یەك زەڕە کارمان تێناکا

تەرکی ڕێگامان پێناکا

بۆ مێژوو دەبێ بڵێین کە پۆلیسی سلیمانی (کە ئەو سەردەمە هەموو کورد بوون، تەقەیان نەکرد زۆر بە دەگمەنیش داریان بەکاردەهێنا. بەڵام خۆپیشاندان هەر بەردەوامبوو تا وەزارەتی ساڵح جەبر ڕووخا. ئەوسا خۆپیشاندانی خۆشی دەستی پێکردو بەو جۆرە ڕەنگینە تەرمی "قالەچاوشین" بەڕێ کرا.

هەفتەی ڕاپەڕین یادگاری خۆی هەیە، هەروەك چەند مانگێ پاش ڕاپەڕینیش یادگاری خۆی هەیە. لەو چەند مانگەدا تا ڕادەیەك ئازادی هەبوو (ئازادیی مانگرتن، خۆپیشاندان، دەرچوونی ڕۆژنامەی ئازاد لە بەغدا، دەرچوونی یەکەم گۆڤاری سیاسیی کوردی- عەرەبی، (نزار)ی مامۆستا عەلادین سوجادی، یادگاری ئەو چەند مانگە شایانی تۆمارکردنە، وەك باسی نەورۆزی ١٩٤٨مان تۆمار کرد.. بۆ جێگیرکردن دەبێ بڵێین: ڕۆژانی ڕاپەڕین توانستو هێزی گردەوەبووی لە شاردا بەرەڵڵا کرد. هەر لە ڕۆڵی سەرکردەیی سەرکردەکانی هەردوو حیزبەوە. (پارتی دیموکراتی کورد، حیزبی شیوعی. ئیبراهیم ئەحمەدو ئەحمەد غەفوورو کەسانیتر. تا پەیدابوونی چەند خەتیب-

دیارتریان محەمەد ئەحمەد تەها (کامەران موکریی شاعیر) و محەمەد ساڵح دیلان بوون (کە هێشتا نەبووبوون بە شاعیر). لە خۆپیشاندان‌و کۆبوونەوەکاندا خوتبەکانی تێکۆشەران ئەحمەد تۆفیق "دادی" و حیلمی عەلی شەریف‌و تەهای شێخ جەلال (سەید تەها) و کەسانیتِرت دەبیست. هەروەك چەند شاعیرێك هەر لەو ڕاپەڕینەوە دەرکەوتن. هەندێکیان هەر ئەوە بوو و هەندێکیان بەردەوامبوون. لێرەدا دەبێ ناوی کاکەی فەللاح، حاجی باقی "بەنگینە"ی نانەواو محەمەدی مەلا حسێنی بەرگدروو بێنین.

قوتابیان بنەڕەت‌و کۆڵەکەی چالاکییەکانی ڕاپەڕین‌و دووای ڕاپەڕین بوون. سەرکردەکانی قوتابیان لە هەموو شاردا دیاربوون.

عومەر کەریم عەزیز (کە ئەو سەردەمە لێپرسراوی قوتابیانی پارتی بوو). حیلمی عەلی شەریف سەرکردەی قوتابیان‌و خەتیب بوو (ئەمانە لە پارتی. ڕۆڵی غەفوور کەریم‌و ئەکرەم یامولکی (لەناو شیوعییەکاندا) دیارو چالاکانە بوو لە کاردا.

ئێمە لە پۆلی (سێیەمی ناوەندی) بووین، بەڵام وەك پیاوی ڕاستەقینە دەچووینە مەیدانەوە. بە ڕاستی ڕاپەڕین‌و سەرکەوتن وای فێرکردین کە ئێمە پیاوین‌و ژیان‌و سەرکەوتن دروست دەکەین.

## پاش ڕاپەڕین:

پاش ڕاپەڕین —وەك هەموو پاش شۆڕش‌و ڕاپەڕینێك جەشنە ئازادییەك هەبوو، چەند ڕۆژنامەی نیشتمانی لە بەغدا دەرچوون. "الاهالي" کەوتەوە کار، "الوطن"ی پارتی گەل‌ی عەزیز شەریف، "السیاسة"ی پارتی یەکێتیی نیشتمانیی عەبدولفەتتاح ئیبراهیم، شیوعییەکان بە ناوی (شەریف ئەلشیخ)ەوە ڕۆژنامەی (الاساس)یان دەردەکرد، بەڵام ناوی حیزبی لەسەر نەبوو، وەزارەتی محەمەد ئەلسەدر هاتە سەر کار، کەسانی کۆنی سەر بە ڕژێمەکەو کەسانی نیشتمپەروەریشی تێدابوو. زیاتر بۆ هێمن کردنەوە بوو، بۆ جێبەجێکردنی داخوازەکانی گەل نەبوو.

محەمەد ئەلسەدر (محمد الصدر) بەرگی مەلا سەیدەکانی شیعەی لەبەردا بوو، کە هیچی نەکرد، لە خۆپیشاندانی بەغدادا دەیانووت:

ردناك عون

صرت فرعون

یابو اللحیة النایلون

واتە:" بە یاریدەدەری خۆمانمان دەزانیت

بوویت بە فیرعەون

خاوەن ڕیشی نایلۆن

لەم جۆرە هاوارانە کە عەرەب (هۆسە)ی پێ دەڵێن لە ڕاپەرینیشدا زۆر بوو:

ئازادیی کۆبوونەوەو خۆپیشاندان هەبوو، زۆرجار بۆ بەجێهێنانی داخوازەکانی گەل، زۆرجار بۆ داخوازیی تازە کە دەهاتە ناوەوە.

کە لە کۆتایی بەهاری ١٩٤٨دا گرتن‌و ئازاردان دەستی پێکرد زۆر کەس گیران‌و برانە بەردەمی مەحکەمەی عورفی چ لە کەرکووک‌و چ لە بەغدا، پۆلیسەکانی تەحقیقات (ئەمن) چوو بوون بۆشایەتی لە گیراوەکان کە گوایە لە خۆپیشاندانەدا دیویانن. سەرۆکی مەحکەمە لە یەکێك لەو شایەتانەی پرسیبوو، کەی خۆیان پیشان دەدا، کابرای نەشارەزاو نەخوێندەوار وتبووی قوربان فێنکیی بەیانی‌و فێنکیی عەسر موزاهەرەیان ئەکرد.

ڕاستی ئەو چەند مانگە ئەوەندەت خۆپیشاندان دەبینی هەر لە قسەکەی کابرا دەچوو.

ڕاستە حکوومەتی تازە هێمنتر بوو. زەبروزەنگ کەمتر بووبۆوە، بەڵام مەبەسە سەرەکییەکانی گەل جێبەجێ نەکرابوون. لەبەر ئەوە ڕۆژنامە نیشتمانییەکانیش دەیاننووسی، بە دەستی حیزبەکانیش لە هەموو بۆنەیەکدا کۆبوونەوە یا خۆپیشاندان بوو. دروشمی (علی صخرة الاتحاد- العربي- الكردي يتحطم الاستعمار وعملاؤه ومؤمراته ومعاهداته)[٧] هەمیشەیی بوو.

مێژوو نانووسم تا بچمەوە سەر سەرچاوەو ڕۆژنامەکانی ئەو کاتەو یەك بە یەك داخوازی‌یەکانی خەڵك‌و حیزبە نیشتمانی‌یەکان تۆمار بکەم. بەڵام ئەوەی لەیادمە ئەوەیە کە هەمیشە باس لە پووچکردنەوەی پەیمانی ١٩٣٠، دیموکراتیی بەرفراوان‌و ئازادیی دیموکراتی- ئازادیی قسەکردن‌و نووسین‌و ڕۆژنامەگەری‌و بەردانی بەندە سیاسی‌یەکان بە بەرزانی‌یەکانەوە دەکرا.

لەو پلەیەدا نەبووم کە هۆی ئەو خۆپیشاندان‌و کۆبوونەوانە هەمووی بزانم، بەڵام لەو بارەیەوە قسەیەکی خۆشم لەبیرە.

لە سلیمانی دەمانبیست، لە ڕۆژنامەکاندا دەمانخوێندەوە کە کامیل قەزانچی (شەهید) دیارترین خەتیبی خۆپیشاندانەکانی ڕاپەڕین بووە. سوێندێکی بەناوبانگی هەبوو. لەو خۆپیشاندانانەدا چەند جار جەماوەری پێ سوێند داوە. حەمەی ئەحمەدی تەها (کامەران موکری) کردبووی بە کوردی‌و ئەمیش وەك ئەوی دەکرد.

"بەخوای بوزورگ، بە پێغەمبەری بێهاوتا، بە خاکی نیشتمان.. هتد"، ئەنجام سوێند بوو بۆ کۆڵنەدان تا گەیشتنە مەبەس. لە پاڵ قەزانچیدا دەمانبیست کە ساڵح ڕوشدی[٨] خەتیبێکی دیار بووە لە خۆپیشاندانەکانی بەغدادا. ئێمەی کوردو سەر بە پارتی لە قسەوباسدا لە ڕیزی قەزانچیمان دائەناو باسمان دەکرد. لە پڕ ساڵح ڕوشدی پەیدابوو، هەموو لە چایخانە سڵاومان لێدەکردو بەخێرهاتنمان دەکرد. حەزمان دەکرد کە گوێمان لە خوتبەیەکی بێت. یەك بە یەکمان دەگوت –بۆچی عەسر خۆپیشان نەدەین، بەڵکو خوتبەیەك بدات. کەچی لەپڕ پارتی بڵاویکردەوە کە عەسر خۆپیشاندانە. لەسەر پێڕەوی جاران. لە بەردەمی حەوزەکەی ناوبازاڕەوە بۆ مەیدانی ماست فرۆشەکان، بەرەو بەردەرکی سەراو، بەرەو ماڵی موتەسەریف، (سەرۆکایەتیی ئێستای زانکۆ). دوو جار گوێمان لە ساڵح ڕوشدی بوو بە عەرەبی خوتبەی دا، بە ڕاستی خەتیب بوو. خۆپیشاندانیش بە تایبەتی بە

ناوی بەردانی بەرزانییەکانەوە بوو. هەرچەند ساڵح ڕوشدی ماوەیەك لە سلێمانی ژیابوو و خوێندبووی، بەڵام دیاربوو نەیدەتوانی بە دیالێکتی ئێمە خوتبە بدات. لە کۆتایی خوتبەکانیدا بە جارێکیشان (هوتاف) کۆتایی دەهێنا. بەڵام تۆنی بادینان بە مەیەوە دیار بوو. لە جیاتی ئەوەی بڵێت "یا.." خەڵکەکە بڵێن "یعیش..". دەیوت "یاه.."

ساڵانی پاش ڕاپەڕین گەلێك لاپەڕەی دەوێ. لە بەغدا کێشە لە نێوان بەرەی دیموکراتی (بە شیوعییەکانیشەوە) و بەرەی نەتەوە پەرستەکان "قەومی"یەکاندا بوو، کە "حیزبی ئیستیقلال" پیشەنگیان بوو. ئەو دەمە لقی پارتی بەعس لە عیراق دروست نەبووبوو. لەو دروشمانەی بەرەی دیموکراتی لە خۆپیشاندانەدا بەرزیان دەکردەوە دروشمی "الخبز للجیاع" —واتە "نان بۆ برسیان" بوو، ئەمە لە کوردستان بووبوو بە "نانمان دەوێ بۆ میللەت"[٩].

لەبەرئەوەی محەمەد مەهدی کوببە- سەرۆکی حیزبی ئیستیقلال لە وەزارەتی سەدردا وەزیری تەموین بوو. هەر خۆپیشاندانێك ئەو دروشمەی هەڵگرتایە ئەوان هێرشیان دەکردە سەرو ئەو دروشمەیان دەدڕان.

گەورەترین بەیەکدادانی ئەو دوو بەرەیە لە کولیەی فەیسەڵ بوو، لەبەرئەوەی تا ئێستا نەمدیووە کەس باسی کولیەی فەیسەڵ بکات. هەر بۆ تۆمارکردنی ئەو پەردەیەی تێکۆشانی گەل. بە کورتی باسێکی دەکەم.

حکوومەتی مەلیك- نووری سەعید کە لە هەموو شتێکدا هەڵقەلەگوێی ئینگلیز بوون. لە جۆری "ڕوشدیەیەی عەسکەریی" تورکەکان بیریان لە شتێك کردبۆوە. ئەویش دانانی قوتابخانەیەك بوو، کە خوێندن تێیدا بە ئینگلیزی بێت. بەڕێوەبەر ئینگلیز بێت، (خواردن و نووستن) هەر لە قوتابخانە بێت. بەڕێوەبەریش ڕێ و شوێنێکی عەسکەریی لە نووستن و هەستان و ڕەفتاری ڕۆژانەدا بەجێ دەهێنا. سەرەتا لە پۆلی سێیەمی ناوەندییەوە قوتابیان وەردەگرت. دوایی وای لێهات لە هەموو لیوایەك (یەکەم و دووەم و سێیەم)ی

لیوا (پارێزگا)یان لە شەشی سەرەتاییەوە دەبردە ئەوێ. دیارە مەبەس ئەوە بوو کە زیرەکترین قوتابیی عیراق لەوێ کۆبکەنەوەو ئینگلیزانەو بۆ خزمەتی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی پەروەردەیان بکەن. بەڵام ئەم چەشنە پیلانە بەسەر بزووتنەوەی چەپدا ڕەت نەبوو، بە تایبەتی هاوڕێ فەهدو عەزیز شەریف، کە قورسایی کاریان خستە ناو ئەو کولیەیەوە چ بە مامۆستا -جێی خۆکردنەوەو چ بەکار لەناو قوتابییاندا. لەناو مامۆستاکاندا -عەبدولجەبار وەهبی -ئەبو سەعید- (شەهید) و حسین عەبدولعال دیاربوون. لەناو قوتابیانی ساڵانی یەکەمدا کە باسی ئەو کولیەیان بۆ کردووم سەعید مەتەر (مطر) و عامیر عەبدوڵڵاو شەهید جەلالی ئەحمەد فەهمی بوون.

کولیەی فەیسەڵ بوو بە دەستگایەکی سەر بە میللەت. قوتابیانی لە ڕیزی پێشەوەی پاش ڕاپەڕیندا بوون. ئەمە ڕقی ئینگلیزو دەستگاکانی حکوومەتو بەرەی نەتەوەپەرستی عەرەبو کۆنەپەرستەکانی هەڵساندبوو. توندوتیژیی لەناو کۆلێجەکەدا بەرامبەر بە قوتابیان، لە بارەی ژیانو خوێندنو سیستێمی عەسکەری بەکارهێنان دەستی پێکرد. قوتابیانیش مانیان گرت. پاش دانوستاندن لەگەڵ بەڕێوەبەراندا ڕێك کەوتن. چوونەوە سەر خوێندن. بەڵام ئەمجارە بە دەستی کاربەدەستان خۆیان بێت، یا کۆنەپەرستان لە خۆیانەوە بێت، بە بێدەنگ بوونی پۆلیس تاقمێ بەدخووی شەلاتیی ئەعزەمیە بە سەرکردەیی پیاوخراپێکی تاوانباری ناسراو هێرشیان بردە ناو کولیەوەو بە دارو تۆپزو چەقۆ کەوتنە لێدانو بریندارکردنی قوتابیان.

ئەمە بیانووی دایە دەست دامەزرێنەرانی ئەو بنکەیە، کە نیازی گڵاویانی تێدا نەهاتەدی کە ئێجگاری دایخەنو هەموویان بنێرنەوە شاری خۆیان.

هەموو بە ورەیەکی بەرزەوە هاتبوونەوە، بەڵام خوێندنی لای خۆمان کۆسپی لەبەردەمدا بوو. ئەوان بە ئینگلیزی خوێندبوویانو ئێمە بە عەرەبی. لە هەرەوەزییەکدا ئێمە کەوتینە عەرەبی فێرکردنیانو سوودمان لە

ئینگلزییەکەی ئەوان دەبینی، بە تایبەتی لە زانستی وەك: مەتیماتیك، كیمیا، فیزیا.. هتد.

لەو قوتابییانەی لە کۆلێجی فەیسەڵەوە گەڕابوونەوەو باسی بەغداو ڕاپەڕینیان بۆ دەکردین ئەمانەم لە بیرماوە: شەهابی شێخ نووری (شەهید)، شەماڵ سائیب، محەمەد ساڵح بابان، فوئاد عیزەت، بەشیر ڕەشید، مەجید عەبدوڕەزاق (مام قادر).

لە کارە دیارەکانی پاش ڕاپەڕین هاتووچۆی وەفد بوو لە نێوان شارەکانی عیراقدا. لە سلیمانییەوە وەفدێکی گەورەی چەند سەد کەسی چووە بەغدا، دەبێ لە شارەکانیتری کوردستانیشەوە چووبن، چونکە دروشمی (وەفدی کوردستان)یان هەڵگرتبوو. (بە درێژی بە وێنەوە لە گۆڤاری گەلاوێژدا باسی ئەو وەفدە کراوە)[١٠]. لە بەغداو لە حیللەشەوە وەفد ڕوویانکردە سلێمانی بۆ سەر گۆڕی قالەچاوشینو شەهیدانی پێش ئەو (بە درێژی لە پێشەکیی دیوانی کاکەی فەللاحدات باسی یەکێك لەو وەفدانەم کردووە).

ئەمڕۆ باسی ژنانو هاوسانی لە جاران زیاتر بووە بە باو، من لەبەر شوێن کەوتنی ئەو باوە نییە، بەڵکو بۆ گێڕانەوەو یادگارو نووسینی چەند ڕووداو کە باس نەکراون دەڵێم:

بەشداریی ژنان لە ڕاپەڕیندا شتێکی دیار بوو. ئەو سەردەمە باسی "فتاة الجسر" لەسەر زمانی خەڵكو شاعیرانو لەسەر ڕووی ڕۆژنامەکاندا بوو. خۆپیشاندەران ڕۆژی ١/٢٧ لە بەری ڕەسافەو بەری کەرخەوە هاتبوون لەسەر ئەو پردە یەکیان گرتبووەوە کە لە پاش شۆڕشی تەمووزەوە بە ڕەسمی ناونرا "پردی شەهیدان- جسر الشهداء" کە گەیشتنە ناوەڕاستی پرد پۆلیس نێوانی گرتنو لەسەر منارەکانی دوو مزگەوتی بەری ڕەسافەشەوە دەستڕێژیان لێکرا. لە هەردوو لاشەوە بە دارو بەرد کەوتنە گیانی پۆلیس، کچێك دڕی بە ڕیزی پۆلیس داو لێکی کردن، بەڵام وەك دەووترا گیانی خۆی بەخشی.

زۆر باسی ئەو کچە کراو بە چەند جۆر ناوی دەهێنرا. تا هەندێك جورئەتی ئەوەیان کردبوو، بۆ سووك کردنی پۆلیسی ترسنۆکی سالّح جەبرو نووری سەعید کە بڵێن یەکێك بوو لە نافرەتە خراپەکانی بەغداو ووتارێك بە ناوی "البغیة الفاضلة"ەوە بنووسرێ، وەك بڵێیت "داوێن پیسی سەرفراز". دیارە ئەمە ڕاست نەبوو، هەر بە مەبەسی سووك کردنی ئەو حکوومەتە بوو، کە بەو جۆرە بە کوشتنو دەست ڕێژ بەربەرەکانیی میللەتی دەکردو لە ڕاستیدا ئەو جۆرە حکوومەتانە لە هەموو کەسێك خراپترن کە بە ناچاری تووشی خراپی بوون.

بە ڕاستی کچی کورد ئەو سەردەمە چ لە بەغدا (کە کەمبوون) و چ لە سلێمانی (دیارە من ئاگاداری شارانیتر نیم) ڕۆڵی گەورەیان هەبوو، لەو خۆپیشاندانانەی سلێمانیدا، هەموو قوتابیانی ناوەندیی کچان (ئەوسا هەر ناوەندی هەبوو) و پۆلەکانی بەرەوژووری سەرەتاییەکان بەشداربوون.

لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا بوو کاکە حەمەی ئەحمەدی تەها (کامەران موکری) بانگیکردم:

-لە ماڵەوە دیزداشەت هەیە.

-بەڵێ.

-دە خێرا ڕاکە لەبەری کە، بچۆ بۆ سەر شیوی قازی بۆ ماڵی پوورم. ماڵی وەستا فەرەج (باوکی کاك کەریم —کە قوتابی بوو لەگەڵمان، باوکی غەفوور -کە لە مەودووا بوو بە ئەفسەرێکی گەورە). بڵێ —بە فلان ناونیشان ئەمانەتەکەی حەمەم بدەنێ، کۆمەڵێك دروشمە لەسەر خامی بلووری نووسراونەتەوە. لەژێر دیزداشەکەتەوە لە خۆتی دەپێچیتەوەو دەیبەیت بۆ قوتابخانەی (سدیقە)ی کچان. دەیدەیت بە مەندانەی شێخ سەلام.

چووم و وەرمگرت. من هەر وەك منداڵبووم، چونکە زوو چووبوومە قوتابخانە، هەروەها لە تەمەنیش منداڵتر دیاربووم. دوو سێ دروشم بوون، تۆزێ قەڵەویان دەنواندم. بەڵام زوو لە سەرشەقامەوە گەیشتمە قوتابخانەکە لە

گەڕەکی شێخان. کە مەندانە خانم بانگو کردو لە یەخەی دیزداشەکەوە دەستمکرد بە دروشم دەرهێنان، ئەو کارە لای فەڕاشی قوتابخانەکە سەیر بوو، چونکە بێ ئیزنیش خۆم کردبوو بە حەوشەی قوتابخانەدا، نازانم فەڕاش چیی لە بەڕێوەبەر گەیاندبوو، ئەوەندەم زانی بەڕێوەبەر (فاتمە خانی قەفتان) بە دارەوە بۆمان هات. منو مەندانەخانیش بە دەم (دەور تەسلیم)ەوە ڕامانکردە دەرەوەی قوتابخانە، من بەرەو شارو ئەویش بەرەو ناوەندیی کچان کە نزیك ئەوان لە خانووی لای ماڵی شێخ قادری حەفیدەوە بوو. کە دیارە سەرەتای خۆپیشاندانی ئەو ڕۆژە لەوێوە دەستی پێکرد.

ئەگەر سەیری گۆڤاری گەلاوێژ بکەیت دەبینیت لەسەر شەقامی ڕەشید لەو دروشمانەدا کە وەفدی کوردستان بە چەپکە گوڵەوە بۆ سەر گۆڕی شەهیدان هەڵیانگرتووە، کاك غەفووری مەلا تاهیر دەناسیتەوەو دروشمێکیش دوو کچی کورد هەڵیانگرتووە: نەجاتی فایەقی کاکەمینو موبەجەل ئەدیب عارف (بابان)، کە پورزای یەکترن.

یەکێك لە پیاوە ناسراوەکانی شار دوو کوڕی لەناو حیزبی شیوعیدا چالاك بوون، هەر بە هۆی ئەوانەوە خوشکیشیان بووبووە نوێنەری کچان لە یەکێتیی قوتابیاندا*و چالاکیی دەنواند. دیارە ئەمەی پێ خۆش نەبوو لەبەر ئەوە هەموویان- یا هەر کچەکەی بۆ خوێندن ناردە ماڵە خزمێکیان لە کەرکووك. شیوعیەکان بە دووای ئەمەدا دروشمی (بڕووخێ ئیرهابی عائیلی)یان هێنایە ناوەوە کە ئێمەی سەر بە پارتی بە گاڵتەوە لێی ئەدواین. ڕاستە بۆ ئەوە نەئەبوو لە خۆپیشاندانەدا بووترێتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا زۆر کەس لەو سەردەمەدا بەر ئاگری ئەو چەشنە ئیرهابە دەکەوت.

---

*ئەو سەردەمە هەر وشەی قوتابیو قوتابیان بەکاردەهات لە جێی (طلاب) و (اتحاد الطلبة).. هتد، حیزبایەتی زمانەکەشی دابەش نەکردبوو.

لە شوێنێکیتردا هەڵوێستێکی مەردانەی ئەو پیاوە ناسراوە لە بەرگری لە کوڕەکانیو لە هەڵوێستی تێکۆشەرانەیان دەگێڕمەوە.

## پارتیو شیوعی:

نازانم پێوەندیی پارتیو شیوعی –یا تەحروور- لە پلەی ژووروو واتە سەرکردەییدا لەو ماوەیەدا چۆنو چەند بوو، چونکە لەو جێگەیەدا نەبووم کە ئەوە بزانم، بەڵام وەك کەسێکی ناوجەرگەی خەباتو هاوکاریو ناکۆکی دەتوانم بڵێم –لە مانگرتنو خۆپیشاندانەدا پێکەوە بووین، یەك بووین، هیچ دروشمێکی دژ بە یەکمان نەبوو. بەڵام لە ورتەورتو موناقەشەی چایخانەکاندا هەر لە هەڵچووندا بووین.

مناقەشەی سەرەکیمان لەسەر ئەوە بوو کورد ئوممەیە یا ئوممە نییە، واتە بە پێی پێناسەکەی ستالین کە هەردوولا باوەڕیان پێی بوو و لاریان لێی نەبوو کورد (گەل)ە یا دەبێت بە (ئوممە)، (nation) یا نابێت.

ئەم موناقەشەیە لە کۆڕو کۆبوونەوەیەکی زانستیدا تا ئێستاش باسکردنیو سەلماندنی ئەنگ نییە، بەڵام کە چووە ناو خەڵكو سەر جادەو ناو چایخانە ئەوا جۆرێکیتری لێدێت، وەك لێی هات.

ستالین دەڵێت: "نەتەوە کۆمەڵێکی جێگیر (ثابت)ە لە خەڵك لە ڕێڕەوی مێژوودا پەیدابوون، زمانێکی هاوبەش (مشترك)، زەوییەکی هاوبەش، ئابووریيەکی هاوبەش، سایکۆلۆژیەتێکی هاوبەشیان هەبێت کە لە کەڵچەری هاوبەشدا ڕەنگ بداتەوە"

پارتییەکان لایانوابوو کە ئەم مەرجانە هەموو لە کورددا هەن لەبەرئەوە "نەتەوە"ن. هەرچی شیوعییەکان بوو ئەوا دەیانووت" ئابووریی هاوبەش" نییە، چونکە کوردستان دابەشکراوەو سنوور نییە.. هتد. جاروبار بەرەو سایکۆلۆژیش دەهاتن.

من لەو سەردەمەدا هیچ شتێکی نووسراوی شیوعیەکانم لەو بارەیەوە نەدیوە. بەڵام پارتی بڵاوکراوەیەکی ناوخۆی دەرکردبوو موناقەشەی مەسەلەکەی کردبوو، نازانم کێ نووسیبووی. ڕەنگە مامۆستا هەمزە بێت. بەڵام وەك دێمە سەری باسی ئابووریەکە ئەوە نەبوو کە قەناعەت بە هەموو کەسێك بکات.

ڕۆژێك لەو سەردەمەدا کە تا ڕادەیەك ئازادی هەبوو. مامۆستای جوغرافیامان ڕەحمەتی کەمال ئەحمەد سەعید (کەمالی ئەحمەد بەگی سەعید بەگ) لە دەرسدا ئەم مەسەلەیەی هێنایە ناوەوە. پۆلەکەی ئێمە (سێی ناوەندی) دوو لق بووین. هەموو ئەوانەی دەمیان لە سیاسەت ئەدا لە لقەکەی ئێمەدا سەر بە تەحرور بوون. تەنیا کاك مەحموود محەمەد قادر (مەحموودی حەمەی لەیلێ) و من سەر بە پارتی بووین. هەمووومان قسەکانی سەر جادەو چاپخانەکانمان بە هێمنی دووبارە کردەوە. چاوەڕێی بووین مامۆستا خۆی شتێك بڵێت، هیچی نەووت. هەر ئەوەندە ووتی: دەرسی داهاتوو بە نووسین هەریەکە شتێك بێنن. ئێمەش هەردووکمان هاتین، بڵاوکراوەکەی پارتیمان نوسیوەو کاك مەحموود هەر بە عەرەبی خوێندیەوە. برایانی تەحرور هیچیان نەنوسیبۆوە. بەو جۆرە دەرس بڕایەوەو ئێمە بردمانەوە. (هەر لام سەیرە چ ئەوە یا جیلێك بووین- ئەمە لە پۆلی سێیەمی ناوەندیدا بوو).

بڵاوکراوەکەی پارتی ئەوەندەی بیرم بێ شتی باشی تێدا بوو، بەڵام بۆ مەسەلەی ئابووریی هاوبەش لەوە دووابوو کە بازرگانی لە نێوان قەڵادزێو سەردەشت، زاخۆو جزیرەدا زیاترە وەك لە نێوان ئەم دوو شوێنەو بەغدادا.. هتد.

دوواشت لە ڕووی مارکسیەوە مامۆستا عەزیز شەریف لە نامیلکەی (القضیة الکردیة)دا چاری ئەم مەسەلەیەی بە بۆچوونی مارکسی کردووە. (ئابووریی هاوبەش) ئەوەیە کە لە بەشەکانی وولاتدا، خۆتێرکردن یا بڵێین (ئیکتیفای زاتی) نەمابێو بەشەکانی وولات پێویستیان بە یەك بێتو ئەگەر

ئەم سنووره نەما کوردستان دەتوانێت ئابووریی بکات بە یەك. جاران دەوڵەتیش یەك بووایە (واتە پێش میرنشینەکان) هەر ئابووری بە یەك بوون زەحمەت بوو.

لێرەدا نامەوێ بچمە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی زانستیی ئەو مەسەلەیە (کە لە کتێبێکی هێشتا چاپنەکراومدا باسم کردووە). بەڵام لە باسی چوونە ناو خەڵکی ئەو مەسەلەیەدا شتێکی خۆش بڵاوبووبۆوە، نازانم ڕاست بوو یا نا؟

دەیانووت: لە باخی تەکیە (باخی فەرەجی حەمە مراد)، ڕەحمەتی ئەحمەدی حەمەی ئەولی داسێکی بە دەستەوە دەبێت، لەگەڵ شیوعییەکدا دەکەونە ئەم باسە، کاك ئەحمەد لە مانا زانستییەکەی (nation) یا (امة) ناگات. وا دەزانی برای شیوعی دەڵێ کورد ئۆمەت نییە. لە قسەی سلیمانیدا ئۆمەت مانای (مرۆڤ یا ئینسان)ە. کاك ئەحمەد داسەکەی دەخاتە سەر ملی کابراو دەڵێ: دە بڵێ کورد ئۆمەت نییە، ئەویش دەڵێت: بابە وەڵڵا ئۆمەتە، بیللا ئۆمەتە.. وازبێنە.

لە ساڵانی پەنجادا، لە بەندیخانە هاوڕێ جەمال حەیدەری (شەهید) دەرسی پێ دەوتین. ئەم باسەم هێنا کایەوە، ووتی:

-کاکە، لە دەرسێکیتردا ئەم باسە دەکەین. بەڵام ئەوەی کە کورد نەتەوە نەبێ، نە ڕای حیزبەو نە هیچیش لەو بارەیەوە نووسراوە، هاوڕێ فەهد لە چەند شوێن ووشەی (الامة الكردية)ی بەکارهێناوە. ئەو جەشنە وورتەوورتە هەر لە سلیمانی هەبوو و لە هەولێر شتی وامان نەوتووە.

وەك ووتم: لە خۆپیشاندان‌و مانگرتندا یەك بووین. گەورەترین خۆپیشاندان ئەوەی هێرش بردنە سەر ڕادیۆی پێوەندیی بەریتانی بوو. (علاقاتی بەریتانی).

لە بەغدا باڵیۆزخانەی بەریتانی بنکەیەکی بە ناوی پێوەندییەوە دانابوو، ئاهەنگی دەگێڕا، خەڵکی دەعوەت دەکرد. بە کوردیش لە سەرەتادا بڵاوکراوەیەك

کە دووایی بوو بە گۆڤارێکی بە ناوی "دەنگی گێتیی تازە"وە دەردەکرد. گۆڤارەکە بۆ پڕوپاگاندەی جەنگ‌و بەریتانیا بوو، بەڵام کە ئێستا سەیری دەکەین، خزمەتی زۆری زمان‌و ئەدەبی کوردیشی کردووە.

لە سلێمانی ئەو سەردەمە ڕادیۆ لە ماڵان کەمبوو، هەندێك چایخانە ڕادیۆیان هێنابوو. پێشتر لە چایخانەکان کە زیاتر قاوەخانەیان پێدەووتن قەوان یا گرامەفۆن هەبوو.

پێوەندیی بەریتانی لە سەرەتاوە لە دوکانێکدا بوو کە جێگەکەی ئێستا بەشێکە لەو مەیدانەی بەردەرکی سەرا کە پەیکەری شێخ مەحموودی تێدایە، پاشان چووە ماڵێك لەولای گەڕاجی فەرەج ئەفەندی‌یەوە بەرەو مزگەوتی گەورە.

لەو بنکەیە دەستگایەکی (ئیمپرێر فایەر) و میکرۆفۆنێك دانرابوو، بڵندگۆکانی (مکبرە) لە بەر دەرکی سەرا بەسەر ئەو چەتری پۆلیسەوە بوو کە لە ناوەڕاستی مەیدانەکەدا بوو. هەموو ئێوارەیەك خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆدەبوونەوەو گوێیان لە دەنگوباس‌و لێکۆڵینەوەی سیاسی‌و گۆرانی دەگرت. گۆرانی‌یەکان هەندێك لە قەوانەوە دەخرانە سەر ئەو ئامێرە، چونکە ئەوسا (ڕکۆردەر- مسجل)ە لای ئێمە نەبوو، هەندێك جاریش، ناوبەناو گۆرانی بێژەکانی شار یا هەندێك قوتابیی ناوەندی بە کۆمەڵ گۆرانیان تێدا دەووت. لە سەرەتادا چونکە تازە بوو و ئەو خەڵکەش کە ڕادیۆی نەبوو، بۆ گوێگرتن کۆدەبوونەوە. بێگومان ئەمانە لە چینی هەژارو توێژی ناوەڕاست‌و قوتابی بوون. لە ساڵانی سەرەتادا شتێکی ئەوتۆ نەدەووترا کە دڵی کەس بیەشێنێت. وەك بیرم بێت، ئەمە لە ساڵانی کۆتایی شەڕەوە دەستی پێکرد کە ئێمە هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتایی بووین. جاروبار شیعریش هەر بەو ڕێبازەدا دەخوێندرایەوە:

هیتلەر دەیووت ئاسیا ئەگرم

وا ئاسیای گرت دەستی بە گونم

بەڵام پاش ڕاپەڕینی کانوون ئەو ئێستگەیە ڕێگەیەکیتری گرت. هێرش بۆ سەر بزووتنەوەی نیشتمانیی عیراقی، بەرگری لە پەیمانەکانی ئینگلیز لەگەڵ عیراقدا. هێرش بردنە سەر سۆڤێتو جنێودانو باسی "سمێڵە دەسکە کەومرییەکانی ستالین".

وا بزانم لە مانگی نیسانی ١٩٤٨دا بوو بەیانی لە قوتابخانە کاك عومەر کەریم عەزیز یەکەیەکە هەموو یا هەندێك لە کەسانی سەر بە پارتیی ئاگادار کرد کە عەسر کۆبوونەوە لەبەر ماڵی موتەسەریفە، خۆپیشاندان ڕوو ئەکاتە بەردەرکی سەرا، لەوێوە بەرەو مزگەوتی گەورە، لەو ڕێگەیەدا ئەو بنکە پیسەی ئینگلیز دەسووتێنین. بەڵام ئەمەی دوایی بە کەس مەڵێن.

من نازانم –پارتیو تەحرور چۆن ڕێك کەوتوون، بەڵام دیاربوو خۆپیشان هەر دوو لای تێدابوو. بەو ڕێگەیەدا کە ووترا ڕۆیشتین، کە گەیشتینە بەردەرکی سەرا بڵندگۆکە دەنگی دەهات. چەند کەسێك سەرکەوتن تەلەکەیان پچڕاند، بڵندگۆشیان شکاند. کە گەیشتینە لای بنکەکە هێرش برا. دیاربوو پۆلیس پێی نەزانیبوو، چونکە یەك پۆلیسیش لەبەر دەرگا یا بۆ پاراستن لە ناوەوە نەبوو.

بەڕێوەبەری ئەو بنکەیە عەلیی حاجی مەلا شەریف بوو. لە سەرەتا ئەحمەد ناوێك کە فەرمانبەر بوو و ئێستا نەماوە بێژەر بوو، دوایی شێخ ڕەزای گوڵانی بوو. بەڵام لە کاتی ئەم هێرشەدا حەمەبۆر بوو. شێخ ڕەزا لە پێشەوەی خۆپیشاندەرانەوە بوو. گڕ لە خانوو و کاغەز بەردرا، کەلوپەل فڕێدرایە حەوشەو ئاگری تێبەردرا. بەڕێوەبەر لە پشتەوە یا سەربانەوە ڕایکردبوو. چونکە ئەو کاتە ماتۆڕێکی هەبوو بەوە دەگەڕا ماتۆڕەکە فڕێدراو سووتێنرا.

زۆریان لە بێژەرەکە دا، بە لەشی خوێناوییەوە لێی گەڕان بەرەو خەستەخانە ڕابکات.

ئامۆزایەکەم کە ئەو کاتەش لە حیزبی شیوعیدا بوو ئەوسا بۆی گێڕاینەوە کە حیزب بە ناوی سەردانەوە ناردوێتی بۆ لای ئەو بێژەرە کە زۆر دۆستی بوو، ئەویش پێی ووتبوو: کاك قادر ئەزانم بۆ سەردانم نەهاتوویت. بۆ ئەوە هاتوویت بزانیت ناوی خەڵکم بردووە یا نا. من ساڵەهای ساڵ نیشتمانپەروەریم کردووە، حەپسی‌و ئاوارەییم دیوە. هەڵەیەکم کرد نایکەم بە دووان. هەمووتانم ئەناسی، بەڵام لای پۆلیس ووتوومە کەسیانم نەناسیوە.

بۆ سبەینێ منداڵان دوو داریان خستبووە ئاسنی تایە سووتاوەکەی ماتۆڕەکەوەو لەسەر شان هەڵیانگرتبوو و خۆپیشاندانێکی منداڵانەی سەیریان پێ ڕێکخستن. کە منداڵەکان گەیشتنە بەر چاپخانەی قوتابیان (سەرسووچی شەقامی مەولەوی بۆ مزگەوتی گەورە) یەکێك کە خەڵکی سلێمانی نەبوو بە جاسووسی ناردبوویان چووە سەر سندوقێك‌و کەوتە خوتبەدان بۆ منداڵان‌و کۆتایی بەوە هێنا (بە دڵمە بڵێن.. دۆڵی دڕاو) منداڵان خەریکبوو هاوار بکەن. بەڵام ڕەحمەتی کاك ئەحمەدی حاجی ساڵحی قاسم (کە یەکێك بوو لە لێپرسراوانی قوتابیان) چووە ناویانەوەو سوپاسی هەستی پیرۆزی منداڵانی کردو ووتی: ئیتر بڵاوەی لێ بکەن، تا پیاو خراپ سوود لەم کارەتان نەبینێ. سەیر ئەوەیە یەك منداڵ لەو ناوە نەما. ووترا کە لە سووتاندنی علاقاتدا چەند کەس بریندار بوون، بەڵام لە ڕاستیدا شووشەی پەنجەرە شکاو دەست‌و دەم‌و چاوی هەندێکی ڕووشاندبوو.

## هەڵبژاردن:

پارتی‌و تەحرور لە هەڵبژاردندا لە یەکتر جیابوونەوە. حکوومەتی محەمەد سەدر گوایە بۆ بەجێهێنانی داخوازی گەل، پەرلەمانی کۆنی هەڵوەشاندەوە، کە حکوومەتی نووری سەعید بە هەڵبژاردنێکی ساختە هێنابووی. دەستکرا بە کار بۆ هەڵبژاردنی تازە.

ئەو سەردەمە تا ساڵی ١٩٥٣ هەڵبژاردن کە پێیان دەووتن. (هەڵبژێرراوی پلەی دووەم- منتخبی ثانوي). ئەو هەڵبژێرراوانە، (نوێنەر- واتە: نائیب)یان هەڵدەبژارد.

پارتی‌و تەحرور کەوتنە خۆ، حکوومەتیش هەر زوو بۆ ساختەگەری کەوتبووە کار. شاعیرێکی میللیی ئەو کاتە کاك حەمەی مەلا حسین (بەرگدروو- کە ئەم ساڵ ٢٠٠٠) کۆچی دوایی کرد لە کۆبوونەوەکاندا شیعرەکانیی ئەوا دەست پێدەکرد:

خۆزگە ئەمزانی لە لایان، ئینتیخاب مەعنای چی‌یە
ڕەنگە وا بزانن سێ بازەو دوور بە دوور بۆی هەڵئەچن
کۆتایی ئەم پارچە شیعرە ئەم دێڕە بوو
خائینان ئەمڕۆ بە جارێ شەرمەزارو مل کەچن
قوڕ بەسەر گەورەو بچووکیان تازە بۆ کوێ دەرئەچن

بۆ هەڵبژێرراوی پلەی دووەم، پارتی‌و تەحرور لیستەی جیاوازی خۆیان هەبوو. هەرچی حکوومەتە لیستەی نەبوو، دیاربوو پیلانی خۆی دانابوو و دڵنیابوو. سەرپەرشتکەری گشتیی هەڵبژاردن کە پێیان دەووت (حاکمی هەڵبژاردن)، قایمقامی مەرکەزی سلیمانی بوو. کە ئەو کاتە شەهید شاکیر فەتتاح بوو.

شەهید شاکیر فەتتاح بە بیر قەومی بوو، دەبوو لە پارتی‌یەوە نزیك بێت، بەڵام لە شاردا دەنگی دایەوە کە زۆر بە پاکی‌و بێ‌لایەنی لە نێوان پارتی‌و تەحروردا هەڵبژاردنی بەڕێوە برد. دیارە نە پارتی‌و نە تەحرور حیزبی ئاشکراو ئیجازە پێدراو نەبوون ئەو لیستانە هەر بە ناوی شەخسەکان خۆیانەوە بوو. شەهید شاکیر فەتتاح دەچووە سەر هەر سندووقێك لە مزگەوتەکان دەیووت: با دوو شافیعی‌و دوو حەنەفی بێن دانیشن. (ئەم هەڵوێستەی کاك شاکیر فەتتاح یەکێك بوو لەو هۆیانەی لە ڕاپەڕینی تشرینی دووەمی ١٩٥٢دا ناوی ئەو لەو لیستەیەی وەزارەتەدا بێت کە حیزبی شیوعی لە سەر جادە دروستیکرد). لە ئەنجامدا لە لیستەی پارتی تەنیا سێ کەس دەرچوو. لە لیستەی تەحرور زیاتر لە هەشتا کەس. ئەمە لە شاردا، هەرچی لە ناحیەکانی

سەر بە فەزای مەرکەزە ئەوە حکوومەت وای کردبوو کە هەمووی خەڵکی سەربەو دەرچێت‌و پێش هەڵبژاردنیش کۆمەڵێك لە هەڵبژێرراوەکانی پلەی دووەم بگیرێن، بەو جۆرە نوێنەرانی حکوومەت دانران. کە عەلی کەمال‌و ماجید مستەفا بوون.

بۆ ئەم هەڵبژاردنە پارتی لە سلێمانی کەسی تەرشیح نەکردبوو، بەڵام حیزبی شیوعی دوو کەسی تەرشیح کردبوو. یەکێکیان ڕەحمەتی مەحموود فەهمیی فەقی محەمەدی هەمەوەند بوو کە ئەو کاتە ئەندامی حیزبی شیوعی بوو، دووەم پارێزەر شەریف ئەلشیخ بوو کە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئەلئەساس- الاساس) بوو و گوایە لەسەر داوای هەڵبژێراوەکانی پلەی دووەم هاتووە. مەحموود فەهمی لە کۆبوونەوەیەکدا لە حەوشەی قوتابخانەی ئامادەیی (وابزانم ئێستا قوتابخانەی شێخ مەحموودە)، کە ئەوکاتە زۆر گەورە بوو و شوێنی یاریی فتبۆڵ بوو، بە ئامادەبوونی سەدان یا هەزاران کەس بەرنامەی خۆیی بۆ پەرلەمان پێشکەشکرد. کە بێگومان بەرنامەیەکی پێشکەوتنخوازانە بوو و ئێستا بەندەکانیم لەبیر نییە. هەرچی (شەریف ئەلشیخ)ە ئەوە خەڵکی سلێمانی نەیاندی.

لە مقۆمقۆی زۆر لە خەڵکی شاردا، بە تایبەتی ئەوانەی سەر بە پارتی بوون. دەیانووت: حیزبی شیوعی کرێکارو فەللاحی نییە وا ئاغایەك تەرشیح دەکات. یا پیاوی کوردیان نییە، پارێزەرێك لە (راوە)وە بێنن.

**قسەی خۆش:**

لە پەراوێزی ئەم هەڵبژاردنەدا دوو قسەی خۆشم پێیە: کێشەی نێوان پارتی‌و تەحرور هەر لە پلەی یەکەمدا بوو، هەر لایە لەسەر پارچە کاغەزێ ناوی مورەشەحەکانی گەڕەکی خۆیی نووسیبوو دەیدایە دەست خەڵك تا هەڵیانبژێرن، لە هەر گەڕەکە ٥-٦ کەس بوون یا زیاتر. لە خانەقای مەحوی نەبێت کە سندووقی هەڵبژاردنی چوارباغی تێدابوو لە هیچ شوێنێك

نەگەیشتە پێك دادان، لەوێ هەر دوو لا کەوتنە لە یەك دان. لەو لەیەکدانانەدا تەنها یەکێك لە برایانی سەر بە پارتی "عەبدوئاغای شاڵی" سەری شکا، برایانی تەحرور دەیانووت، بە گۆچانەکەی مەلای خەیاڵ سەری شکاوە. برینەکەی شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بە خۆپیشانداندو لەسەر شان بەرەو نەخۆشخانە برا. لە نزیك بەردەرکی سەرا کاك محەممەد ئەحمەد تەها خوتبەیەکی دا کە هێرش بوو بۆ سەر نوێنەرەکەی تەحرور. ئێوارە حکوومەت چەند کەسێکی گرت. لە بەغداد لەو هەڵبژاردنەدا دروشمێك هەبوو "لا انتخابات حرة والاحرار في السجون" واتە: "تا ئازادیخواهان لە بەندیخانەدا بن هەڵبژاردن سەربەست نىیە". گیراوەکانی ئێمە هەریەك ڕۆژ مانەوە. مەلای خەیاڵ کە کوێرێکی زۆر وریاو زیرەك بوو شتی بلیمەتانەی لێ ئەگێڕنەوە، لەناو گیراوەکاندا بوو. دەیانووت: هەر هەستی بە نزیکبوونەوەی پۆلیس‌و کاربەدەستانیانی دەکرد لەپەنجەرەی گرتووخانەوە، دەچووە بەر پەنجەرەکەو هاواری دەکرد:

"لا انتخابات حرة ومەلای خەیال في السجون" واتە: تا مەلای خەیاڵ لە بەندیخانەدا بێت هەڵبژاردن سەربەست نابێ.

دووەم قسە: "کەریم خان" کە پیاوێکێ ناسراوو قسەخۆشی شار بوو، لە سەرپەرشتکەرانی هەڵبژاردن بوو. لە خانەقای مەولانا کە سندووقی دەرگەزێنی لێبوو- تاقە گەڕەکیش بوو تەرشیح کراوانی پارتیی تێدا دەرچوون. کابرایەك دێت بە کەریم خان دەڵێت: ئاغام کێ بنووسم، ئەویش دەڵێت: بنووسە، سەعید ئاغای کوڕم، ئەمین ئاغای حاجی مەلا محێدین.. هتد. کابرا لەولاوە ناوەکان دەنووسێ، کەریم خان سەیردەکات شیوعی‌یەکانی نووسیوە. کاغەزەکەی لە دەست وەردەگرێت‌و نایخاتە ناو سندووقەوە، کابرا بانگ دەکات، ئاوەرە هەتیو، ئەویش دەپرسێت: قوربان چی دەڵێیت: کەریم خان دەڵێت: کاغەزەکە نوقسانە. دەڵێت بۆچ، پێنج کەسم نووسیوە، دەڵێ: نەخێر، ناوی دایکت‌و ئەنکت

لەبیرچووە. تۆ هەموو هەرچیو پەرچیی گەڕەكو ژنانیی گەڕەکت نووسیوە، هەر ئەوان ماون.

ئەم "کەریم خان"ـەیە کە جنێوی پیسی بە دایکی ئەو کەسە داوە کە خەبەری ناخۆشی ئەداتێ.

**لە کەناردا:**

لە کەناری باسی ڕاپەڕیندا هەندێك شتم دێتەوە یاد کە دەبێت بنووسرێن:

١-لە هۆسەکانی ئەو سەردەمەی بەغدا ئەمەم لەبیر ماوە:

الله اکبر یا عرب          شبانکم قتلوها

المعرکة فوق الجسر          وکت الظهر سووها[11]

٢-کۆنگرەی سیباع (مؤتمر السباع)

یەکێك لە دەستکەوتەکانی دووای ڕاپەڕین بەستنی کۆنگرەی قوتابیانی عیراق بوو لە بەغدا، کۆنگرە ڕۆژی ١٤ی نیسانی ١٩٤٨ لەو مەیدانەدا بەسترا کە دەکەوێتە نێوان شەقامی ڕەشیدو شەقامی غازییەوە[12] و پەیکەری چەند شێرێکی تێدایە لەبەر ئەوە بە مەیدانی شێران (ساحة السباع) ناودەبرێت. ناوچەکە وا باو بوو کە ناوچەی کرێکارانەو کرێکاری ئەوێو کرێکاری هێڵی ئاسن (شەمەندەفەر) هاتوون کۆنگرەکەیان لە پۆلیس پاراستووە. لە مەودووا لە پاش ساڵی ١٩٤٩، لەناو دەستە جیابۆوەکان لە حیزبی شیوعیدا دەووترا: دەبوو سەرکردەیی حیزب کۆنگرە بۆ کرێکاران ببەستیو قوتابیان بیپارێزن.

لەم کۆنگرەیەدا بۆ یەکەمجار بە ئامادەبوونی نوێنەرانی هەموو شارەکانی عیراق، لەوانەی سەر بە بەرەی دیموکراتی، واتە: هەموو حیزبە دیموکراتییەکانی عیراق بوو، دروستبوونی (یەکێتیی گشتیی قوتابیانی عیراق) ڕاگەیێندرا. کە ئەمە دووا پلەی ئەو هەوڵانە بوو کە لەوەپێش بۆ دروستبونی ئەو ڕێکخراوە درابوو.

سەرۆکی کۆنگرە نوێنەری کۆلێجی پزیشکی قوتابیەی شێخ نووری بوو. قوتابیە تا کۆتایی سامناکی ژیانی تێکۆشەرێکی ئازاو کوردێکی دڵسۆز بوو.

شاعیری گەورەی عەرەب محەمەد مەهدی ئەلجەواهیری پارچەی بەناوبانگی خۆی (یوم الشهید)ی خوێندەوە. بچووکترین نوێنەرو خەتیب لە کۆنگرەدا نوێنەری ناوەندیی کۆیە (جەلال حیسامەدین تاڵەبانی) (مام جەلال) بوو، کە ئەندامی پارتی دیموکراتی کورد بوو.

لە شارەکان لیژنەی یەکێتیی قوتابیان دروستکران، هەندێك نوێنەری هەڵبژێرراو پارتیو هەندێك شیوعی بوون، بەڵام لە سلێمانی شیوعی‌یەکان زیاتر بوون. سەرۆکی هەموو یەکێتی‌یەکە کەمالی میرزا کەریم بوو.

**هونەر:**

کە ئازادی بوو ماوەو توانستی ئەدەبو هونەر بەرز دەبێتەوە. لە کوردستان -بە تایبەتی سلیمانی دەمێك بوو هونەر نواندن -تەمسیل- هەبوو، لە باسی قوتابخانەدا هەندێك لەو جۆرە چالاکی‌یانەی قوتابخانە دووام. بە بیرەوەریی من ئەو نواندنەی -لە پێناوی نیشتماندا- کە بۆ یارمەتیی خەڵکی پێنجوین، کە تووشی گومەلەرزە بوون، ساڵی ١٩٤٦، لە قوتابخانەی گۆیژە، بەرزترین پلەی ئەو هونەرە بوو. ئەکتەری سەرەکی ڕەفیق چالاك بوو.

بەڵام پاش ڕاپەڕینی کانوون، گەورەترین چالاکیی ئەم هونەرە پێشاندانی شانۆگەریی "تێکۆشانی ڕەنجبەران" بوو. شانۆنامەکە تێکەڵکردنی دوو چیرۆکی "کەرەلۆتیی مەنۆرچەر" و "کوێرەوەری"ی مامۆستا برایم ئەحمەد بوو، کاك ئەحمەد غەفوور -بێ ناوبردنی لەسەر شانۆ- خستبوویە قاڵبی شانۆنامەوەو کۆمەڵێك شیوعی دەیاننواند، قارەمانی سەرەکی هەر ناوی "مەنۆچەر" بوو، ڕەووف یەحیا زۆر هونەرمەندانە بوو بوو بە مەنۆچەر. کە شانۆنامەکە تەواو ئەبوو، عەبدولقادری مەلا ئەحمەد (ئامۆزام) پارچە شیعری "دڵداری ئەو گوڵێکم"ی بە ئاوازی خۆیەوە -کە شیعری خۆیشی بوو بە دەنگە خۆشەکەی دەووت:

خۆزگە خوا بیکردایە
بەشەر وەك یەك بژیایە
بەرزی‌و نزمی نەمایە
ئەوسا زۆر بە ئاسانی
بێ ترسی بەرگ‌و نانی
بە خۆشی‌و کامەرانی
ئەو نەوگەڵەم ئەهانی

نووسینی برایم ئەحمەدو نواندنی شیوعی‌یەکان بۆ نزیکەی مانگێك هەر بە هاوکاریی‌و نزیکیی پارتی‌و شیوعی دەزانرا.

**شێخ لەتیف:**

هێشتا نە هاوین هاتبوو، نە بووبوو بە پایزو گەڵارێزان، تا گەڵا بوەرێ‌و بێ بە ماتەم، کەچی حکوومەت‌و کۆنەپەرستان فرسەتیان بینی‌و هاتنەوە مەیدان. بە بیانووی ئەوەوە کە سوپاکانی عەرەب- بە سوپای عیراقیشەوە ڕوویانکردبووە فەلەستین بڕیاری دانانی حوکمی عورفی درا. دانانی ئەو حوکمەو دادگا عەسکەری‌یەکانی بۆ پاراستنی پاشکۆی سوپای عیراق نەبوو وەك حوکومەت ئیدیعای دەکرد. بەڵکو بۆ هێرش بردنە سەر بزووتنەوەی نیشتمانی‌و تۆڵە سەندنەوە بوو لە بەشدارانی ڕاپەڕینی کانوون، وەزارەتی محەمەد سەدر وازیهێناو وەزارەتی موزاحیم پاچەچی هاتە سەرکار. هەردیی شاعیری ناودارمان وەسفی ئەو دەورەی باش کردووە کە دەڵێ:

ئاگری شینی* ئیرهابی عورفی
شاڵاو دەهێنێ مەکەی بۆنی‌یە

---

*من بە ئاگری شینم لەبەرە. ئەمەم لا ڕاسترە وەك گۆڤارێك کردبووی بە (ئاگری سوور). جیاوازی‌یەکەش لە مانادا دیارە. نازانم مامۆستا هەردی دەڵێ چی؟

برسێتی جۆری پێی لێ هەڵبڕی
لەگەڵێ ماڵا نانی جۆ نییە
هەرکەسی شکوای حاڵی دەربڕی
یا شیوعییە یا سەهیۆنییە
بەڵام لە کۆتاییدا دەڵێ:
حارسی تەختی لەندەنی ڕزیو
باش بزانە گەل ناگەڕێتەوە
ئەو گەلەی لە خەو ڕاستی بۆتەوە
نابەزێ لە ڕێی ئەم ژیانەدا
قاچی ڕۆڵەکەی گەر بە کۆتەوە
داڕزی لەناو بەندیخانەدا[١٤].

لەم لاوە لە سلێمانی خەڵك گرتن دەستی پێکرد، گیراوان دەبرانە کەرکووك. لەسەر بانی سەراو چەند شوێنی تر تورەکە گڵێ هەڵچنرابوون و ڕەشاشیان لەسەر دانرابوو. لە زووەوە لە موناقەشەو وورتە وورتی نێوان پارتیو شیوعییەکاندا دەووترا: پارتی حیزبی دەرەبەگە. چونکە مەلا مستەفا سەرۆکی بوو و شێخ لەتیفو کاکە زیاد جێگری سەرۆك بوون. پارتیش هەر لەو سەردەمەدا بەیانێکی دەرکردبوو، بە دەست خەت بلاْودەکرایەوە، ناوی هەموو خاوەن موڵکی وولاْتی تێدابوو و هەموویان بە دەرەبەگ ناونرابوون، لەناو ئەوانەدا چەند کەسی تێدابوو کە خۆیان یا کوڕیان سەر بە شیوعی بوون.

شێخ لەتیفی شێخ مەحموود هەر لە قوتابێتییەوە خەریکی کوردایەتیو حیزبایەتی بوو، زۆر کەس هیوای ئەوەیان پێی بوو کە جێگەی باوکی بگرێتەوە. بەڵام ئەویش لەو شەڕە دەنووکە حیزبایەتییە ڕزگاری نەبوو، لەسەر ناکۆکیی ئەو لەگەڵ فەللاحەکانی عەربەتدا[١٥] شیوعی کەوتنە خۆپیشاندان، هەموو هاوارو دروشم دژی شێخ لەتیف بوو، تەنانەت زۆر قسەی

سووک‌و ناڕەوا دەکرا. خۆپیشاندان لە بڵاوبوونەوەدا بوو یا بڵاوبووبۆوە کە تەقە دەستی پێکرد. زوربەی خەڵک لایوابوو کە لە سەربانی سەراوە تەقە دەکرێت. کەچی وەک دەرکەوت شێخ لەتیف خۆی یا پیاوەکانی بە ئاسماندا تەقەیان کردووە. ڕاستی‌یەکەش وەک ساڵانی دووایی لە کاک حەسەنی قزڵجی‌و کاک عەبدوڕەحمان زەبیحیم بیست وابوو:

کۆمەڵێک لەوانەی لە جمهوریەتی کوردستاندا بەشداربوون، بە کوردی ڕۆژهەڵات‌و باشوورەوە لە لای شێخ لەتیف خۆیان شاردبۆوە، چ لە سلێمانی لە ماڵی خۆیان -کە پۆلیس لەو چەند ساڵەدا توخنی نەدەکەوت یا لە سیتەک، شێخ لەتیف کە لە هەموو ژیانیدا حەزی بە زۆر لە چەشنەکانی ڕبواردن بوو، زۆر ئێوارە ئەو برادەرانەی هەڵدەگرت‌و دەچوونە بناری گۆیژە، کە ئەوسا لە شارەوە دوور بوو و زۆر لە شار فێنکتریشە. زەبیحی‌و قزڵجی ئەو ئێوارەیە لەگەڵی دەبن خواردنەوەیان لێ دەبڕێ، دەیانەوێ یەکێک بچێ لە شارەوە بۆیان بهێنێت. شێخ لەتیف سوور دەبێ لەسەر ئەوەی کە خۆی بچێت، سواری جیپەکەی دەبێت‌و دوو کەسیشی بە چەکەوە لەگەڵ دەبێت، کە دەگاتە ناو شار خۆپیشاندەران لە بڵاوبوونەوەدا بوون، کۆمەڵێک منداڵی وورد کە لە هاواری خۆپیشاندانەکە کەوتبوون هەر لەسەر جادە بوون‌و وەک هەموو جار شێوە خۆپیشاندانێکیان بۆ خۆیان دروست دەکرد. شێخ لەتیف دەکەوێتە ناویانەوە، دووای ئوتومبیلەکەی دەکەون‌و دیارە قسەی سووک دەکەن، شێخ لەتیف نیوە مەست، خۆی سوێندی دەخوارد کە هەر بۆ گاڵتەو بینینی ڕاکردنیان بە ئاسمانەوە تەقەی کردبوو، دیارە دوو چەکدارەکەش هەر ئەوەیان کردبوو، منداڵان بڵابوونەوە، نە کەس کوژراو نە کەس بریندار بوو، بەڵام دوکان داخراو خەڵک چۆوە ماڵی خۆی، بۆ سبەینێ ڕاستی بۆ خەڵک دەرکەوت.

زەبیحی‌و قزڵجی دەیانووت: کە گەڕاینەوە لای ئێمە، ئێجگار زۆر سەرزەنشتمانکرد هیچی نەووت.

شێخ لەتیفی ڕەحمەتی دەیووت- ئەوە یەکێك بوو لەو جارە کەمانەی کە باوکم لێم زویر بێت، ماوەیەکی بوێت دڵی بهێنمەوە جێی خۆی. شێخی گەورە بۆی نووسیبوو، ئێمە ژیان‌و گەورەییمان بە خەڵکی شاری سلێمانی‌یەوەیە، ئێمە خەڵکی شارەکەی خۆمان چیمان لەگەڵ بکەن وایان ڕەفتار لەگەڵ ناکەین.

هەر لە باسی ئەو جارانەدا شێخ لەتیف بە شێوە خۆشەکەی خۆی باسی زویربوونێکیتری شێخی گەورەی بۆ گێڕامەوە کە بە نوسینی چوارینە شیعرێك دڵی هێنابۆوە جێی خۆی. بە داخەوە نە هێشتی ئەو شیعرانە بنووسمەوە، نە باسەکە لەبەرئەوەی کە زۆر تایبەتی‌یە بە خێزان‌و بنەماڵەی خۆیان نە هەقی گێڕانەوەیم هەیە.

شێخ لەتیف هەر لەو ساڵانەدا بوو بە دۆستێکی نزیکی حیزبی شیوعی، بە تایبەتی پاش شۆڕشی چواردەی تەمووز، ڕەنگە پێوەندی‌یەکەی لەگەڵ حیزبدا لە دۆستایەتی زیاتر بووبێ، بە تایبەتی کە زۆر نزیکی سۆڤیەتەکانیش بوو.

---

(١)"سەرسووڕێنەر، نەخێر سەرسووڕێنەر نی‌یە، ئەگەر نەبوایە، ئەوە سەورسووڕێنەر بوو".

(٢)لە عەرەبیدا ووشەی "ئیستیعمار" بەرامبەر بە کۆلۆنیالیزم‌و ئیمپریالیزم بەکاردەهێنرێت. کە بۆ یەکەمیان دەست دەدات، جاروبار ئیستیعماری کۆن بە یەکەمیان‌و ئیستیعماری تازە بۆ دووەمیان بەکاردێت. لە کوردیدا تێکەڵ بووە، چ ووشە عەرەبی‌یەکەو چ دوو ووشە لاتینی‌یەکە بەکاردێن. بەڵام هەموو کات بە مانا زانستی‌یە ووردەکەی نا. لە کوردیدا ئاوەدانکردنەوە یا ئاوایی دروستکردن بۆ مانای یەکەم پڕ بە پڕە.

(٣)ئەمە لە شیعرێکی نازم حیکمەتەوە وەرگیراوە. سەرەتا لە خۆپیشاندانەکانی ڕاپەڕینی کانووندا کاك عەبدولقادری نوری بەگی ساحێبقران (کە شیوعی بوو و لە بەغدا دەیخوێند) کردی بە سەرەتای ووتارێکی خۆی، دووایی کاکەی فەللاح کردی بە شیعر:

من نەسووتێم، تۆ نەسووتێی، کێیە ڕێ ڕۆشن ئەکا
کێیە چاری دەستدرێژی‌و کردەوەی دوژمن ئەکا
ئەو کەسەی ڕۆڵەی سزایەو ڤاڵی بۆتەی مەینەتە.

(٤)عەبدلقادر عەبدوڵلا –کوڕی حاجی عەبدوڵلای زڕگوێزی بوو. بە (ڤالە چاوشین) بەناوبانگ بوو. کاسب بوو، بە ئیش چوو بووە بەغداو بەشداری خۆپیشاندانەکانی ڕاپەڕین بووبوو و شەهید بوو، تەرمەکەی هێنرایەوە سلێمانی. خاڵی پارێزەر کەمال مستەفا (ئێستا دادوەری تەمییز) و براو خوشکەکانێتی.

(٥)کازم جعفر "کاظم جعفر". ئەفسەرێکی عەرەب بوو. لە بزووتنەوەی ١٩٤١دا لە سوپا دەرکرا. پاشان لە حقووق خوێندی‌و بوو بە پارێزەر. ڕێگەی چەپی گرت‌و زۆر دۆستی کورد بوو. لە ڕاپەڕیندا یاوەریی هێنانەوەی تەرمی (ڤالە چاوشین)یان پێ سپاردبوو. لە ساڵانی پەنجادا کازم جەعفەر لەناو ئاشتیخوازان‌و ئەو پارێزەرانەدا دیار بوو کە بەرگرییان بەبێ پارە لە گیراوە سیاسییەکان دەکردو لیژنەی "پارمەتیی عەدالەت"یان پێکەوە نابوو. پاش کودەتایی چەپەڵی ١٧ای تەمووزی ١٩٦٨ فاشستەکان "سەلام"ی کوڕە گەورەی یا تاقە کوڕییان کوشت. دووایی شەهید کازم جەعفەریش بە مردوویی یا کوژراوی لەسەر گۆڕی کوڕەکەی بینرایەوە.

(٦)لەبەرئەوە بە درێژی ووتەکانی شەهید کازم جەعفەرم گێڕایەوە، تا خوێنەری ئێستا لە ووتەو بیری ئەو سەردەمە بگات.

ئەم وەرگێراوانە لە چەند ژمارەی "الاهالی"دا بلاّوکراونەتەوەو پاشان بوون بە نامیلکەیەك: "سجل الحركة الوطنية- ضد معاهدة جبر- بيفن. مطبعة الاهالي- بغداد، ١٩٦٠"

(٧) واتە: لەسەر بەردی یەکێتیی کوردو عەرەب ئیمپریالیزم‌و نۆکەرو پیلان‌و پەیمانی ووردوخاش دەبێت.

(٨)کاک ساڵح ڕوشدی برای ئەحمەد سامییە، لە بنەماڵەی موفتیی ئامیدییە ئەحمەد سامی لە سلێمانی ماوەیەک لە مەعاریف "پەروەردە" و ماوەیەک لە "کشتوکاڵ" موحاسیب بوو. لە کوڕەکانی "شێرکۆو سمکۆو د. سەرکەوت، دەناسم. دیارە ئەحمەد سامی بە بێدەنگی بەشداری بزووتنەوەی نیشتمانی بووە. مامۆستا برایم ئەحمەد لە یادداشتێکدا باسی ئەوە دەکات کە شەو بە دزییەوە تایپراتەری دائیرەکەی خۆیی داوە بە پارتی. ئەو سەردەمە دەستکەوتنی تایپراتەر ئاسان نەبوو. کاک ساڵح بە هۆی کاکییەوە هاتبووە سلێمانی. لە بیرمە بە بۆنەی کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانەوە لە باخچەی گشتی، حکوومەت کۆبوونەوەیەکی ڕێکخستبوو. ئێمەی قوتابییان بردبوو، (من لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم). ساڵح ڕوشدی- ووتارێکی هەبوو، کە پێشکەشیانکرد "صالح رشدي العمادي، صف الخامس الاعدادي" تا ماوەیەک منداڵان ئەو سەجعەمان دەووتەوە. ئەوکاتە پۆلی پێنجەمی ئامادەیی پلەی لەناو خەڵکدا وەک خوێندکارێکی دکتۆرای ئێستا بوو.

ژیانی کاک ساڵح ڕوشدی دیارە. لەناو پارتیدا پێشکەوت. لە سەرەتای پەنجاکاندا لەگەڵ ڕەحمەتی "مستەفا کەریم" (برای لیوا عەبدولڕەحیم وەفیو عەبدوڕەحمانە ئەفەندیی موحاسیب"دا گروپێکی چەپیان لە پارتی جیاکردەوە. نازانم کاک مستەفا بەرەو حیزبی شیوعی چووبێ یا نا. بەڵام بیری هەر چەپ بوو. کاک ساڵح ڕوشدی زیاتر لە حیزبی شیوعییەوە نزیک بووبۆوە. (نازانم تا چ ڕادەیەک). چونکە هاوینی ١٩٥٣ لە گرتووخانەی مەعەسکەر ڕەشید پێکەوە گیرابووین. لە ژووری تەنیادا بووین. بەڵام لە کاتی بۆ ئاودەست بردن و لەوەدووا لە سەعاتی لە ژوور بردنە دەرەوەدا دەمانتوانی چرپەیەک لەگەڵ یەکتر بکەین لەو حیکایەتە سەیرەی گرتنەکەی گەیشتم کە بۆ تۆمارکردن دەشێت.

کاک ساڵح لە کەرکووک پارێزەر بوو. ڕۆژی پێش گرتنی لەگەڵ بەڕێوەبەری ئەمن دەمەقاڵێی بووبوو. ئەویش چووبوو فرمانێکی گرتنی بۆ دەرکردبوو.

دیارە لە ڕێی حاکمی لێکۆڵینەوە "تحقیق"ەوە. کە بەیانی دەچێتە بیرۆ "مکتب"ی پارێزەرییەکەی. یەکێك دێت پوستەیەکی دەداتێ. کە پێچراوەی بڵاوکراوەیە" نازانم هی حیزبی شیوعی یا لاوانی دیموکرات". دیارە ئەو شوێنەی کاك ساڵح دیار بۆوەو شفرەش هەبووە لە نێواندا، هەر ئەو کەسە دەگاتە بەر دەرگا پۆلیس دێن کاك ساڵح دەگرن. ئەویش وای بە خەیاڵدا دێت کە پۆستە هێنەرەکە پیاوی ئەوانە، یەکسەر دەڵێت ئەوە بۆی هێناوم. پۆلیس فریا دەکەون ئەویش دەگرن. دووایی کە هەردووکیان هێنران بۆ بەغدا لە لێکۆڵینەوەدا دەرکەوت کە هۆی بۆ گرتن چوونی کاك ساڵح چی بووەو هۆی بە گرتن دانی کەسی دووەم لە لایەن ئەمەوە بە چ نیازێك بووە. بۆ ئەم حیکایەتە بڵێم لە بەندیخانە هەردووکیان بە یەك شادو شوکر بوونەوە، "منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ". ئەوەندە هەیە کە کەسی دووەم کاك حەسەن عەلی غالب بوو -کە ئێستا بە ناوی "حەسەن نەقشبەندی"یەوە دەنووسێ. ساڵانیتری ژیان و خەباتی "ساڵح ڕوشدی"یش دیارەو باسکردنی لە سنووری ئەم یادداشتەدا نییە.

(٩)لەو قسە خۆشانەی ئەوسا دەگێڕرایەوە ئەوە بوو کە یەکێك لە پیاوە دیارەکانی شار کوڕەکەیی دیبوو دروشمی "نانمان ئەوێت بۆ میللەت"ی هەڵگرتبوو، لە ماڵەوە پەلاماری دابوو، (بۆ تۆ سواڵکەریت داوای نان بکەیت، تۆ کوڕی فلان بەگ و نەوەی فلان پاشایت).

(١٠)دیارە ئەمە زۆر جیایە لەو وەفدی کوردستانەی پاش راپەڕینی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ کە چوونە بەغداو دەستخۆشیان لە مەلیك فەیسەڵی یەکەم کرد کە کوردی باش کوشتبوو و پیرەمێرد هۆنراوەی (وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان)ی بۆ نووسیون

(١١)واتە: الله اکبر ئەی عەرەب لاوەکانتانیان کوشت

شەڕ لەسەر پرد بوو کاتی نیوەڕۆ بەرپایان کرد

(١٢)شەقامی غازی پاش شۆڕشی تەمووز ناونرا (کیفاح). ئەو کاتە شەقامی جمهوری نەبوو، کە ئێستا دەکەوێتە نێوان ئەو دوو شەقامەوە.

(١٣)دوکتۆر قوتەیبە شێخ نووری (     -١٩٧٨) کوڕی زانای گەورەی کوردو عیراق شێخ نووریی شیروانی، برای لیوا ڕوکن بەهائەدین نووری بوو، دوکتۆرێکی باش‌و ناسراو، تێکۆشەر تا مردن، هونەرمەندێکی گەورە. لەم یادداشتانەدا وەك دۆستۆ خزم‌و پیاوی دیار چەند جار دێمەوە سەر باسی.

(١٤)هەموو شیعرە سیاسییەکانی هەردی چونکە لە کاتی خۆیداو لە لایەن خۆیەوە بڵاونەکراونەتەوە لەبەرئەوە کەوتبوونە سەر زمانی خەڵك‌و لە خوێندنەوەیان —فۆلکلۆر ئاسا- جیاوازی هەبوو و هەیە، من هەر لەو کاتەوە ئەم شیعرانەم وا بیستووەو وا لەبەرکردووە، بۆ ئەم جیاوازییانە مامۆستا خۆی سەرپشکە، خۆزگە قسەی دەکرد.

(١٥)ڕاپەڕینی فەللاحی عەربەت لەناو شیوعییەکاندا زۆر بەناوبانگ بوو، چ ئەو ڕاپەڕینەو چ پاش ئەوە ڕاپەڕینی فەللاحی هۆرێن‌و شێخان‌و وارماوەو دزەیی بە ڕێکخستن‌و سەرکردەیی شیوعییەکان بوو و باوەڕناکەم هەندێك شت کە نووسراوەو دەیداتە پاڵ خەڵك‌و لایەنیتر ڕاست بێت. شیوعییەکان لە ساڵی ١٩٤٨ەوە لە دەرفەتێك دەگەڕان بۆ کارێکی جەماوەر خستنە کارو ڕاپەڕین.

فەللاحی عەربەت ڕاپەڕیبوون، موڵکانەیان بە شێخ لەتیف نەدەدا، وا بڵاوبوو کە ئەویش ئاوی لێ بڕیبوون، کە شیوعی کەوتنە خۆپیشاندان پارتیش لەو کارەی شێخ لەتیف —کە جێگری سەرۆکیان بوو- بێدەنگ نەبوون.

گۆڤاری (نزار) کە مامۆستا عەلائەدین سوجادی سەرنووسەری بوو، لە کارتێکردنی مامۆستا برایم ئەحمەدەوە دوور نەبوو. شتێکی لەسەر ئەو ئاوبڕینە نووسیبوو.

پاشان لە بڵاوکراوەیەکی پارتیدا بە توورەییەوە باسی ئەوە کرابوو کە لە سەردانی سلێمانیدا هەوڵی لێدانی مامۆستا عەلادین دراوە.

بە ڕاستی ئەو ڕاپەڕینانە هۆو ئەنجامو چمکەکانیان هەر کەسو هەر لایەنێك بن شایانی لەسەر نووسینو بە چیروكو ڕۆمانو شانۆگەری کردنن. ئەوەی بیستبووم مامۆستا مەلا قادری عەربەت (باوکی برای نووسەرو شاعیر ئەنوەر قادر جاف) ڕۆڵی گەورەی لەم ڕاپەڕینەی عەربەتدا بووە. بەڵام ژن براکانی کاك ئەسعەدو کاك مەلا ئەحمەدی مەلا قادری سۆفی (بانیخێڵان) تێکۆشەری شیوعی بوونو لە ڕاپەڕینی هۆرینو شێخانو وارماوادا دەستیان هەبوو، کە هەر لەو بارەیەوە لەم یادداشتانەدا بیرەوەریی تایبەتیم هەیەو دێمە سەری.

## ڕادیۆکان:

لە چەند ئێستگەی ڕادیۆدا کارم کردووە، ڕەنگە جۆری کارەکان جیاواز بن، بەڵام هەریەکەیان جۆرە بیرەوەریو نیشانەیەکی بەجێهێشتووە، هەرچەندە ئێستا کاری ڕادیۆش دەچێتە ناو کاری ڕۆژنامەگەرییەوە، بەڵام کە پێویست وابوو کاری ڕۆژنامەگەری جیا بکەمەوەو خانەی تایبەتیی بۆ دابنێمو لە شوێنو کاتی یەك بە دووای یەکدا هاتنی خۆیدا باسی نەکەم، وا کاری ڕادیۆ لە ڕۆژنامەگەری جیانەکەمەوە، بەڵام هەروەك ئەو یادگاری هەموو ڕادیۆکان یەك دەخەم.

١ـبەغدا: یەکەم میکرۆفۆنی ڕادیۆ کە دیبێتم یا لە پشتییەوە کارم کردبێ، ڕادیۆی کوردیی بەغدا بوو. کۆتایی ساڵی ١٩٤٨ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٩ کە لە کولیەی شەریعە بووم. دۆستو هاوەڵی کۆنی خوێندنم یادنەمر شەماڵ سائیب لە ئامادەیی ئەعزەمیە بوو، جاروبار سەری ئەدام. لە پڕ ڕۆژێك هات، باسی ئەوەیکرد کە تیپێکی نواندنی پێکهێناوەو هەفتانە لە ڕادیۆی بەغداوە یەکەمجار دەبێت کە چیرۆکێك بە نواندوە پێشکەش بکرێت. ئەو کارکردنە دەچێتە ڕیزی کارکردنی هونەرییەوە، هەندێکیم بۆ گۆڤاری "ڕەنگین" گێڕاوەتەوە. لەبەر ئەوە ئەمەیان دەخەمە سەر باسی چالاکیی هونەریو

شوێنێکی تایبەتی بۆ تەرخان دەکەم‌و دووای باسیتر دێمەوە سەر کارکردنی دووای شۆڕشی چواردەی تەمووز لە ڕادیۆی بەغدا.

٢-قاهیرە: نامەوێ لە بارەی ئەم ڕادیۆیەوە بەرپەچی کەس بدەمەوە، خۆ ڕەنگە بەڵگەی هەندێك بەرپەرچی دانەوەشم هەبێت، بەڵام ئەمەی دەینووسم هەر بیرەوەرین‌و لێیان دڵنیام.

ساڵانی ١٩٥٦-١٩٥٨ کە لە شام بووم، پێوەندی‌یەکی ڕەنگە بڵێم ڕۆژانەم لەگەڵ تێکۆشەرو شەخسیەتی ناودار عەزیز شەریفدا هەبوو، وەك لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەم ئەو بە ناوی (احرار العراق- ئازادانی عیراق)ەوە کاری دەکرد. لە بزووتنەوەی (هاوکاریی ئاسیاو ئەفەریقا)دا بوو، هاتوچۆی قاهیرەی دەکرد. لە گەڕانەوەیدا لە یەکێك لەو سەردانانەدا باسی ئەوەیکرد کە لەگەڵ شەخسیەتی قەومیی عیراق سدیق شەنشەلدا سەرۆك عەبدولسریان دیووە. لە باسدا لە مەسەلەی کورد دووان، ئەوەندەی پێوەندیی بیرەوە هەبێت ئەوەیە کە داوای کردنەوەی بەشێکی کوردی‌یان لە ئێستگەی قاهیرەدا لە سەرۆك ناسر کردووەو پەیمانی داونەتێ.

هەر لەو سەردەمەدا وەزیری کاروباری سەرۆکایەتی کەمالەدین ڕەفعەت هاتە شام، قەدری جان هات بە دووامداو ووتی: برا قوتابی‌یە کوردە عیراقی‌یەکان کۆبکەرەوە وەعدم لەو وەزیرە وەرگرتووە دەتانبەمە لای.

(عەلی فەتتاح دزەیی، تەلعەت نادر، موئەید نەقشبەندی، عومەر محێدین شەریف، نووسەری ئەم دێڕانە) لەگەڵ قەدری جاندا چوینە ئوتێل سەمیرامیس، سەعاتە وەختێك لای وەزیر دانیشتین، گەلێك باس لە بارەی کوردو هەڵوێستی میسر یا (کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو) کرا، کە ماوەیەکی کەمبوو دروستکرابوو، لەوێدا کە باسی ڕادیۆی کوردی کرا، وەزیر ئاگاداری کردین کە بڕیار لەسەر کردنەوەی ئەو ئێستگەیە دراوە. قەدری جان ئیشارەتی منی کردو ووتی: ئێمە ئەم برادەرەمان لا باشە بۆ کارکردن لەو ئێستگەیەدا.

ئەوەی من لە بیرمە نێستگەکە لە نیسانی ١٩٥٨دا کەوتەکار[١]. دیسان قەدری جان هات بەدووامدا پێکەوە چووینە ئەو شوێنەی جاران باڵیۆزخانەی میسر بوو، پاش یەکگرتنی میسرو سوریا هەر میسرییەکانی لێبوون‌و ناونرابوو "شوێنی ڕێکخستن یا یەکخستن- مکتب التنسیق"، لەوێ زەغلوول عەبدوڕەحمان[٢]، کە پێش یەکگرتن ئەتاشێ "مولحەق"ی سەربازیی میسر بوو لە سوریا پێشوازیی لێکردین‌و ووتی: لەم ڕۆژانەدا ڕادیۆ دەکەوێتە کار ئێوە هەردووکتان خۆتان ئامادەبکەن، لێرەوە، لە سوریاوە هاوکاریی ڕادیۆکە بکەن، دەستمانکرد بە بەرنامە ئامادەکردن (بە تایبەتی شیعر خوێندنەوە. ڕادیۆ کەوتە کار سەرەتا کاك هوشیار بابان‌و کاك محەمەدی حسێنی مەلا "دزەیی" بێژەر بوون[٣]، ڕۆژ بە ڕۆژ قەدری جان‌و من دەچووین، هەندێك شەخسیەتی کوردی سوریامان دەبرد وەڵامی پرسیارمانیان دەدایەوەو تۆمارماندەکردو هەر میسرییەکان دەیاننارد بڵاودەکرانەوە، لەوانە: حەسەن ئاغای حاجۆ، قەدری بەگی جەمیل پاشا، مەمدووح سەلیم بوون. سەیر ئەوە بوو جارێك بێژەرێکی میسری هاتبوو "ئەحمەد فەراج، کە سەردەمێك مێردی –سەباح-ی گۆرانیبێژی میسری بوو، خۆی پرسیاری بە عەرەبی دەکردو وەڵام کوردی بوو، فێری چەشنی چاوپێکەوتنی دەکردین. بەشداریی قەدری جان‌و من لە سەرەتاوە زۆر گەرمبوو، وورده وورده کز بوو، لە کاتی شۆڕشی چواردەی تەمووزدا چەند ڕۆژێك گەرمبوو، ئیتر من لە ٢٤ی تەمووزدا گەڕامەوەو پێوەندیم نەما.

لە باسی ئەو نێستگەیەدا دەبێ دووشت بووترێت:

١-حکوومەتی نووری سەعید زۆر بەو ڕادیۆیە قەڵس بوو، بە سەرەتای دەستکاریکردنی سەرۆك عەبدولناسری لە کاری کورددا دائەنا، بێژەری یەکەمی ڕادیۆی بەغدا ڕۆژانە کەوتە هێرش، ڕادیۆی عەرەبی کازم حەیدەریی بە ڕەگەز کورد بە حەماسەتەوە ئەیخوێندەوەو بە عەبدولناسری دەووت: "مەسەلەی کورد ئاگرە، یاریی پێمەکە، خۆت ئەسووتێنێت".

٢-ڕادیۆکە بە ناوی کۆماری یەکگرتووی عەرەبەوە بوو کە بریتی بوو لە سوریاو لە میسر کەچی لەناوچە کوردنشینەکانی سوریا قەدەغە بوو، چەند کەسیان لەسەر گوێگرتن لەو ڕادیۆیە گرتبوو.

لە عێراقەوە تەنیا مامۆستا بەشیر موشیر بە ناوی زەعیمی کوردو کوردستانەوە بروسکەی پیرۆزبایی ناردبوو و نەگەیشتبوو.

٣-دیسان ڕادیۆی بەغدا:

لە شوێنێکیتردا، باسی ئەوە ئەکەم کە چۆن هەموو ئەوانەی لە شام ڕاکردووو پەنا بەربووین (بازوربەمان) بە پاسێك- دووان ڕوومانکردە بەغدا.

لە بەردەوامیی یا چوونیەتی کارکردنمدا بۆ ڕادیۆی قاهیرە، شریتێکی باشم بۆ ڕادیۆی کوردیی بەغدا تۆمار کرد. دەنگی زۆربەی شەخسیەتە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەی شامی تێدا بوو. (قەدری بەگ، ئەکرەم بەگ، مەمدووح بەگ، حەسەن ئاغا، ڕەوشەن خان، عوسمان سەبری، قەدری جان، عارف عەبباس، محەمەد عەلی شوێش (شێخمووس)- لە حەڵەبەوە هاتبوو، جگەرخوێن- یەکەمجار بوو دەنگی بڵاوبکرێتەوە- دوکتۆر نورەدین زازا. حەسەن هوشیار، ئەحمەد نامی.. هتد). کەس ئەمانەی پێکەوە کۆنەکردەوە، بەڵام شۆڕشی تەمووز هەموویانی کۆکردەوە. کە هاتمەوە ٢٤ی تەمووز هەر ئەو ڕۆژە بردم بۆ ڕادیۆی کوردی. ستافی کۆن لە ئێستگەی کوردی هەموویان مابوون، چەند کەسی تازەش هاتبوون. ئەو دوو شریتەی تۆمار کرابوون. بە دوو ڕۆژ بڵاوکرانەوەو مامۆستا هادی محەمەد بە پێشەکییەکی جوانەوە وەسفی وەسفی ئەو چاوپێکەوتنامەی کردو دوایی هەر بە دەنگ‌و بە پێناسین‌و پێشکەشکردنی منەوە بڵاوکرانەوە. دەنگی باشیان دایەوە. چونکە دەمێك بوو ئەو چەشنە ناسین‌و تێکەڵییە لەگەڵ کوردی سوریا نەبوو- بە تایبەتی لای خەڵك.

فەڵەباڵغێکی زۆر لە ئێستگە کۆبووبۆوە، دامەزرێنەرو بەڕێوەبەری کۆن (کاك کامیلی کاکەمین) هێشتا هەر لەوێ بوو، بەڵام چەند کەس‌و چەند لایەن

لەسەر بەڕێوەبەری هەرایان بوو، زۆربەی ئەوانەی پاش شۆڕش هاتبوون بەبێ مووچەو پاداش ئیشیان دەکرد، داوایان لە منیش کرد بچمە ئەوێ. دوو مانگ زیاتر لەوێ کارم کرد. لەو شتانەی لە بیرمە، یا دەبێ بووترێت، ئەوە بوو مامۆستا گۆران هێشتا لە بەندیخانەی باقووبە بوو، داستانی (بت- بتەوان)ی بۆ ناردم، جارێك خۆم خوێندمەوەو جارێك لەگەڵ نەسرین فەخری (دوکتۆر) پێکەوە خوێندمانەوە. -ڕۆژێك بەڕێوەبەری گشتی- موفەدەم سەلیم ئەلفەخری ناردی بە دووامدا، کاغەزێکی دایە دەستم وتی: خۆت ئەمە وەردەگێڕیت‌و هەر خۆت دەیخوێنیتەوەو نایدەیت بە کەس، تەماشام کرد نامەیەکی مەلا مستەفای بەرزانە لە پراگەوە بۆ زەعیم عەبدولکەریم قاسم. زۆر زۆر بە شەوقەوەو بە پەلە وەرمگێڕا، پەلەم بوو بگەمە سەر میکرۆفۆن. بە (مژدە.. مژدە) و بە شیعری قەدرجان دەستم پێکرد:

بەرزانی.. بەرزانی

کی ڤی نافی نەزانی[٤]

ووشەی "پاساوڵەکەی سەرسنووری سوور"م لە دووا شیعری گۆرانەوە وەرگرت. لە خوێندنەوەدا بووم لەودیو شووشەی ستۆدیۆوە دیم هاوکارێکم کە بە تەمای ئەوەی ببێت بە بەڕێوەبەر هاتبوو یا هێنرابووە ئێستگە، هەرا دەکاو بە دەست هەڕەشە دەکات، تێ نەگەیشتم بۆچی؟. کە هاتمە دەرەوە، زۆر بە تووڕەییەوە پرسیی:

-تۆ چۆن بێ ئیزنی من ئەوە دەخوێنیتەوە.

-کاکی خۆم من بەڕێوەبەری گشتی‌و بەڕێوەبەری ئێستگەی کوردی پێیان ووتووم‌و تۆشم نەدیوە.

-ئا تۆ حیزبەکەت کاری تۆی داوەتە دەست من، دەبێ لە هەموو کارێکدا پرس بە من بکەیت.

-کاکی خۆم، جاری تۆ زۆر دەمێکە حیزبی نیتو وازت لە حیزب هێناوە. حیزبیش هیچی لەو بارەیەوە بە من نەوووتووە، ناشکرێ من هەرچی بخوێنمەوە پرس بە تۆ بکەم فەرمەکی زۆر کرد، باوەڕ ناکەم منیش بێدەنگ بووبم. دووایی ووتی:

-دە بیدە دەست خۆم با منیش جارێکی بخوێنمەوە. دامە دەستی ئیتر هەر ئەو چەند جارێك خوێندیەوە، بەڵام لای حیزب شکاتی لێکردم، ئەوسا برایەکی لێپرسراوێکی گەورە بوو لە حیزبدا. بۆ سبەینێ بە تەلەفوون بانگیانکردم، ووتی: من عەزیز ئەلحاجم. پاش دوعاو سلاو هەندێك ئامۆژگاری ووتی: کە لە کار بوویتەوە وەرە بۆ شوێنەکەی باوکم بۆ لام. کە چووم ئەختی سەرزەنشتی کردم. منیش ڕاستیەکەم تێگەیاند، زۆر پێکەنی ووتم: ئیتر من ناچم بە ڕادیۆدا چونکە دەبێ چەند ڕۆژێکیتر بچمەوە بۆ سوریا بۆ تاقیکردنەوە. ووتی: نا، تا دەڕۆیتەوە هەر لەوێیتو سبەی ئێوارەش کێت بە باش زانی لە کارمەندانی ڕادیۆ بۆ نانخواردنی ئێوارە بیانهێنە بۆ ئەو ماڵەی باوکم کە خوار ئێستگەی ڕادیۆیەو لەگەڵ ئەو برایەشدا ئاشتان دەکەمەوە. ئەوەی لە بیرمە هەر لەسەر خوانی حاجی عەلی حەیدەر کە لەو سەردەمەدا بە هۆی شۆڕشو عەزیزو لەتیفی برایەوە هەموو ڕۆژ بۆ زۆر لە خەڵکی تێکۆشەر ڕاخرابوو، لەگەڵ حسێن قەرەداخی، ئەحمەد حامید، ئەسرین فەخری، شەوکەت بابان، شەماڵ سائیبدا کۆبووینەوەو ئاویش کرا بە ئاگردا.

هەر لە پەراوێزی ئەو ڕووداوەدا دەبێ ئەوە بگێڕمەوە: من چوومەوە بۆ سووریا لە مانگی تشرینی دووەمدا لەگەڵ قەدری جاندا هاتمەوە، هەر ئەو شەوە- وەك لە شوێنیتردا باسی دەکەم چووینە ئوتێل سەمیرامیس لای بەرزانیی ئەمر. قەدری جان منی بەم جۆرە پێشکەشکرد:

-عیزەدین مەلا، یەکەم کەسە مزدەی هاتنەوەی جەنابتی داینێ.

-کوڕی حسێنی مەلای.

-نەخێر، کوری مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسووڵم.

هەستایە سەرپێ‌و جارێکیتر ئەم لاو ئەو لای ماچ کردم‌و وتی:

-چاوم ڕوون، کوڕی مامۆستامی. باوکت هاتە لام، زۆر دڵم پێی گەشایەوە.

-جەمال نەبەزو چەند مامۆستایتر لە قەومی‌و چەپ یادداشتێکیان دابوو بە وەزیری مەعاریف لە بابەت خوێندنی کوردییەوە داوای دامەزراندنی بەڕێوەبەریی مەعاریفی کوردستانیان کردبوو داواشیان کردبوو مامۆستا ڕەفیق حیلمی ببێ بە بەڕێوەبەری گشتی. پارتی ئەو یادداشتەیان لا پەسەند نەبوو، چونکە دەیانویست ئەو جۆرە کارانە لە ڕێگەی خۆیانەوە بێت. مامۆستا برایم ئەحمەد لە دوکانی مامۆستا بەشیر دەیووت: ئێمە لەگەڵ ئەو بیرەین، بەڵام نابێ هەرکەسە لە خۆیەوە بچێت یادداشتێك لای سکرتێری وەزیر فڕێ بداتو بڕوات، دەبێ کار بە ڕێکوپێکی بێت. کاك جەمال داوای لێکردم منیش ئێوارە بردمە ڕادیۆو پێشکەشی گوێگرانم کردو هەموو یادداشتەکەی خوێندەوە.

چوومەوە بۆ سوریا، لە تاقیکردنەوەدا دەرچووم، دووا پۆلی خوێندنی زانستگام مابوو، بە زۆر کاری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆژنامەگەرییەوە خەریکبووم. بەلای ڕادیۆدا نەچووم. بەڵام لەگەڵ ئەو میکرۆفۆنەدا یادگاریتر‌م هەیە. هەر کە لە ساڵی ١٩٦٦دا هاتمەوە بەغدا، من‌و زۆر نووسەرو ڕووناکبیریتر بانگ دەکراین بۆ پێشکەشکردنی بەرنامەی ئەدەبی. بە ناوی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە بەرنامەیەکیان بۆ من تەرخانکرد. هەفتەی جارێك نزیکەی ١٠-١٥ دەقیقە ووتارێکی چڕم پێشکەش دەکرد، ئەوەش لە کۆڕی نووسیندا تەجرووبەیەکی تازە بوو. چونکە وتارەکان بە زنجیرە بوون، جاری وا هەبوو ژیان‌و بەرهەمی شاعیرێکم دەکرد بە ١٠-٢٠ زنجیرە یا کەمتر. وورده وورده هونەرێکیتری ڕاگەیاندن‌و زانستم بۆ کەوتە کار.

دیارە ووتاری ڕادیۆ بۆ هەموو خەڵکە، لەبەر ئەوە بە زمانێکی پتەوو پاراو (ژیانی شاعیر، ئەوەی لە بارەیەوە نووسراوە، ڕاگەیاندنی هەندێك

نموونەی دیارو کورت، ئینجا بە چەند دێڕێك لێکۆڵینەوەی ئەمانە، هەر لە سەرەتاوە بیرم لەوە دەکردەوە کە کورتکردنەوەو خەستکردنی ووتارەکان، لە هەر هەڵقەیە چەند دێڕ دەدات بە دەستەوە بۆ کەرەسەی کتێبی داهاتوو لە بارەی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەمجۆرە کتێبی (ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، مەلای جزیری، شیعری کوردی.. هتد، هاتنە بەرهەم. ئێستاش کۆڵەکەی یەکەمی ئەو پرۆژەی مێژووی ئەدەبی کوردییەی بە دەستمەوەیە هەر ڕەشنووسی ئەو ووتارانەن کە لە لام ماون.

لە ١٩٦٧ تا ١٩٧٤ ئەم ووتارانە بەردەوامبوون. لەگەڵ دەست پێکردنەوەی شەڕدا لە کوردستان (١٩٧٤) دەستم لێ هەڵگرت. چەند برادەرێتریش هەروەك منیان کرد، بەڵام هەندێك مانەوە. نازانم بڵێم کاممان چاکمان کرد. من زۆرم لا سەخت بوو چەند هاوەڵو دۆستم لە چیاوە دەنگیان دەبێتو ئێمە لە بەغداوە. ئەم هەڵوێستە کەم نەکەوت لە سەرم. بەڵام ڕژێم ئەو سامانەوەی ئێمەی لە بەغدا پێ باشتر بوو لە چوونە شاخ، لەبەرئەوە تا ڕادەیەك چاوپۆشیی لێکردین.

ئەم لە یەك دابڕینە چەند ساڵێك دەوامی کرد. وا بزانم لە ساڵی ١٩٧٧دا بوو داوایان کردینەوە، بە هەندێ مامۆستایتری زانستگاوە ئیتر ئەو زنجیرەیە تا ١٩٩٠ بەردەوامبوو.

ڕاستە ڕادیۆی کوردیی بەغدا لە ساڵی ١٩٣٩ەوە ڕادیۆیی ڕژێمو حکومەتە یەك لە دووای یەکەکانی بەغدا بووە. بەڵام هەمیشە زۆر کەسی دڵسۆزو بۆ ووشەی کوردی بە پەرۆشی تێدا بووە کە دەرگایان بۆ نووسەرانی پاكو دڵسۆزو زانا کردۆتەوەو بە بەرهەمی ئەم ساڵە درێژانەی ئەوانە تەوژم دراوە بە ووشەو بە هونەری کوردی.

سڵاو بۆ یادی دامەزرێنەری ئەو ئێستگەیە کامیلی کاکەمینو بۆ ئەو پێڕەوە جوانەی بۆ ئەو ئێستگەیەی دانا. سڵاو بۆ یادی عەبدولقادر قەزازو کەریم بەگی زانستی کە لە بناغەدانانداندا لەگەڵی بوون.

رادیۆی مۆسکۆ:

منداڵ بووین، یا بە واتەی هەندێك کورد مێرد منداڵ بووین. بە عەشقەوە بۆمان بگونجایە گوێمان لە رادیۆی مۆسکۆ دەگرت، با هیچیشی لێ تێ نەگەین. مۆسکۆ قەڵای ئازادیو گەلان بوو. لە تەمەنێکی زوودا شیعری هەژارو پاشان دڵزارمان لەبەردەکرد.

بژی ستالین، خۆشبێ چەکوشو داس

لەژێر ئیستیبداد کوردی کرد خەلاس (هەژار)

یا:

جەژنی ئازادانە، یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە

یادی رۆژی وەرگەڕانی تاجو تەختی قەیسەرە (دڵزار)

باوکم زۆر زوو رادیۆیەکی شڕو کۆنی پەیداکرد. گەڕەك لێی کۆئەبوونەوە، بۆ گوێگرتن لە رادیۆی مۆسکۆ دوو ئابڵۆقەمان لەسەر بوو، ئابڵووقەی حکوومەت (کە گوێگرتن لەو رادیۆیەی لا قەدەغە بوو)، ئابڵووقەی ماڵەوە، کە ترس یەکەم ئارەزووی گوێگرتنی کەم دەکردەوە. بێجگە لەوەش، کە ئەو رادیۆیە تا ئێستاش لە رووی دەنگوباسی تازە گەیاندنو گۆرانیی خۆشی عەرەبی بڵاوکردنەوەوە هەر کزە.

ساڵ بە ساڵ لەگەڵ ئەو رادیۆیەدا بەرەو پێشەوە دەچووین. کە چووینە ناو حیزبایەتییەوە زۆر لە بەرنامەکانی کەرەسەی خۆفێرکردنی سیاسیو رووناکبیریمان بوو. دوو جار ساڵی ١٩٥١ و ساڵی ١٩٥٣ چوومە بەندیخانەی بەغدا، هەموو عەسرێك رێکسختنی خۆمان کۆی دەکردینەوەو بەرنامەیەکمان بۆ دەخوێندرایەوە. چونکە لە ژووری مەخزەنی قاوشێکدا رادیۆیەك بە دزییەوە هێنرابووە بەندیخانەوە، بە بێ رێکۆردەر (مسجل) کە ئەوسا نەبوو، بەرنامەکانی رادیۆی مۆسکۆ دەنووسرایەوە بۆیان دەخوێندینەوە. هەرگیز دەنگو خوێندنەوەی شەهید سەبیح میر عزرام لەبیر ناچێت، کە ئەگەر لە

کوشتاری بەندیخانەی کوتدا (ئابی ١٩٥٣)، شەهید نەکرابە پاش تەمووز باشترین بێژەری بەغدا دەبوو، یا ڕادیۆبیتر مەمنوونی دەبوون کاریان بۆ بکات.

ناوی بێژەرەکانی ڕادیۆی مۆسکۆمان لەبەردەکرد. سەرەتا دەنگێکی ناخۆش‌و خوێندنەوەیەکی سەیر کە دوایی زانیم ڕۆژهەڵاتناسی ناسراو عەبدڕەحمان سولتانۆڤ (تەتەر) بوو. بەڵام پاش ساڵی ١٩٤٨ دەنگی زاهیر حەسەن (ظاهر حسن) کە زوو زانیمان تێکۆشەری ناوداری عیراق مەهدی هاشم نەجەفی‌یە گەشەی دەداینێ (محەمەد عەلی و (سەمیر ئەدهەم). دەنگیان دەهات. لە مۆسکۆ زانیم مەسروور قەتتان‌و محەمەد میعسەرانین. بەو جۆرە بە ڕادیۆی مۆسکۆ ئاشنابووم‌و ئەو سۆزەی دەدامێ. لەبەرئەوە لە هاوینی ١٩٦٠دا لەگەڵ خوشکە نەسرین فەخریدا داوای کارکردنیان لێکردین هەر بەو سۆزەوە چووین تا هیچ نەبێ خانوو و ستۆدیۆو ژوورەکانی ببینین. چەند مانگی هاوین‌و پایزی ١٩٦٠ تا بۆ خوێندن چووین بۆ باکۆ لە ڕادیۆی عەرەبیی مۆسکۆ کارم کرد. من لام وابوو پەیامێکی بیرو ئایدیۆلۆژی ڕادەگەێنم. هەندێك لە هاوەڵەکانم لایان وابوو کورد نابێ لە ڕادیۆی عەرەبیدا کاربکات. لەو سەردەمەدا لە عیراقی سادق ئەلجەلادو موشتاق تالب لەوێ بێژەر بوون، تێکۆشەری ناسراوی ئەردەن‌و سوریا دوکتۆر نەبیە (نبیە) رشێداتیش بە ناوی عەلی مستەفاوە هەر بێژەریی دەکرد چونکە مووچەی بێژەر لە مووچەی دوکتۆر زۆر زیاتر بوو. نووسەری ناوداری سوریا مەواهیب کەیالی لە بەشی نووسین بوو کە کچێکی چەرکەس (گۆزێتابێك) سەرۆکی بوو. لە ئەرمەنیی سوریاو میسر دوو بێژەری چاکیان هەبوو، هایك‌و جوورامینەچیان کە ناوی حەسیب خەییات‌و فوئاد حەبیبیان لە خۆیان نابوو. چیم کرد شتێك لە بارەی کوردەوە بڵاوبکەمەوە سوودی نەبوو. لە تشرینی دووەمی ١٩٦٠دا بۆ خوێندن چوومە باکۆ، ئیتر پێوەندیم بەو ڕادیۆیەوە نەما.

## ڕادیۆی باکۆ:

لە باکۆ بەرنامەیەکی یەك سەعاتیی عەرەبی هەبوو، نازانم لە کەیەوە دەستی پێکردبوو. پاش شۆڕشی تەمووز داوایان لە حکوومەتی عیراق کردبوو دوو بێژەریان بداتێ یەکێك بۆ مۆسکۆو یەکێك بۆ باکۆ. برادەرانی شیوعیش کە ئەو کاتە ڕاگەیاندنی حکوومەتیان بە دەستەوە بوو، دوو بێژەری ڕادیۆی بەغدایان ناردبوو کە لە بەغدا نەبوبوون بە شیوعی، بە خەیاڵی خۆیان لە سۆڤێت دەبن بە شیوعی.

سەنان سەعید[٦] لەو ڕادیۆیە بێژەر بوو، پیاوێکی باشی ئازەریی باشوور (ئەحمەد یوسفی) کە فرۆکەوانی ڕاکردوو بوو، کاتی خۆی لە مزگەوتدا عەرەبییەکی باش فێربووبوو کرابوو بە وەرگێڕ. بەڵام بە ڕاستی وەرگێڕی چاك بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشەوە دەچوو. لە کەتەییدا هەر (کەبیر)مان بانگ دەکرد.

کە من گەیشتمە باکۆ. لەناو عەرەبی زانانداا هەواڵ گەیشتبوو، بەڕێوەبەری ڕادیۆو تەلەفزیۆن (تەیموور عەلییف) تەلەفوونی بۆ کاك عەلی گەلاوێژ کردبوو وتبووی: بۆ خاتری خوا مەیەڵە ئەم پیاوە بخوێنێت، با بێتە ڕادیۆ چیی دەوێت بۆی دەکەین. سەرێکمان لێدا، من وتم، من بۆ خوێندن هاتووم، خوێندنەکەشم پێ دەکرێو ئیشی ئێوەشم پێدەکرێ. ئێوە چیتان لە من دەوێت بۆتان ئەکەم. هەر بۆ سبەینێ لە پاڵ ئەسپیرانتورا (قوتابیی دوکتۆرا)دا بە (نووسەری شێواز- محرر اسلوبی پاریداکتۆر) دامەزرام. لەبەرئەوەی بێژەر نەبووم، هەر جارێك بچوومایە ستۆدیۆ بۆ شت خوێندنەوە ئەوە بەکاری زیادە حساب دەکرا بۆم. ئیتر سەنان زیاتر لەنگەری خستە سەر وەرگێڕان. شتەکانی لە بەشی تورکی وەردەگرتو دەیکردن بە عەرەبی. چونکە هەموو وەرگێڕانێکیش بۆ ئەو بە پێی دێڕ حساب دەکرا.

زۆری پێ نەچوو، مەسەلەی کورد یا وەك ئازاریو تورك دەڵێن "کورد مەسەلەسی" هاتە پێشەوەو لەگەڵیاندا تێکی دام. بەرنامەیەك هەبوو، نامەی

قوتابیانی عەرەب یا عیراقیی تێدا بڵاودەکرایەوە. جارێك من پێشکەشم دەکرد، هاتە سەر نامەی چەند کوردێك، ووتم: ئێستاش ڕوو دەکەینە چیاکانی کوردستان. نازانم کێ؟ ووتیان سەنان بوو لە سەرۆکی بەشی عەرەبیی، کە لاوێکی ئازەریی تا ئێسقان شۆڤێنی بوو، ناوی ناهید حاجییف بوو گەیاندبوو. کردی بە هەرا ووتی: "کوردستان یوغ"، ووتم: "کوردستان وار"، ئەوە هەر لە مێشکی تۆدا نییە. کار گەیشتە سەرۆکی بەشەکانی بێگانە "موختار حاجییف" کە بە "موختار موعەلیم" واتە "مامۆستا موختار" بانگیان دەکرد. ئەو مەسەلەکەی بە ئاسانتر گرت، بەڵام هەرچەند ڕۆژ پاش ئەوە کە پرسیارێك لە گوێگرێکەوە لە بارەی کوردەوە هاتبوو موختار پرسیی بۆ کێی بنێرین؟ چونکە پرسیارەکانی ڕادیۆ بۆ پسپۆڕ دەنێرران. ووتم: عەلی گەلاوێژ. بۆیان نارد. کە هاتەوە تەماشا ئەکەم نیوەیان سڕیوەتەوە.

کاك عەلی باسی کوردی ئەرمەنستانی کردبوو، باسی ڕۆژنامەی (ریا تازە) و ڕادیۆو بەشی کوردیی ئەکادیمیاو نووسەران‌و خوێندنی کوردی.. هتد. باسی زانا کوردۆلۆگەکانی مۆسکۆو لینینگرادو سەمەرقەند. هتدی کردبوو، کە هاتبووە سەر ئازربایجان هیچ لە ناوچە کوردنشین‌و لە "کوردستانی سوور"ی هەڵوەشێنراو نەدووابوو تەنیا باسی ئەوەی کردبوو کە لە ئازربایجان شەخسیەتی ناوداری کورد هەیە. خۆی لە محەمەد ئەسکەندرۆڤ لادابوو کە ئەوکاتە سەرەك کۆمار بوو، هەر ناوی چەند نووسەرو شاعیرێکی گەورەی هێنابوو کە کورد بوون‌و بە ئازەری دەیاننوسی: وەك سلێمان ڕەحیمۆڤ، قاسم قاسم زادە، عەلی وەلییڤ.. هتد.

هەڵمگرت‌و چوومە لای "موختار موعەلیم"، کەچی ئەو ئەمجارە لە کابرایتر خراپتر ووتی: ڕاستە ئەمانە کوردن، بەڵام بە ڕەسمی ئازەرین. من سلێمان ڕەحیمۆڤ هاوڕێمە، قارەمانی یەکێك لە ڕومانەکانی کوردە، کە بانگی دەکەین هەر دەڵێین کوردۆ، بەڵام ئەو بە ڕەسمی ئازەرییەو نووسەری ئازربایجانە. کە من زۆری لەسەر ڕۆیشتم‌و لەم تێکەڵکردنی ڕەسمی‌و ناڕەسمییە

دووام، ووتی: ئەوەندە شۆڤێنیو ناسیۆنالیست مەبە. ووتم: موختار موعەلیم بە ڕاستی تێگەیشتنی مارکسیزم وا دەبێ، کەسێك بە کوردێك بڵێ کورد شۆڤێنیو ناسیۆنالیست بێت، کەسێکیش بە کورد بڵێ نەخێر تۆ تورکی ئینتەرناسیونالیست (اممی) بێت. سڵاو لە لینینیزم. کورد دەڵێن: ئومێدێکمان بە وەیس بوو وەیسیش سونی دەرچوو.

هاتمە دەرەوە، داوای مۆڵەتی دوو مانگم کردو ئیتر تا ساڵ زیاتر نەچوومەوە بەوێدا. ئەوەشم لەبیر نەچێت کە چەند ڕۆژ پێش ئەوە داوای نووسینیان لێکردم لەسەر باکۆو ژیانی ئەو وولاتە، ئەوەی لام گەش بوو نووسیم، خوێندمەوە، تەماشا دەکەم، دەیانەوێ لە گۆشەیەکدا بڵاوی بکەنەوە کە سەنانو هەندێکجار مەواهیب کەیالی لە مۆسکۆو بە ناوی "بعین عربی" دەیاننووسی. پێم لەسەر ئەوە داگرت کە من عەرەب نیمو نووسینی من لەوێدا بڵاوناکرێتەوە. هەر ئەو (ناهید)ە ووتی: تۆ لە سەنان زیاتری؟ ووتم: بێگومان زیاترم، ئەو کوردە بووە بە تورکمان و لێرە دەڵێ: ئازەریم، با هەفتەی جارێکیش بە چاوی عەرەب باکۆ ببینێ، ئەوە ئیشی من نییە. دیارە ئەمەش بۆ ئینتەرناسۆنالیستیی ئازەرییەکان سەیر بوو.

وا من لە ڕادیۆ نەماوم، لەپڕ نامەیەك لە برام کاك کاوس قەفتانەوە (دوکتۆر)، بۆ کاك کەمال مەزهەر (دوکتۆر ناوك) لە لینینگرادەوە هاتبوو بۆ باکۆ. دەڵێ وەك بیستوومە تۆش لەگەڵ عیزەدیندا لە ڕادیۆی عەرەبی ئیش دەکەیت. بە هاتنی ئەم نامەیە دەبێ واز بێنیت، چونکە ئیشکردنی کوردێك لە ڕادیۆیەکی عەرەبیدا با سۆڤێتیش بێت خیانەتە.

سەیر ئەوە بوو کاك کاوس ئەوسا لێپرسراوی ڕێکخراوی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو لە یەکێتیی سۆڤێتو پارتی خۆی لە ئێمە بە مارکسیتر دەزانی. هەر پێش هاتنە باکۆم لەگەڵ ڕەحمەتی ئەمین جەلال- لێپرسراوی دووەمی پارتی- باسی شارەزایی مەلا مستەفامان لە مارکسیزمداو پلەی ئەو شارەزاییە

دەکرد. ئەمین دەیووت: ئێوە هەر بە ئەزمری لە مارکسیزم دەزانن، مەلا مستەفا باش بە ئەزمری‌و پراکتیك شارەزای بووە.

وەك ووتم: ساڵ زیاتر پێوەندیم بە ڕادیۆوە نەما. وا بزانم پایزی ١٩٦٢ بوو، لە زانستگا[٧] کەبیر (ئەحمەد یوسفی)م دی. ووتی: لە کوێیت، هاتمە بەشی ناوخۆکەشت. موختار موعەلیم زۆر تکات لێدەکا پێکەوە سەرێکی بدەین. دەتەوێ ئەو بهێنمە لات. خۆ ئەگەر قسەش بێت تۆ زیاترت بەو ووتووەو ئەو وەڵامی نەبووەو باسی کاری گشتی بووە نەك شەخسی، لە من قسەو لە زمانە لووسەکەی ئەو قسە سواری تاکسیی کردم‌و چووینە لای موختار موعەلیم، هەر یەکسەر ووتی: ئیشمان پێتەو دەبێ بێیتەوە، بە هێمنی هەموو شتم بۆ باسکردو سوپاسم کردو ووتم:

-من لە هیچ شتێکی شەخسی ناڕازی نیم، بەڵام کە کار گەیشتە سەر میللەتەکەم ئەوا نە کارو نە ئەو هەموو پارەیەی ئێوە ئەیدەن.

ووتی: من کورد باش ئەناسم. باش ئاگام لە مەسەلەی کوردە. بەڵام هەم فەرمانبەری ڕەسمیم‌و سیاسەتی حیزب‌و حوکمەتەکەم بەجێ ئەهێنم، هەم هەندێك شتیشم بە گاڵتەوە پێ وتوویت. ئەم داوایەش داوای من نی‌یە، داوای کۆمۆنیستێك‌و حیزبەکەیەتی لە کۆمۆنیستێك. وا کۆنگرەی بیست‌و دووەمی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێتە، دەبێ هەموو کەرەسەکانی بڵاوبکەینەوەو ڕەنگە لەو ماوەیەدا کاتمان بۆ زیادبکەن. کەبیر بە تەنیا فریاناکەوێ، (سنان ناشیدر- واتە ناشی‌یە) ئەو ئیستیلاحانەی ئەدەبیاتی کۆمۆنیستان نازانێ کە تۆ دەیزانی دەبێ تۆ یارمەتیمان بدەیت. هەر بۆ ماوەی کۆنگرە موافەقەتم کرد. چونکە هەر خۆم بەلاوە دەروێشێك بوو کە لە شێخەوە فەرمانی بۆ هاتبێت. زۆربەی کەرەسەکانی کۆنگرەی بیست‌و دووەمم وەرگێڕرا، ئەوسا فۆتۆکۆپی نەبوو تا فۆتۆیان بکەم‌و بە کتێب بڵاویان بکەمەوە. چونکە ئەو دەمە زۆر باوەڕم بەو کۆنگرەیە هەبوو، بە سەرەتای وەرچەرخانێکی باشم دەزانی لە

بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا، وەك ئێستا بە سەرەتای لادانێکی گەورەو لەناوبردنی ئەو دەوڵەتە مەزنەی کۆمۆنیستانم نەدەزانی.

کارکردنی ڕادیۆی باکۆ سەرەتایەکی باش بوو بۆ مێشك کرانەوەمو لە گەلێك شت گەیشتن. ئەوەتا کەسێکی زیرەك‌و ڤێڵبازی وەك موختار موعەلیم کە لە زۆر شت دەگەیشت لە بەردەم شتی نووسراوو فەرمانی سەرەوەدا دەبوو بە بەردی شەترنج. چیمان لە بارەی بەرەوپێشچوون‌و دەنگوباسەوە دەووت: سوودی نەبوو. هەواڵێك هەبوو لە بارەی لوولەی ئاسن فرۆشتن لە شاری "سومگاییت"ی لای باکۆوە بە دەرەوەی وولات، سەرەتا بە باسی ئەو شارە تازەیە دەستی پێدەکرد، ئینجا بەراوردێکی ناڕەوای تێدابوو لەگەڵ بەرهەمی ئەو وولاتانەدا کە پێشکەوتوون‌و ئاسنیان کەمە یا نییە -دیارە ئەم کەمی‌و نەبوونی‌یە نەدەووترا- ئینجا لە کۆتاییدا دەووترا: ئەمڕۆ ئەوەندە لوولەی ئاسن لە سومگاییتەوە نێرراوە بۆ فلان وولاتی ئەوروپا. چیم هەوڵ دا هەموو جار ئەم بەیت‌و بالۆرەیە نەووترێتەوە، بەشێر ووتەنی ئەچووە دیماغیانەوە. ئیتر باوەڕ بکەن من بۆ ئەوەی هەموو جار ماندوو نەبم هەموو ئەم سەرەتایانەم نووسیبۆوەو هەر ژمارەکەو وولاتی ئاسن بۆ نێرراوم هێشتبۆوەو دەمنووسی‌یەوەو دەمدانێ. ئەمە قسەیەکی خۆشی برای کۆچکردووم قادر دیلانم دێنێتەوە یاد. ئەویش لە ڕادیۆی پراگ ئیشی دەکرد. کە ئەندرۆپۆڤ مرد، ووتی: هەواڵەکەم وەك خۆی بە درێژی نووسیوەتەوە، چونکە ئەوەی پاش ئەو دێت پیرەو بەم زوانە دەمرێت، هەر ناوەکە جیاواز دەبێت.

بەرنامەکەی ئێمە بە شەو بوو، لە سەرلەبەیانی‌یەوە بروسکە لە مۆسکۆوە دەهات، یەك لە دووای یەك باسی کۆنگرەی دەکرد. لە هەموویاندا دووبارەیەکی ئەوی پێشووی تێدابوو، تا ئێوارە سەرەتا کە پێنج شەش جار دووبارە دەبۆوە. هەموویم هەڵگرت‌و بردمە لای جێگری موختار موعەلیم کە کەریم موعەلیم بوو، تێمگەیاند کە ئێمە ماوەمان کەمە لە هەموو بروسکەیەکدا ئەوەی پێشوو

و پێشووتر دووباره دەبێتەوە. ئەمە جوان نییەو کاتیشمان لەدەست دەدات. له وەڵامدا ووتی: نا ناگرێت ئەوه له مۆسکۆوه هاتووه. دیاره بۆ من ئەویان قانزاج بوو، چونکه دووبارەکانم دەنووسییەوەو پارەی وەرگێڕان به دێڕ حساب دەکرا. که لای کەریم موعەلیم هاتمه دەرێ سەنان پرسیی: ها چیت کرد. ووتم: دەتەوێ کاری عاقڵانه به کەریمه کەر بکەم. زۆر پێکەنیو ئیتر له نێوان منو ئەودا هەر کەریمه کەر، یا کەری ڕووتی بەسەردا بڕا. ئەوسا نەمدەوێرا ئەمه بۆ کەس بگێڕمەوه، چونکه دەیانووت: چۆن وا به هاوڕێیەکی مەسئول دەڵێیت.

خوشکه نەسرین فەخری (دوکتۆر)یش له ڕادیۆی باکۆ کاری کرد. یادگاری ئەو جێی تری هەیه.

## دەنگی گەلی عیراق:

به تەواوی نازانم له کەیەوه حیزبی توودەی ئێران ڕادیۆی پەیکی ئێرانی کردبۆوه. ئەو ڕادیۆیه ناوونیشانی سندووقێکی پۆستەی له ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا (ئەڵمانیای دیموکراتی DDR) دەدا تا بەو ناوونیشانه نامەی بۆ بنێررێ. سەرەتا هەر به فارسی بوو. ساڵی ۱۹٦۲ له باکۆ بووین کاک عەلی گەلاوێژ هات بۆماڵئاوایی. چونکه بەشی ئازەریو کوردی لەو ڕادیۆیه دەکرێتەوه. شەو کۆمەڵێك کورد کۆبووینەوه، کاک عەلی ناوی ئەو ئازەریانەی دەووت که لەگەڵیدا دەچن بۆ ڕادیۆ، دەیووت: فلانیش دێتو فلانیش دێت. به ئاسایی دەیووت: دەچین بۆ بولگارستان. که یەکێك لێی پرسی بۆچ ڕادیۆکه له ئەڵمانیای دیموکراتی نییه. ووتی: نا، ئەو ناوونیشانه بۆ شوێنه وونییه. ئێران پێوەندیی به ئەڵەمانیای دیموکراتییەوه نییه، به بولگارستانەوه هەیەتی لەبەرئەوه ئەو ژمارەیه ئەدەن. کاک عەلی هەر به گەیشتنی نامەی بۆ ئەناردین، ناوونیشانەکەی —سۆفیا سندووقی پۆسته ژماره ٥٠ بوو. خۆیو کاک حەسەنی قزڵجی کارمەند، واته: وەرگێڕو نووسەرو بێژەری بەشی کوردی بوون. زوربەی بەرنامەکەیان وەرگێڕانی بەشه فارسییەکه بوو، بەڵام کاک عەلی

شاعیرو کاك حەسەن نووسەر، سیمایەکی ئەدەبییان بەخشیبوو بە بەرنامەکانیانو جاروبار بەرهەمی ئەدەبیشیان بڵاودەکردەوە.

نیوەڕۆی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ لە زانستگا لە یەکەم موناقەشەی نامەی دوکتۆرای یەکەم (کاندیدات)ەکەم بووبوومەوە. زۆر بە دڵخۆشییەوە هاتمەوە، چونکە سەرەتای خوێندن تەواوکردنو گەڕانەوە نیشتمانبوو. دۆستێکی زۆر خۆشەویستی کەمالو نەسرینو من کە لە مۆسکۆ لە کۆرسی زماندا پێکەوە دەمانخوێند (تاریق تاها دەروێش- بەسرەیی) هاتبوو بۆ باکۆ بۆ سەردانمان. کاك ڕەحیمیش بووبوو بە دۆستی. بەرنامەی بۆ دانابووین. دەبوو هەموو لای نیوەڕۆ لەماڵی نەسرین چاوەڕێی من بن. من بە خۆشییەوە هاتمەوە. تەماشا ئەکەم هەموویان ماتن، ڕوویان گرژ کردووە، بە ساردییەکەوە وەڵامی سڵاویان دامەوە. هیچ هەواڵی موناقەشەیان لێ نەپرسیم، لام سەیر بوو، وامزانی نەسرین تووڕەی کردوون، ووتم چییە، چیتان لێ بەسەرهاتووە. تاریق بە دەنگی بەرز ووتی: "عبدالناصر احتل العراق" واتە: عەبدولناسر عیراقی داگیرکرد، ووردە ووردە دایان بە دەستەوە کە لە بەغدا کودەتا بووەو عەبدوسەلام عارف بووە بە سەرۆك کۆمار. جارێك هەر ئەوەندەیان زانیبوو. ناویتر نەوترابوو، بە پێوەندیی کۆنی ناسریەکاندا وایازانیبوو کودەتایەکی ناسرییە. هەر جارەی یەکێکیان گوێیان دەنا بە ڕادیۆکەوە بۆ ئەوەی گوێیان لە بەغدا بێتو هەواڵی تازەمان پێ بڵێن. پاش تۆزێك کاك ڕەحیم هات، کەوتینە قسە. ووتم: کاتی ئەوە هاتووە سوود لە یەکی ئێرانەکەی ئێوە ببینین، ووتی: ڕاستە. ووتم: جا چۆن، ووتی: بروسکەیەك بۆ نوێنەرانی حیزبەکەی خۆتان بنێرەو ئەو پێشنیازەیان بدەرێ. ووتم: من پێوەندیم بە ڕێکخستنی قوتابیانەوەیە، لەگەڵ ئەوانیش ڕێك نیم[٨]. ووتی: کاتی ئەو باسە نییە، بنووسە: (کۆمیتەی مەرکەزیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت، بۆ نوێنەرانی حیزبی شیوعیی عیراق لە مۆسکۆ)، ئەو ئەدرەسەم نووسیو بۆم

نووسین: (هاوڕێیان، لەم کارەساتەی گەلی عیراقدا، هەموو ناخۆشیم ئەخەمە لاوە، ئامادەم بۆ گەڕانەوە، هۆو ڕێگەی گەڕانەوەشم هەیە. پێشنیازم وایە سوود لە ڕادیۆی حیزبی توودەی برا ببینرێت بۆ یاریدەی گەلی عیراق)[٩].

بۆ سبەینێ ئێوارە ڕادیۆی یەکی ئێران هەر بە ناوی خۆیەوە کەوتە بانگەوازو باسی بەربەرەکانی لە بەغدا. کاك عەلی بە کوردیو ماموستا حەسەنی قزڵجی بە کوردیو عەرەبی. ماموستا قزڵجی بە عەرەبییەکی پتەو بەرنامەکەی دەنووسی، بەڵام لە ڕووی فۆنەتیکەوە شتی کوردانەی تێدەکەوت وەك کۆتایی هێنان بە (والنسر لکم) بە (سین) لە باتی (والنصر لکم) واتە: هەر سەرکەوتوو بن. بە ڕاستی ئەوەش دەچێتە سەر خزمەتو جوامێرێکانی قزڵجیی شەهید.

پاش دوو ڕۆژێتر دەنگێتر پەیدابوو، دیاربوو لە پراگەوە عەزیز حاجو چەند کەسێتر تۆماریان دەکرد. وا بزانم مانگی نەبرد بانگیانکردم بۆ مۆسکۆ، کە چووم کاك عەزیز وەتبان (وطبان) سەرزەنشتی زۆری کردم کە بۆچ لە ڕێی ئەوانەوە (واتە: قوتابیان)ەوە برووسکەم نەناردووە. ئەوسا پێی ووتم: بەڵێ داوایان کردوویت. بزانە ئەوان چیت پێدەکەن. وادەیەکی بۆ دانام کە سبەینێ لای میترۆی مایەکۆفسکی یەکێك کە یەکتر دەناسین دەمبینێ. کە بۆ سبەینێ چووم لەناو قەڵەبالغدا لە میترۆ هاتمە دەرەوە کەسم نەدی، لە پڕ یەکێك لە پشتەوە باڵی گرتم. تەماشامکرد: ئەبو حەسسان- سابیت (ثابت) حەبیب ئەلعانییە. گەرمیو ساردیی یەکتر بینینم دایە دەست ئەو. زۆر بە گەرمی باوەشی پێداکردمو ئەملاو ئەولای ماچکردم. چووینە قاوەخانەیەك دانیشتین، یەکتریمان باش دەناسیو زۆرمان یەکتر دیبوو، بەڵام یەکەمین یەکتر بینینی لە چاپخانەیەکی ئەبوو نواس هێنایەوە یادم کە لە سلێمانییەوە ساڵی ١٩٥٦ بو کاری قوتابیان چووبووم، ئەوسا بە ناوی خۆیو (جەماعەت)ەوە واتا – سەرکردەکانی حیزب لە دەرەوەی ووڵات- زۆر سوپاسی کردمو ناردنی ئەو

بروسکەیەی بەو پەلەیەو بەو ڕێگەیەدا بە نیشانەی دڵسۆزیو زیرەکی داناو ووتی: ئێمە ئەو ڕادیۆیەمان هەر دەهات بە بیردا، بەڵام وا بە زوویی نا: ئەوسا باسی گەڕانەوەمانکرد- دوو ڕێگەم لە بیردا بوو، یەکەم: لەگەڵ کاك حەمەدی مەولوودا لە ڕێی ئاوی ئاراسەوە، چونکە ئەو هەمیشە باسی ئەو ڕێگەیەی دەکرد بۆ چوونەوە ناو شۆڕشی کورد. دووەم: لە ڕێی شەهید پەروێزی حیکمەت جووەوە کە ماوەیەك لەوەپێش لە مۆسکۆ دیبووم. کە لە ئێرانەوە هاتبۆوە. پاش یەکەم جار بە دزییەوە گەڕانەوە ئێران. لە مۆسکۆوە چوومەوە بەرلین. ئەبوو حەسان باسی خوێندنەکەمی لێپرسیم ووتم: موناقەشەی یەکەمم تەواو بوو، مانگێك -دووان لە هەموو شت دەبمەوە. ووتی: لەگەڵ سوپاسو پێزانینو پێویستیماندا بچۆرەوە باکۆ، خوێندنەکەت تەواوکە ئەوسا خێرا وەرەوە مۆسکۆ. ئامانەوێ بۆ یەك – دوو مانگ خوێندنو شەهادەت لە کیس بدەین.

ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٢٤ موناقەشەی نامەکەم کرا، ئەمگەیاندە کۆتایی مانگ چووم بۆ مۆسکۆ. ئەمجارە هاوڕێ (سەلام ناسری)[١٠] (عبدالسلام الناصری) دیمی. ووتی: کۆنگرەی خوێندکارانی کورد هەیە لە میونیخ، وەك جاران ئامادەکردن لەسەر تۆیە. بچۆ کۆنگرە، بزانە پەروێز لە بەرلین ماوە یا نا چەند زانیاریو ڕێگەی بینینی خویی لێ وەرگرەو وەرەوە.

چووم بۆ ئەڵەمانیا کارەکانم جێبەجێکرد، هاتمەوە مۆسکۆ، هاوڕێ سەلامم دی، ووتی: خۆت ئامادەکە چەند ڕۆژێکیتر دەڕۆیت بەرەو ئەڵەمانیا، من لە خەیاڵی ڕۆیشتنەوەی وولاتدا بووم، خۆم سووك کرد. کتێبخانەکەم لە باکۆ دانابوو. جلوبەرگی زۆرم هەبوو، پارەشم زۆر بوو (چونکە لە پاڵ خوێندندا کارم دەکرد)، هەر خۆمو جلەکانی بەرمو جانتایەکی بچووك ئامادەی سەفەر بووم (لە شوێنیتردا باسی ئەمە دەکەم). پاش چەند ڕۆژێك یادی بەخێر (محەمەد عەلی ماشتە- الماشطة) کە یەکێك بووو لە بەرپرسیارانی قوتابیان

ووتی: بەیانی پێکەوە دەچین بۆ فرۆکەخانە. لای کەس باسی مەکە. هەر لە فرۆکەخانە ووتی: بۆ پراگ دەچێت، لەوێ دێن بەپیرتەوە، کە گەیشتم، چیکێك رووسیی دەزانی وەستابوو، یەکسەر روویکردە منو ووتی: هاورێ عەزیز ئەلحاج ناردوومی، دەتبەمە ئوتێلی حیزب، دووایی خۆی دێت بۆ لات. ئێوارە هاتو بردمییە مالی خۆیان. ووتی: هەروا بێ پالتۆش هاتووی. ووتم: لای ئێمە گەرمە، جلوپالتۆشم پێ نابرێتەوە، لەوێ حالی منو پێشمەرگە یەکە. پێکەنیو ووتی: خۆ تۆ ناچیتەوە بۆ وولات. پرسیم ئەی بۆ کوێ، ووتی: بۆ رادیۆی گەلی عیراق. ووتم: بۆ سۆفیا. بە نارەزاییەوە پرسی: چۆن ئەمەت زانی ووتم: لە باکۆ کەس نییە نەیزانێ. هەموویم بۆ گێرایەوە. زۆر توورە بوو. ووتی: برادەرانی توودە بە ئێمە دەلێن ئێوە نهێنیتان لا نییە، فەرموو خۆیان چۆنن. داوای لێکردم ئەوەی بۆم گێراومتەوە بینووسم بۆی. چووزانم ئەمە هەلای لێ دەکەوێتەوەو کابرا ووتەنی دەبێت بە (بەهینەلدوەل). لە ئوتێل دانیشتم بۆم نووسی، تەنانەت لە فرۆکەخانە کێم دیبوو لەگەلْ کاك عەلی سەفەریانکردبوو ناوی ئەوانیشم نووسی. گوایە من بەرگری لە حیزبەکەی خۆم دەکەم بەرامبەر بە تۆمەتی حیزبێکی برا.

عەزیز ئەلحاج ئەو جارەو جاری داهاتوو کە بۆ وولات دەچوومەوە خزمەتی زۆریکردم، پالتۆیەکی باشی بۆ کریم، پارەی دامێ (نەمپرسی پارەی خۆی بوو یا حیزب). بردمییە گۆڤاری "مەسەلەکانی ئاشتیو سۆسیالیزم"، کە ئەو نوێنەری عیراق بوو لەوێ. تەلەفوونی بۆ ژنێك کرد کە نوێنەری بولگارستان بوو لە گۆڤارەکەدا، پەساپۆرتەکەی لێ وەرگرتمو بۆ سبەینێ بە ڤیزەی بولگارستانەوە دایانمەوە. سەرلەبەیانیی رۆژی دوایی چیکێك هاتە ئوتێلو ووتی: خێرا جانتاکەت بێنە خوارەوەو با بچین بۆ فرۆکەخانە (وا بە کتوپریو بێ مالئاواییەك لە دۆستان، شت کرینێك) لەگەلیدا چووم. فرۆکە ئەو سەردەمە کەمێك لە بودابست دەوەستاو ئەوسا هەمووی بە پێنج سەعات دەگەیشتە

سۆفیا. هەر لە پەنجەرەی فرۆکەکەوە چاوم لە هاورێ ئەبو خالید (ناسر عەببوود) بوو، لەبەر دەرگای فرۆکەکە وەستاوە. زانیم بە پیر منەوە هاتووە. کە دابەزیم، ئەویش یەکتر بینینێکی وەك ئەوەی ئەبو حەسسانی هێنایەوە بیرم (دیارە من لە بیرم نەچووبۆوە)، پاش بە گەرمی ماچو مووچ ووتی: من دەڵێم ئەو هاورێیە دەناسم. هاورێیان دەڵێن تۆ نایناسی. گەیشتینە ئوتێل "ڤیتووشە".

خۆمانکرد بە ژوورێکدا تەماشادەکەم: مەهدی عەبدولکەریم، عەبدولرەزاق ئەلساق، ئەحمەد کەریم (ئەبو دارا) دانیشتوونو دیارە لە حاڵی کارکردندان. گەیشتنی منیان زۆر پێخۆشبوو، ووتیان: ئەبو نەسیر (س. ئەلناسری) ووتوویەتی: رادیۆکەتان دەگەشێنێتەوە. ئەحمەد پشتی ئەو قسەیەی گرتو باسی کارو وەرگێرانمی کرد لە کۆنگرەکانی خوێندکاراندا. لەوێ بە تەواوی لە کاری خۆم گەیشتم، لە بەشی عەرەبیدا بێژەرو نووسەر دەبم، بەشێکی کوردیش دەکرێتەوە، هەر بە تەنیا هەموو کارەکانی دەکەم: "وەرگێران، نووسین، قسەکردن". کاروباری ئێستکە لە هەموو روویەکەوە مەهدی لێپرسراوی دەبێت. ئیشی کارگێریو پێوەندی بە بولگارەکانەوە کاری ئەبوو خالیدە. من دوو شتم ووت: یەکەم- عەملیاتێکی بچووکم هەیە دەبوو لەمۆسکۆ بیکەم. دووەم- پێشەکی بزانن من دەنگم ناسراوە- هەر ئەوەندەم ووتو لەسەری نەرۆیشتم. بۆ سبەینێ ئەبوو خالید هاتو بردمیە نەخۆشخانە، چەند رۆژێك لەوێ کەوتمو کارەکەم بە باشی سەرکەوت. کە هاتمە دەرەوە. دوو ماڵ درابو بە برادەران، یەکێکیان لەناو شار. ئەحمەدو مەهدیو ژنەکانیانی تێدا بوون. دووەم: لە قەراغ شار منو عەبدورەزاقی لێ بووینو جێی کاریشمان بوو. کە میوانیشمان دەهات کە هەر "ئەبو نەسیرو عەزیز ئەلحاج" بوون –مانگی یەکێکیان دەهات بۆ لامان هەر لەوێ دادەبەزین. زۆر بە حەماسەتەوە کەوتمە کارکردن. پێشەکییەکی ئەدەبیو گەرمم بۆ کردنەوەی بەرنامەی کوردی نووسی، کە

بڕیار بوو تا هەفتەیەك هەر بەو پێشەکییە دەست پێبکەین، پاش ئەوە ووتاری سەرەکیی ڕادیۆ عەرەبییەکەم وەردەگێڕاو فریابکەوتمایە چەند دەنگوباسێك‌و بیرێکی سیاسیم بە شێوەیەکی ئەدەبی دەنووسی. بۆ بەرنامەی عەرەبیش هەر مەپرسە، لە هەموو ڕەنگێکم دەنووسی.

پاش دوو ڕۆژ ئەبوو خالید هات، بە ناڕەزاییەکەوە ڕووی تێکردم‌و ووتی: تۆ بۆ قسەت نەکرد کە هەموو کەس دەنگت ئەناسێتەوە؟ ووتم: پێم ووتن دەنگم ناسراوە. هەموو کەس، نیوەی خەڵك، دە یەکیان ئەوە کاری من نییە. ووتی: نا دەبوو باشم تێبگەیێنی، ئەگینا ئەم دەهێشت قسەبکەی، تازە بەسەرچوو، ئیتر بۆ شوێنی کار نەبێ ئەویش بە خۆشاردنەوەوە، هەقت نییە بچیتە دەرەوە.

تۆمارکردنی بەرنامەکانمان لە ماڵێك بوو لای کۆلیج یان ئەکادیمیای کشتوکاڵەوە، ستۆدیۆیەکی دوواکەوتوو لە ماڵەکەدا دروستکرابوو. ئوتومبیلە شرێکی فۆکس واگۆنی (بۆق)مان هەبوو. بەدەست مەهدییەوە بوو، ئەو ژن‌و منداڵێکی هەبوو، ئەحمەد هەمیشە گلەیی ئەوەی بوو کە دووای کار نایەڵێ ئەوو ژنەکەی سوود لەو ئۆتومبێلە ببینن، هەمیشە دەیووت: لەسەری مانگەوە دەبێ فێری لێ خوڕین ببم. بەیانیان هەردووکیان دەهاتن بە شوێن مندا. عەبدوڕەزاق چونکە دەنگی نەبوو، بۆ جێی تۆمارکردن نەدەهات. بە پێی فەرمانی ئەبوو خالید دەبوو شەپقە لەسەر کەم، چاویلکەی ڕەش لەچاو کەم، بە مل پێچەکەشم دەماغ بکەم، تا ئەگەر کەسێك لە ڕێگە بینیمی نەمناسێتەوە[١٢].

ئەم ئەچوونە دەرەوەیە ماوەی خوێندنەوەی بۆ زۆر کردم، ماوەی نووسینم بۆ زیادبوو، هەموو ڕۆژ گوێم لە ڕادیۆی بەغدا دەگرت‌و بۆ سبەینێ یا من یا عەبدوڕەزاق یا مەهدی وەڵامێکمان بۆ دەنووسین، بەرەبەر ڕۆژنامەی عیراقیمان پێ ئەگەیشت (بە تایبەتی پاش کودەتای ١٨ی تشرینی دووەمی عەبدوسەلام

عارف بەسەر بەعسییەکاندا)، ئیتر ڕێگەی نووسینی چەند بەرنامەی زیندووم بۆ کرایەوە. (رحى العرق تدور- واتە: دەستهاڕێ دادگای عوراق دەگەڕێ)، ماوراء الاخبار- لە پشت هەواڵەوە) کە بەرنامەیەکی گاڵتەئامێز بو بە ڕژێم. لەوانەی زۆر شانازییان پێوە دەکەم بیستۆ هەشت هەڵقەی زنجیرەیەك بوو بە ناوی (دفاعا عن امتي الكردية وردا على المفترين)- واتە: بۆ بەرگری لە نەتەوەی کوردی خۆم‌و لە وەڵامی بوختان کەراندا) کە زۆرتر کتێبەکانی مەحموود ئەلدوره (محمود الدورة) و محەمەد ڕەشید ئەلفیل (محمد رشيد الفيل) و نوعمان ماهیر ئەلکەنعانیم لە بارەی کوردەوە شرۆڤەکردبوو و بە درۆم خستبوونەوە. هەروەها کۆمەڵە ووتارو سەرنجی ئەدەبی بوو لە بارەی کوردستان‌و گەلی کوردو دوژمنەکانییەوە کە زۆربەی ڕۆژ دەمنووسین[١٢].

چەند ڕووداوو چەند هەڵوێست لە بارەی کارکردنم لەم ڕادیۆیەدا دەبێ باس بکرێن.

-هەمووی چەند ڕۆژێك بەسەر کارکردنمدا تێپەڕیبوو. دیاربوو ئێمە لە تۆمارکردن دەبووینەوە ئەوسا (پەیکی ئێران) دەهاتن، لە ستۆدیۆکە بووم، لێپرسراوی ئەوان (حەمیدی سەفەری- یاصەفەری) هات‌و مەهدیی بانگ کرد. دیاربوو بەو کۆلکە ڕووسییەی مەهدی دەیزانی- لەو ماوەیەی قوتابخانەی حیزبدا لە مۆسکۆ فێری بووبوو لە یەك دەگەیشتن. دووایی تێگەیشتم کە عەزیز ئەلحاج نامەکەی منی بۆ ناردبوون، ئەوانیش بە هەڵە لێکیان دابۆوە، یا بۆ سەفەری فرسەت بوو کارێکی ناڕەوا بکات. سەفەری ووتبووی: ئەوانەی ئێمەو (واتە گەلاوێژو قزڵجی)، ئەمیش (واتە. من) هەموو ناسیۆنالیست‌و بە ناچاری دەبێ لەگەڵ ئێمەدا کاربکەن، ئیتر ڕێیان لێگرتین‌و ئەو ماوەیە هەمووی یەکترمان نەدی. بۆ کاك عەلی هەردەم‌و چاویم نەدی، بەڵام کاك حەسەن، لە ڕۆژی ١٨ی تشریندا یەکمان دی. هەموویان زۆریان لا سەیر بوو کەوا بە گەرمی باوەشمانکرد بە یەکدا.

رۆژی ١٨ی تشرین، لە تۆمارکردن هاتینەوە (بەرنامەمان بەیانی تۆمار دەکردو شەو بڵاودەکرایەوە). رادیۆم کردەوە گوێم لێ بوو عەبدولسەلام بەیانەکەی دەخوێندەوەو لە ئێمە خراپتری بە بەعسیەکان دەکرد. عەبدورەزاق چوو ئەحمەدو مەهدیی هێنا. بڕیارمان دا فریاکەوین. چونکە خەڵك شەو گوێمان لێبگرن ناگامان لە ڕووداوی گەورەی وەك ئەمڕۆ نییە زۆر شەرم دەبێت. هەروەها عەبدولڕەزاق چوو ئەبوو خالیدی دی. لای عەسر هاتو هەمووومان چووینە بینای ستۆدیۆکە، کاك حەسەن لەوێ بوو ئەوە جاری یەکەمبوو لەساڵی ١٩٦٠ەوە یەکتری ببینینەوە. کەوتینە نووسینی بانگەوازی تیژ، بۆ گەل، سەربازان‌و ئەفسەران‌و سوپا. مەهدی تا ئەوکاتە زۆر تیژ بوو بەرامبەر بە بەعس، لە زۆر بۆنەدا لەناو شەهیدانی شوباتدا ناوی برا گەورەکەی (کازم عەبدولکەریم- کاظم عبدالکریم)ی دەهێنا کە ئەفسەرێکی کۆمۆنیست بوو لە کودەتادا تیرباران کرا[14]. (هەقی خۆشی بوو). من فریای وەرگێڕان نەکەوتم، ووتم: یەکسەر وەریدەگێڕم. هەرسێکمان‌و ئەبوو خالیدیان بردە ئێستگەی ڕادیۆی سۆفیا (ئەوە تاقە جار بوو). لەو بانگەوازانەدا کە مەهدی نووسیبوونی ووترابوو (ایها الجنود الوطنیون، اقتلوا الضباط الخونة- واتە: ئەی سەربازە نیشتمانپەروەرەکان، ئەفسەرە خاینەکان بکوژن). پاش دوو ڕۆژ مەهدی‌و ئەحمەدو ئەبوو خالید پێکەوە ئێوارە هاتنە ماڵەکەی ئێمە (دووانی یەکەم ئاسایی دەهاتن تا بەرنامەی سبەینێ ئامادە بکەین. بەڵام هاتنی سێیەممان لەو کاتەدا لا سەیر بوو). مەهدی زۆر پەست‌و غەمگین بوو، وامانزانی دیسان لەگەڵ ئەحمەددا لەسەر کاروباری ماڵەکەیان ناخۆشیان بووە. ووتی: با دانیشین کۆبوونەوەیە، دەبوو ئەبوو خالید دەست پێ بکات، بەڵام مەهدی خۆی دەستی پێکرد: هاوڕێینە –ئێمە هەڵەیەکی گەورەمانکرد، پەلەمانکرد، ئەبوو ئەسیر تەلەفوونی بۆ کردم، ڕەخنەی گەورەی لێگرتم، لە هەموو ژیانی حیزبیمدا وا بە تیژی ڕەخنەم لێ نەگیراوە. بە تایبەتی ئەو

بانگەوازەیان زۆر لا خراپ بووە، من ڕەخنە لە خۆم ئەگرم، ئێوەش ئارەزووی خۆتانە، من یەکەم لێپرسراوم‌و هەمووم خستۆتە سەرشانی خۆم، بەڵام ئێوەش لەگەڵمدا بوون. سیانەکەیتر کەم یا زۆر ڕەخنەیەکیان لە خۆیان گرت، من دەمزانی شتی نووسراو یا تۆمارکراوی لەبەردەستدا نییە، ئەحمەد باش تێم نەگەیشتبووە و بەو دەستو بردە مەبەستیان نەبووە بزانن من چیم وتوە، وتم: من هیچم نەووتوە، ماوەکەم کورت بوو، تەنانەت لە دە دەقیقەکەشتان خوارد. ئەبوو خالید وتی: ئەی ئەوە تۆ نەبووی وەك بانگ بدەیت هەردوو دەستت خستە پەنا هەردوو گوێت‌و کەوتیتە هاوار. هێشتا نەمپەرژاوە لە هاوڕێ کوردەکانی سۆفیا بپرسم. بەڵام بە هەموو حاڵ پەلەمانکرد، هەڵە بوو، هیوام وایە هاوڕێ مەهدیش وا خەم داینەگرێ. مەهدی وتی: هاوڕێ، لە ژیانی حیزبیمدا هەرگیز نە ڕەخنەم لێگیراوە، نە بەم جۆرە ڕەخنەم لە خۆم گرتووە. نازانم من بووم یا ئەحمەد وتمان: "عفی الله عما سلف"[١٥].

بڕیمانەوە، بەڵام ئەمە کاری کردە سەر پێوەندی‌و کاری لەمەودوامان.

ئەو بەزمەی کودەتای ١٨ی تشرین وا سەرشکێنی کردین. (بە تایبەتی مەهدی)، کە لە هیچ شتێکی تازەدا ڕای خۆمان نەدەین. گرنگترین ڕووداو کە هاتە پێشەوە. ڕێکەوتننامەی ١٠ی شوباتی ١٩٦٤ بوو لە نێوان بەرزانی‌و حکوومەتی عیراقدا. ئێمە لە تودەکانمان بیست. ئەوان لە ئێمەیان دەپرسی‌و ئێمە هیچ وەڵامان نەبوو. ڕۆژی یەکەم تەنیا هەواڵێکمان لە بارەیەوە بڵاوکردەوەو مەهدی چوو بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ ئەبوو ئەسیر کرد. هاتەوە وتی: مەسەلەی کورد بە تێسکەی تفەنگیش بەلای چاکی‌و خراپیدا نەچووین، شەو درەنگ کار بە جۆرێك چارسەر دەکرێت کە سوودی گەلی کوردو گەلی عیراقی تێدابێت. مەهدی یەکسەر کەوتە پشتگرتنی ئەو ڕایە، من‌و ئەحمەد بە ئەقڵماندا نەچوو، بەڵام هیچ هەواڵ‌و بەڵگەمان لانەبوو. عەبدوڕەزاق بەینە بەین بوو. بڕیارمان دا بە هێواشی بکەوینە باسی ئاشتی‌و سوودی ئاشتی‌و

دوورکەوتنەوە لە شەڕ. داوا لە ئەبوو نەسیر بکەین لێکۆڵینەوەی نووسراومان بۆ بنێرێت. سەیر ئەوە بوو عەزیز ئەلحاج خۆی لەگەڵ ئەو ڕێکەوتنەدا نەبوو، بەڵام چ بە نوسین، چ لە کاتی سەردانی ئێمەدا هیچی دەرنەئەبڕی. تا ئەوە بوو لە ١٠ی شوباتی ١٩٦٥دا لە کۆبوونەوەیەکدا لە پراگ ڕای دەربڕیبوو، گاڵتەی چ بە حکوومەتەکەو چ بەو ڕێکەوتنە کردبوو، دروشمی ڕوخاندنی حکومەتەکەی هەڵگرتبوو، ئەوکاتە من لە مۆسکۆ بووم. ئەمە لە لایان هاوڕێیانەوە (بە تایبەتی باقر ئیبراهیم بە یاخیبوون لە حیزب درایە قەڵەم).

تا لە سۆفیا بووم هەڵوێستی ڕادیۆکەمان لەو نێوانەدا چەقیبوو، لەبەرئەوە چ بە کوردیو چ بە عەرەبی هیچم لە بارەی ئەو ڕێکەوتنەوە نەنووسی. کە چووشمە مۆسکۆ ئەوە چیم دەنووسی، خۆم هەڵمدەبژارد، لەبەرئەوە بە لای ئەو مەسەلەیەدا نەچووم. کە لە کۆتایی ١٩٦٥دا هاتمەوە کوردستان، شەڕ دەستی پێکردبۆوە. باسی ئەو ڕێکەوتنەم لای بەرزانیی نەمر کرد، ڕایەکی زۆر وردو زیرەکانەی دامێ کە لە کاتی خۆیدا باسی دەکەم.

ئەو ماوەیە کە ئیتر هەڵوێستی توندوتیژمان لێ قەدەغە کرا. ئەحمەد دەیووت: کاکە ڕۆژێك دێت، دەبێ من گۆشەی وەرزشو تۆ گۆشەی چێشت لێنان بۆ ئەم ئێستگە شۆڕشگێڕە بنووسین (خۆزگە ئەحمەد تا ئێستاش هەر ئەو هەڵوێستە شۆڕشگێڕانەیەی دەما. بە نەرمتریش بووایە).

وورده وورده ئەوەی پێی ووترا (خەتی ئاب) دەردەکەوت. ئەبوو نەسیر بە گەرمی لەگەڵ ئەو هێڵەدا بوو. عەزیز ئەلحاج بێدەنگ دیاربوو، لە کاری ئێستگەدا شتێکی ئاشکرای پێوە دیارنەبوو. ئێمە دابەشبووبووین. مەهدیو عەبدولڕەزاق تەواو لەگەڵ خەتەکەدا بوون. ئەحمەدو من لەگەڵی نەبووین. من بەردەوام بووم لەسەر تیشك خستنە سەر لایەنە سیلبیەکانی ڕژێم، بە تایبەتی ئەو دەنگوباسی گرتنو تەنانەت خنکاندنەش کە بەردەوامبوو، ئەحمەد نەیدەنووسی، بەڵام شتێکی بە دڵ بووایە زۆر بە گەرمی دەیخوێندەوەو شتێکی

بە دڵ نەبوایە، بە تایبەتی ئەوانەی سەر بە هێڵەکە، بە تەواوی دەیمراند. مەهدی‌و عەبدوڕەزاق زوو کەوتنە نووسین بۆ بەجێهێنانی خەت‌و ڕێبازەکە. چەند ووتارێکمان بۆ هات، مەهدی دەیووت: ئەمە نووسەرێکی گەورە نووسیوی‌یەتی —تێگەیشتین کە عامیر عەبدوڵلایە. لە سەردانێکیدا ئەبوو نەسیر بە چەشنە تووڕەبوونێکەوە لێی پرسیم: ئەرێ ئەم حکوومەتە هیچ کاری باشی نی‌یە وا تۆ چەکوشت لێ هەڵگرتووە. ووتم: هاوڕێ (کاربەشکردنە-تقسیم العمل)، ئێوە باسی لایەنە باشەکان دەکەن‌و من لایەنە خراپەکان.

لەگەڵ ئەحمەددا لە مەسەلەی کورددا نەبێت، لە هەموو شتێکدا ڕێك بووین، هەڵوێست بەرامبەر بە ڕژێم، دۆستایەتی، قسەی خۆش، خێزانەکەی (کە چیك بوو)، بە ڕاستی خوشکێکی میهرەبان بوو. هەرچی مەسەلەی کوردە، ئەحمەد لەدایك‌و باوکەوە کورد بوو، باوکی وێڵەدەری، دایکی فەیلی، بەڵام لەناو عەرەبدا لە بەغدا گەورە بووبوو، دەمێك بوو چووبووە پراگ، لەوێش پێوەندیی لەگەڵ هەندێ لەو شیوعی‌یە عەرەبانەدا هەبوو کە ئەو سەردەمە دەمارگیریی عەرەبی‌و بەرەو ناسریەتیان لێ دەتکا. من بێجگە لە هەموو بیروهەستی خۆم دەمویست ڕادیۆکەمان پشتی کوردو شۆڕشی کورد بێت‌و بە زمانێك بێت کورد گوێی لێ بگرن. بەڵام ئەوە نەدەچووە ئەقڵی ئەوەوە، نە ئەقڵی دوو برادەرەکەیترەوە. دەبوو ووتارە سەرەکی‌یەکانی ئێستگە عەرەبی‌یەکە وەرگێڕم، کە هەندێکجار بە کوردی دەمنووسی، بە تایبەتی شتی ئەدەبی دەبو بە دەم بۆیان وەرگێڕم.

جارێك لەسەر ڕستەی (لە پێناوی کوردو کوردستاندا) لێمانبوو بە هەرا، ئەحمەد دەیووت: من حیزب بەم ووشە شۆڤێنیانە پەروەردەی نەکردووم. گەیشتە ئەوەی پێم بڵێت: دەزانم پارتی بۆچی تۆیان فڕێداوەتە ناو حیزبەوە (داسیك بالحزب). جارێك هەر وەرگێڕانی ووتارێکی مەهدیم دەخوێندەوە، ئەحمەد لەودیو ستۆدیۆوە ڕایگرتم، پرسی: کاکە (پەروەرەکان) مانای چی‌یە،

تومەز من ئاگام لێ نەبووە، هەمیشە لەو ژوورەوە بەو کوردییە کەچەی خۆی چاودێریی منی پێ سپێرراوە، کە (الوطنییون)م کردووە بە (نیشتمانپەروەرەکان) وا تێگەیشتووە ووشەم لێ زیاد کردووەو بووە بە دوو ووشە. مەهدی لەم کارەدا نزیکی ئەحمەد بوو، بەڵام عەبدوڕەزاق بێدەنگبوو. ئەوە نەبێ جاروبار بە ناوی گاڵتەوە قسەیەکی هاوڕێ خالید بەکداشی دەدایەوە بە گوێمدا[١٦].

لە سەعاتێك هەر دە دەقیقە بۆ کوردی دانرابوو. زۆرجار ٣-٥ دەقیقەیان لێ دەخوارد کە ناڕەزاییم دەربڕی، مەهدی ووتی: ئەو دە دەقیقەیەش زیادە، چونکە کورد هەموو عەرەبی دەزانن. کە کەوتمە موناقەشە لەگەڵیدا بەڵگەی ئەوە بوو کە خێزانی خۆی کە کچی پیاوێکی ناسراوی کورد بوو عەرەبی باش دەزانێ، کێی لە بەندیخانە دیوە عەرەبی دەزانن، هەردووکمان لە یەك کۆلێج بووین لە بەغدا هەموو هاوەڵە کوردەکانمان عەرەبییان دەزانی. لێی پرسیم: باشە تۆ کورد نیت کەچی عەرەبی لە هەرسێکمان باشتر دەزانیت. قسەی من سوودی نەبوو. مەهدی لە ڕاستیدا تێکۆشەرێکی دڵسۆز بوو، فیداركار بوو، لە ساڵانی هەشتادا لە چیاکانی کوردستاندا لەناو پێشمەرگەدا کۆچی دوایی کرد. بێگومان ئەو کاتە کە کوردی عەرەبی نەزانی زۆر دیوە ڕای گۆڕیوە.

ناکۆکیی نێوان سۆڤێت و چین تەواو تیژ بووبوو، حیزبی شیوعیی عیراق بە کاڵەو پێتاوەوە لەگەڵ سۆڤێت بوو. تەنانەت ئەگەر لە زۆر لە حیزبەکانی ناوچەو جیهاندا خەڵکی سەر بە چین هەبووبن جیابووبنەوە (ئەحمەدی قاسمی- توودە)، (ئەحمەد عومەر- سوودان) ئەوا لەناو حیزبی شیوعیی عیراقدا کەس لایەنگری چین نەبوو، هەندێك لەو سەرکردانەی ئەو سەردەمە دوورخرابوونەوە بۆ سەلماندنی دڵسۆزیی خۆیان بۆ هێڵی سۆڤێت یا بۆ پەشیمانی نواندن لە هەندێ پشتگیریی کۆنیان لە چین (پێش ناکۆکی)، زۆر تیژ بوون بەرامبەر بە چین. بۆ نموونە: زەکی خەیری لە ١٩٤٦دا (رجل آسیا-

پیاوی ئاسیا)ی لە بارەی ماوتسی تۆنگەوە نووسیبوو و (دیموکراتیی نوێ)ی وەرگێڕابوو. لە ١٩٥٩ لە ڕۆژنامەی حیزبدا (اتحاد الشعب) ڕیزە ووتارێك بە ناوونیشانی (بژی لێنینیزم) لە ڕۆژنامەی (جیمین جیباو)ی چینیەوە وەرگێڕرابوو. هەندێك دەیانووت عامیر عەبدوڵلا وەریگێڕابوو و بڵاویکردبۆوە.

ئێمەش لە ڕادیۆ زۆر لەگەڵ هێڵی حیزبو سۆڤێتدا بووین، بە تایبەتی مەهدی. منیش هەرچەندە کاتی خۆی ساڵی ١٩٥٤ لە پاڵ چەند کتێبی مارکسیدا لە عەرەبیەوە "چۆن دەبی بە کۆمۆنیستێکی چاك"[١٧]ی. (لیوشاوشی)م کردبوو بە کوردیو حیزب چاپی کردبوو، بەڵام ئەوە پێوەندیی نەبوو بەسەر ئەو بە دەروێشیەمەوە بۆ هێڵی حیزبو سۆڤێت. ئەوەندەم سۆڤێت خۆش دەویست، لە کونی دەرزیشەوە ئەوەم نەدەدی کە سەرەتای لادانێکی گەورە دەستی پێکردووە. لەبەر ئەوە کە بڕیاریان دا هەفتەی دوو جار دەبێ باسی چین لە بەرنامەکانماندا بکرێت زۆر بە گەرمی پشتی ئەو بڕیارەم گرت. بەڵام کە مەهدی بڕیاری دا دوو ڕۆژی بەرنامەکەی کوردیش بۆ ئەوە تەرخان بکرێت ووتم: ئەمەیان نا. چونکە بەرنامەکەی من تەنیا دە دەقیقەیە واتە ٧٠ دەقیقە لە هەفتەدا (ئەگەر ئەوەندەشم بدرێتێ)، ناکرێ ٢٠ دەقیقەی بۆ باسێك تەرخان بکەم کە زۆر دوورە لە باری کوردستانەوەو کەس گوێی لێناگرێت. پاشان بە کوردی ئەوە برادەرانی توودەو (یەکی ئێران)، ڕۆژی سەعاتێکی کوردیان هەیەو قسوور لە چینو باووباپیری ماوتسی تۆنگ ناکەن، چیتان دەوێ دەینووسم، وەریدەگێڕم بیدەن بە وان. مەهدی زۆر بە توورەیی وەڵامی دامەوە، قسە لە منو قسە لەو گەیشتە ئەوەی بڵێ: تۆ سەر بە هێڵی چینیت بۆ لەناو ئێمەدایت. بەڵام بەوەی باشبوو ئەحمەدو عەبدولڕەزاق لەگەڵ من وەستانو هێمنیان کردەوە. دەستی کردە ملمو ووتی: منو تۆ لە ڕۆژانی خوێندنەوە یەکتر دەناسینو لە دڵسۆزیت دڵنیام، کەواتە قسە لەگەڵ "توودە" یەکیان دەکەم. بۆ سبەینێ ئاغای "صەفەری" هات، ووتی: قەیناکا، ڕۆژی ٢-٥ دەقیقە بە

پێوە لەگەڵ قزڵجیدا لەبەر دەرگای ژوورەکە یەکتر ببینن، چیتان دەوێ بۆ یەکتری بنووسن، زۆر قسە لەگەڵ یەکتر مەکەن، شتی زۆر پێویست نەبێت.

ئەوە دەرگایەکی خۆشی بۆ کردمەوە، هەموو ڕۆژ یەکترمان دەدی، من لەو جنێوفرۆشتر بووم، لە جێی سڵاو جنێوێکمان بە حەزرەتی (صەفەری) دەدا، لەناو بەرنامەکانی یەکتردا بە نامە بۆ یەکتر قسەمان بە هەردوو حیزب و ڕەفتاریان دەووت لەگەڵمانا (دیارە لە مەدا ئەو زیاتر). نەخشەیماڵەکەیی بۆ کێشام کە بە دزییەوە بچمە لای. بەڵام تێم گەیاند، کە من هەر لە ماڵ چوونە دەرەوەم قەدەغەیەو خۆ ئەگەر ئەمە بە ئاغای سەفەری بگاتەوە من تەسلیمی عیراق و ئەو تەسلیمی ئێران دەکاتەوە. وەك ووتم: کاك عەلی لە دەرکی دەلاقەشەوە خۆیی پیشان نەدام. من لەگەڵ خۆی و خاوو خێزانیدا لە باکۆوە یەکترمان دەناسی. ئەم یەکتر بینینە لەگەڵ قزڵجیدا سوودی بۆ ڕێکخستنی بەرنامەکانیشمان هەبوو. قزڵجی تێبینی ووردی لەسەر زمانی کوردش بۆ دەنووسیم، بە ڕاستی سوودم لێ وەرگرت، هەر بە ئیزنی مەهدی یا بە دەستی ئەودا نامەی کاندیداتەکەم (دوکتۆرای یەکەمم) دانێ، کاك حەسەن و کاك عەلی پەسندیەکی چاکیان لە بارەیەوە نووسیبوو.

لەو ماوەیەدا خەریکبووم بە نووسین و وەرگێڕانەوە دەنگ نەگەیشتن بە کەسدا وای لێکردم کە زۆرجار خۆم ووشە داڕێژم یا داتاشم. دەفتەرێکی باشم لەو وشەو ڕستانەی تایبەتی بە کاری ڕادیۆوە پڕکردبۆوە، بەڵام بە داخەوە وەك وتارو وەرگێڕانەکان ئەوانیش فەوتان، هەندێك لەو وشانەی یەکەمجار دامتاشیون لە کوردیدا چەسپین لەوانە: "گەش بین"، "ڕەش بین"، "بەڵگەنەویست"م لە بیرە.

دەنگەدەنگی هەموو ڕۆژەمان و بە تەنیا لەو نیمچە بەندیخانەیەدا ژیان، بیستنی هەواڵی کۆچی دوایی باوکم، بێ ئەوەی هیچ یەکێك لەو سێ هەواڵە سەرەخۆشیشم لێ بکەن، وایان لێکردم کە خۆم پێشنیاز بکەم کە یا بگەڕێمەوە

وولات، یا بچمەوە مۆسکۆو لەوی کاری باشتر (بە پێی نەخشەیەك کە پێشکەشم کرد) بۆ ئێستگە بکەم. پاش ماوەیەك لە مانگی مارتدا ئاگاداریانکردم کە حیزب رازییە لەسەر گەڕانەوە مۆسکۆمو خۆم ئامادە بکەم تا کەسێك پەیدا دەبێت جێگەم بگرێتەوە.

بەرنامەی هەفتەیەکی لەوەدووام تۆمارکرد، وامدەزانی تا هەفتەیەك پاش گەیشتنم ئەو جێگرەوەیە نایەت.

پێش رۆیشتنم مەهدی شەوێك دەعوەتیکردم، ئەو لە ژیانیدا هەر پیاوێکی جیددیو دوور لە موجامەلە بوو، لام وابوو ئەم بانگردنە کاری خێزانێتی کە بە راستی منی بە یەکێك لە براکانی دەزانی، بەلام کە دانیشتین ووتی: مەبەستم لەم دانیشتنە ئەوەیە کە هەندێك تێبینیت بدەمێ. چونکە لە حیزبدا رێو شوێنێکی وامان هەیە کە دوو برادەر لە یەك جیابوونەوە تێبینی بدەن بە یەکتر.

تێبینییەکانی هەر ئەوانە بوو کە لە کۆنەوە لە کاتی خوێندنمانەوە کە ماوەیەك لێپرسراوم بوو لێم بیستووە، ووتم: ئەوانە کۆن بوون، حەزنەکەم لە بارەی ماوەی کارکردنی ئێستگەوە بدوێیت. لەو رووەشەوە ووتی: تۆ هەمیشە لەگەڵ هێڵی حیزبدا یەك نیت، دەبێ لە مەسەلە تازەکانی کۆمۆنیستی بگەیت، وەك رێگەی ئاشتی بەرەو سۆشیالیزمی، رێگەی ناسەرمایەداریی بەرەو پێشچوون، هێڵی حیزب بەرەو بە هێمنی گۆڕینی دەسەلات.. هتد. ووتم: دیارە رێگەی منیش دەدەی قسە بکەم، دەستم پێکرد. رای خۆم بەرامبەر بەو رێبازە دەربڕی، کە بە راستی قەناعەتم پێی نەبوو، ئەوسا پێم ووت: لە ساڵی ١٩٥١ەوە یەکتر دەناسین، وا چواردە ساڵە، چەند سەرکردەییو چەند سەرکردە لە حیزبدا گۆڕان، ئێمەی خوارەوەو ئێوەی سەرەوە لەگەڵ ئەمیاندا بووینو بە بێدەنگیش بێت لەویان رازی نەبووین، رۆژێك نەمبیست تۆ لەگەڵ سەرکردەیی یا ئەو خەتەی سەرکردەی دووای ئەو بە چەپڕەو یا راستڕەوی دادەنا

نەبوویبێت. لەگەڵ هەموویان بوویت، وەڵامی ئەوە بوو کە من یا ڕێکخەر یا لە پلەی سەرەوەی تۆدا بووم لە حیزبدا، ڕای خۆم لای تۆ دەرنەبڕیوە، بەڵام لە ڕێکخراو یا لیژنەی خۆمدا ڕای خۆم هەبووە. من دیسان قەناعەتم نەکرد، کە گەیاندمیە فرۆکەخانەی صۆفیا زۆر بە گەرمی ماڵئاواییمان لە یەکتر کرد. یادت بەخێر هاوڕێ مەهدی عەبدولکەریم، بە ڕاستی کۆمۆنیستێکی دڵسۆزو ڕاستگۆو فیداکار بوویت، تا ئێستا دەرفەتم بۆ هەڵنەکەوتووە چەپکێك گوڵی کێویی بەهارە ببەمە سەر گۆڕی لە ناوچەی برادۆست.

هەر لەم دەرفەتەدا با قسەیەکی خۆشی نێوان منو هاوڕێ عەبدولڕەزاق ساق (الصاق) بگێڕمەوە. وەك باسم کرد، پێکەوە دەژیاین، ئەو دەنگی لە ڕادیۆکەوە نەدەهات لەبەرئەوە دەچووە دەرەوە، کچە ئەکتەرێکی بولگاری دۆستی بوو، زۆر کات دەچووە لای و کاتیان پێکەوە دەبردە سەر (دووایی ئەوە هاوسەری دووەمی عەبدوڕەزاق بوو، وا بزانم ماوەیەکیش پێش لە یەکتر جیابوونەوەیان هاتە بەغدا). من کە لە تۆمارکردنی بەرنامە دەهاتمەوە، خواردنم بۆ خۆمو عەبدوڕەزاق ئامادە دەکرد. زۆرجار دوو هاوڕێیەکەیترو خێزانیشیان دەهاتن، خۆراکی کوردەواریم بۆ لێدەنان، دەستم دەکرد بە بیستنو تۆمارکردنی ڕادیۆی بەغدا، ڕۆژنامەم دەخوێندەوە، چەند شتێکم دەنووسی. ووتاری سەرەکی هەرکەس بیتووشایە موناقەشە دەکرا (ئەوانە نەبێت کە لە مۆسکۆوە نێراگەوە دەهاتن)، ئەوسا سەرخەوێکم دەشکاند. لە بیرمە ڕۆژێك هاوڕێکان هاتن من هێشتا نووستبووم، هاوڕێ مەهدی پرسیی: چییە ئەوە هێشتا نووستووە. عەبدوڕەزاق وەڵامی دایەوە: هاتۆتەوە. چێشتی لێناوە. حەوت ووتاری نووسیوە ئەوسا نووستووە.

عەبدوڕەزاق لەگەڵ ئەمەشدا زۆر ووشك بوو، کە شەو پاش ئەو ماندوێتییە دەمویست قسەیەکی خۆش، گاڵتەیە بکەم، دەیووت: دە بۆ خۆت تا دەنوویت کتێبێك بگرە بە دەستەوە. کە هەواڵی کۆچکردنی باوکمم بیست (هەموو کەس باوکی خۆی خۆش دەوێت، بەڵام من زۆرم خۆش دەویست). وەك ووتم کەس

سەرەخۆشیی لێ نەکردم. تاقەتی ڕیش تاشینم نەبوو، ڕیشم درێژ بووبوو، پاش بیستۆ دوو ڕۆژ عەبدوڕەزاق دایناو پاش ئامۆژگاری‌یەکی زۆر ووتی: ئەگەر پێت خۆشە دەتبەم لای وێنەگرێك وێنەیەکت بەو ڕیشەوە دەگرم. زۆر پەستبووم ووتم: من بۆ وێنە ڕیشم نەهێشتۆتەوە، خۆم دەیتاشم.

هەر پێش سەفەر من بە عەبدوڕەزاقم ووت: با دوو قسە پێکەوە بکەین. پێش ئەوەی تۆ هیچ بڵێیت من خۆزگە بەوە دەخوازم کە لە جێی من یەکێك بێت، بمرێت بۆ گاڵتەیەك یا پێکەنینێك نەیبینیت. ووتی: کاکە با وابێت بەڵام چەند ووشك بم، بە هۆی تۆوە بەشیرو ڕەجەبم ناسی. زۆری پێنەچوو عەبدوڕەزاق نامەیەکی بۆ مۆسکۆ بۆ نووسیم کە (دوعاکەت گیرابووە). کە من ڕۆیشتم هەر بۆ ڕۆژی دووەم گوێم لە دەنگێك بوو، نەمدەناسی، لام سەیر بوو برادەری وامان لە ئەوروپا هەبێت. بە ناوی "محەمەد نووری"یەوە نامەی بۆ دەناردم، دووایی لە دەمی خەڵکم بیست کە کاك جەلال دەیباغە. من ئەوم نەدەناسی، بەڵام لە کاری یەکێتیی قوتابیاندا کاك کەمالی برایم دەناسی، بەهەرحاڵ ئەوە سەرەتای دۆستایەتی‌یەکی بەتین بوو لە نێوان منو هاوڕێ جەلالدا کە هیچ شتێك تێکی نەداوە. نازانم "چیچۆ" بۆ کاك جەلالی لە خۆی بە ووشکتر دانابوو. بە بولگاری بە "مام" دەڵێن چیچۆ، ئێمەش بە زمانی کوڕەکەی مەهدی‌یەوە، تا ئێستاش بە هاوڕێ عەبدوڕەزاق هەر دەڵێین چیچۆ.

سەیر ئەوەیە لەو ڕادیۆیە ئێمە چوار کەس بووین، یەکتریمان باش دەناسی. مەهدی لە ساڵی ١٩٥١-١٩٥٢ی خوێندنەوە هاوخوێندنم بوو لە خانەی بەرزی مامۆستایان (دار المعلمین العالیة)، عەبدوڕەزاقم لە ڕۆژی ١٩٥٢/١/٢٩ەوە لە گرتووخانەی "مەرکەزی سەرا- مرکز السرای" لە بەغدا ناسی کە پێکەوە لەسەر خۆپیشاندانی یادکردنەوەی ڕاپەڕینی کانوون گیرابووین. لە کۆنگرەکانی خوێندکارانی کورددا لە ئەڵەمانیا (١٩٦٠-١٩٦٢) و پاشان لە هاتووچۆی پراگدا کە لەگەڵ کەریمی حیسامیدا لە ماڵێکدا دەژیان ئەحمەدم ناسی، کەچی حیزبەکەی

خۆمان یا بولگارەکان ناویتریان لێ نابن‌و به ناویترەوه پەساپۆرتیان دابنێ. ئەبوو خالید ناوی "فەرید سالم"ی دا به من. ناچاربووین بەو ناوانەوه یەکتر بانگ بکەین. رۆژێك ئەحمەد ووتی: ئەرێ ئێمه هەموو یەکتر دەناسین، ئەم ناوانه له ناو خۆماندا چییه؟ به خوا هەر گاڵته بەم (یوری)یه بەسزمانه دەکەین. مەبەسی کوڕه دوو سێ ساڵەکەی مەهدی بوو، که ئەویش ناوی "کیسرا" بوو، ناویان کردبوو به "یووری".

ئەو بەرنامانەی تۆمارم کردبوون کاك جەلال سوودی لێ بینین، هەندێکیانی کرد به دوو دەنگی، واته بەشێکی به دەنگی خۆی‌و بەشێکی به دەنگی من. بەڵام بەمەش دەنگم لەو ئێستگەی نەبڕا. بەڵکو ئەو ساڵ‌و نیوەی دووای ئەوه له مۆسکۆ مامەوه، چالاکییەکی فراوانم رێکخست، که زۆر جار به دەنگی خۆم دەمنارد (بۆ سۆفیا).

له مارتەوه بۆ ئەیلوول له ژوورێکی زانستگای مۆسکۆ دەژیام، رێکخراوی قوتابیانی حیزب مووچەیەکی کەمیان دەدامێ، کەمتر له قوتابییەکی ئاسایی[18].

تیپێکی نواندنم رێکخست، خۆشم له نواندندا لەگەڵیان بەشدار دەبووم. چەند بابەتم بۆ نواندن نووسی. غازی ئەلعەبادی دوو بابەتی دانێ، یەکێکیان له بارەی خۆڕاگرتنی ئەوسای محەمەد ساڵح بەحرلعلوومەوه بوو، رۆڵی بەحرلعلووم خۆم بەجێمهێنا. مونزیر نەعمان ئەلئەعزەمی "منذر نعمان الاعظمي" کەوته نوسینی بەرنامەیەکی هەفتانه به ناوی "گهوه ابو خزعل"ەوه، لەو جۆره زۆر نووسراوه بەڵام ئەمەی ئەم زۆر ووردو قووڵبوو، دەبوو بکرێته عەرەبیی شرگاوی، برادەرێکمان هەبوو (سوبیی- له ئەندازیاریدا دەیخوێند) دەیکرد بەو عەرەبییەوه خۆیشی به ناوی "ئەبوو تحێسن"ەوه هەفتانه شتێکی هەبوو. هەر ئەو "گهوة ابو خزعل"ه قسەیەکی خۆشی به کاك عادل حەسەن حوسنی (دوکتۆر) کردبوو. من که دیار نەبووم ووتبووم: دەچم بۆ تاشقەند لەوێ کاردەکەم. دیاره هەمووش

وایاندەزانی لە بەرلینی ڕۆژهەلاتم. لە عادلیان پرسیبوو فلان لە کوێیە، ووتبووی: لە تاشقەندی ڕۆژهەلات چاپخانەی داناوە.

بەرنامەی ئافرەتان (یا ژنان)مان دەویست حەیات شەڕارە (دوکتۆر) (سەد جار یادی بەخێر) کەوتە نووسینی زۆر جوان، بەلام کە دەنگیمان تاقیکردەوە بۆ ڕادیۆ نەدەبوو. نووسینەکانیم وەك خۆی دەنارد. سعود ئەلناسری لەم چالاکیيانە هەموویدا ڕۆلێکی باشی دەنواند. خۆیو سەلوای خێزانی (سەلوا زەکۆ- دوکتۆر) کۆمەلێك سروودی جوانیان تۆمارکرد (نازانم چیيان لێهات).

ئێمە ئەم بەرنامانەمان لە ژووری یەکێکمان لە زانستگای مۆسکۆ تۆمار دەکرد. هەولێ لەگەلێ سۆفێتەکان درابوو کە ڕێگەمان بدەن لە ستۆدیۆی ڕادیۆ تۆماری بکەین، ڕێگەیان نەدا. جارێك ئەبوو نەسیر سعوودو منی نارد بۆ پراگ لەوێ وابزانم بە هۆی ئەو برادەرە عیراقیيانەوە بوو کە لەوێ (لە ڕادیۆی پراگ) کاریان دەکرد، کۆمەلێك بەرنامەمان تۆمارکرد. سعوود تەنیا خۆی چەند سروودی تۆمارکرد. بووم بە هۆی ئەوەی کاکەقادر دیلان چەند سروودی کوردی تۆمار بکات، لەوانە: ئازادیخوا، گەرچی تووشی، تا دەست لە مل هیوا نەکەم.. هتد. هەر لەو کاتەشەوە کە لە سۆفیا بووم بە دەنگی موفید ئەلجەزائیریو سادق ئەلسائیغ لە پراگەوە بەرنامەمان بۆ دەهات. بە دەنگێکیتر شیعری میللیی عەرەبیمان بۆ ئەهات (نازانم دەنگی کێ بوو).

هاتنی هاوڕێ عەزیز محەمەد بۆ دەرەوەی وولاتو جێگیربوونی لە مۆسکۆو پێکەوەژیانمان لە فوتابخانەی حیزبی بۆ ئەم کارەی من زۆرباشبوو، هەموو ڕۆژ هەر لە کتێبخانەی فوتابخانەکە دادەنیشتم، ڕۆژنامەی عیراقی دەگەیشتن، بەرنامەو لێکۆلینەوەو گەلێك شتم بە عەرەبیو کوردی دەنووسی، پێم ئیمزا دەکردو دەنێررا بۆ سۆفیا. ئیتر نە سلێ لە کوردو کوردستان دەکرایەوە، نە بە لایەنگری چینو لە هێلی تازەتێنەگەیشتوو ئەدرامە قەلەم. بێگومان شتێك کە (سکرتێری تازە هەلبژێرراو ئیمزای کردبێ کەس ڕایناگرێ).

کاک عەزیز بە خۆمی نەووتبوو، بەڵام جارێك عامیر عەبدوڵلا کەوتە ستایشی کارەکانی ئێستگەم، لە زمانی کاک عەزیزەوە ووتی: ئەو نەفەسە کوردیو کوردستانیەیەو ئەو شێوە ئەدەبیە بەرزە زۆر یارمەتیی هاورێکانمانی دا لە کوردستانو لە چیا. جارێك کاک فەرهاد عەونی بۆی گێڕامەوە ووتی: لە ماوەت بووین کە زانیمان دەنگی گەلی عیراق بە کوردی دەکەوێتە قسە، لە دەوری ڕادیۆ کۆبووینەوە، هەندێك خۆیان بۆ هەڵەیەکی ناکوردانە مت دابوو تا بکەونە قسە. کە بیستییان تەنیا کاک حەسەنی سەید ئەحمەد کەوتبووە جوێن دان بە شیوعی، لێیان پرسیبوو بۆ جوێن ئەدەیت، ووتبووی: هەر کوردایەتی‌یەکەمان ماوە ئەوەتا شیوعی دەیانەوێ لێمان بسێننەوە.

ئەو ماوەیەی مۆسکۆ، پۆستەی حیزب لە ناوەوە کەوتە هاتن، دیاربوو سەرەتا دەهاتە مۆسکۆ، هاوڕێ عەزیز دەیدا بە من، یا ڕێکم دەخستەوە یا دام دەڕشتەوە. ڕۆژێك ووتارێکی دامێ باسی شاری کفریو خەباتی سیاسیی ئەو شارەی دەکرد. لەناو باسەکەدا لادرابوو بەلای داود بەگی جافداو هەندێك پلاری تێ گیرابوو. خەتو شێواز لەوەی دەکرد کاک موکەڕەم تاڵەبانی نووسیبێتی، تەنانەت ناوێکی نزیکی ناوی (ئازادیخوا)ی لەسەر بوو، ئەو ناوەی کاک موکەڕەم لە (اتحاد الشعب)دا پێی دەنووسی. بردمەوە بۆ کاک عەزیز ووتم: داود بەگی جاف تاقە نایبی کوردە لە پەرلەمانی عیراقدا ڕۆژی دەنگدان لەسەر پەیمانی بەغدا نەچووە پەرلەمان. پاش کوودەتای شوبات خۆیو کوڕەکانی زۆر یارمەتیی ئەو هاوڕێیانەی ئێمەیان دابوو کە کەوتبوونە تاران، تەنانەت کە ئێرانی‌یەکان زاهید محەمەدیان ناسیبۆوە کە خاوەنی گۆرانیی "پهلوی شتريد منه"یە کە گاڵتە بە شا دەکات، سەرداری جاف پێش ئەوەی ساواك بگەنە سەری سواری ئوتومبیلی خۆی کردبوو گەیاندبوویە سنوری یەکێتیی سۆفێت. وەڵامی کاک عەزیز ئەوە بوو کە ئەمە لەناو وولاتەوە هاتووە، هەڵبەت ئەوان باشتر دەزانن. کە هاتمەوە جافەکان گلەییان لەو ووتارە دەکرد، کەچی ووتارێك کە من

نووسیبووم لە بارەی بوون بە وەزیری دوکتۆر ئەکرەم جافەوە لە لایان زۆر باش‌و خۆشبوو.

لە یەکێك لە وەزارەتەکانی سەردەمی عەبودلسەلام عارفدا دوکتۆر ئەکرەم جاف کرابوو بە وەزیری کشتوکاڵ. زۆرمان پێ ناخۆشبوو کەسێك کە سەر بەرەو ڕژێمە نەبێ وەزیری بکات. ووتارێکم نووسی: "ئەکرەم بەگ ببە بە جاف مەبە بە جاش". بە باسی عەشرەتی جاف دەستم پێکردبوو کە شێخ ڕەزا پێی ووتوون:

خزمینە مەچن چاکە بە گز عەشرەتی جافا

مێرووله نەچێ باشە بە گز قوللەیی قافا

نووسیم: جاف عەشرەتی مەولانا خالیدو نالی‌و گۆران‌و تایەربەگ‌و ئەحمەد موختارە، عەشرەتی حەمە پاشاو مەحموود پاشاو وصمان پاشایە، تا ئێستا (١٩٦٤) زۆریان پێشمەرگە هەیەو جاشێکیان نی‌یە، ڕێگەی تۆش هاوڕێگەی ئەوانە.

وەك بیستم (انصات)ی حکوومەت بۆیانِ تۆمار کردبوو، لە جیاتی تووڕە بوون زۆری پێخۆش بووبوو. زۆری پێ نەچوو خۆی پێ نەگیرا وازی هێنا.

لە پەراوێزی کاری ئەو ڕادیۆیەدا دەبێ دوو یادگار بگێڕمەوە: ئەبوو ئەسیر گەڕایەوە وولات. کلیلی خانووەکەی دا بە من، بۆئەوەی چی کتێب‌و کاغەزی تێدایە سەیریان بکەم، کامەی بە کەڵك دێت بیدەم بە حیزب‌و کامەی بێ کەڵکە بیفەوتێنم لەناو ئەو نامانەدا کە مابوونەوە. دوو نامەی سەیرم دی، هەردووکیانم دا بە حیزب.

یەکەم: نامەیەك بوو، وەك ڕاپۆرتێك وابوو. مەهدی لە بارەی ڕادیۆوە نووسیبووی، دەڵێ کە ئەو برادەرە هات، نوسیبووت کەلێنێکی باشتان بۆ دەگرێ، بەڵام وا نەبوو، لە ڕووی بیرەوە زۆر کەم‌و کووڕیی هەیە، (لدیه نواقص فكرية كثيرة). دیارە ئەو هەموو کارە کەلێنی نەگرتبوو، چونکە لە ڕۆژانی ئەو لادانە گەورانەدا بیرم لەگەڵ ئەودا نەبوو.

دووەم: نامەیەکی عەبدورەزاق بوو لە بارەی ئەبوو خالیدەوە. ئەودەمە عەبدورەزاق نە ئەندام، نە پاڵێوراوی کۆمیتەی ناوەندی نەبوو. زۆرم لا باشبوو کە بتوانێ رەخنە لە ئەندامێکی کۆمیتەی مەرکەزی بگرێت. کە هیچ ناخوێنێتەوە، تەنانەت رۆژنامەش، کە ئەمە لە پلەو رادەی حیزبیی ئەو کەم دەکاتەوە.

## *دەنگی کوردستانی عیراق*

زۆر کەس وا دەزانن کە لەم رادیۆیەشدا ئیشم کردووە، بەڵام لە راستیدا هەندێك یادگارم لە بارەیەوە هەیە دەبێ لەم چەند لاپەڕەیەدا کە بۆ (رادیۆکان) تەرخانکراوە بنووسرێن.

لە سەرەتای ساڵی ۱۹٦٦ەوە بۆ کۆتایی بەهار کە زۆرتری لە دیلمان بووم، لە ماڵی بەرزانی. رۆژێك کاك ئیدریسی رەحمەتی پێی ووتم: ئەرێ تۆ زۆر لە رادیۆدا کارت کردووە، بۆچ یارمەتیی رادیۆکەی ئێمە نادەیت. زۆرم لا خۆش‌و باشبوو، چەند ووتارم بە کوردی‌و عەرەبی نووسی دام بە کاك ئیدریش دەینارد بۆ رادیۆ. رۆژێك ووتی: برایانی رادیۆ دەڵێن بۆ سەرێکمان لێ نادات. ئەوەشم لا خۆش‌و باشبوو، بۆ سبەینێ بە ئوتومبیلێکی جیب ناردمی بۆ لایان.

ئێستگەکە لە ئەشکەوتێکدا بوو پێیان دەووت "ئەشکەوتی سەر دێمان" کە لە گەڵاڵەوە دێیتە خوارێ دەگەیتە سەر پردی زەردو لەوێوە کە رووەدەکەیتە قەسرو دیلمان‌و وەڵزی بە دەستی راستدایە.

چەند برادەری کۆنم لەوێبوون زۆر بە گەرمی‌و بە خۆشییەوە هاتن بە پیرمەوە: سەعید ناکام، عوسمان سەعید، شێرکۆ بێکەس، عوسمان عوزێری. بێژەری بەشی عەرەبیش ئەلبێرت خووریم ناسی. کە بێجگە لە دەنگوباس خوێندنەوە بە عەرەبیی موسڵاویش قسەی لەگەڵ سەربازو ئەفسەرەکانی سوپادا دەکرد. کاری تەکنیکی لە ئەستۆی عەبدولخالق مەعرووف (شەهید) و غالبی مەحموود ئەفەندی بوو (کە بە راستی تا ئێستا سەربازێکی نەناسراوە).

چەند ڕۆژم لەگەڵ ڕابواردن، بە قسەی خۆش‌و هەندێك تێبینی. هەندێك ووتارم بۆ نووسین ووتیان: دەبێ سەیدا خۆی ببینێ یا ببیەرەوە کاك ئیدریس بینێرێت. ووتم: ئا بیدەن بە سەیدا.

سەیدا سالح یوسفی لێپرسراوو بەڕێوەبەری ئێستگەکە بوو. تا ئەو کاتە نەمدیبوو، بەڵام زۆرم لە بارەیەوە دەزانی (کارکردنی لە حیزبی هیوادا، لە پارتیدا) شیعریم لە گۆڤاری گەلاوێژدا خوێندبۆوە. لە دوورەوە چەند تێبینیم لا دروستبووبوو (بروسکەی ڕۆژی ٨ی شوبات بە ناوی ئەوو فوئاد عارفەوە- کە بە -تلاحمت- بەناوبانگ بوو، وابزانم کاك عەزیز یا کاك کەریم ئەحمەد هەڵوێستیان لە نەگێڕانەوەی مامۆستا شیوعیەکاندا- لا باش نەبوو)، لەبەرئەوە من خۆم نەچوومە لای. کاك سەعید ناکامیش نێوانی لەگەڵیدا زۆر خۆش نەبوو، ووتی: وا لای ئێمەیت، با ئەو بێتە لات.

ڕۆژی دوایەم بوو، خەریکبوو ئەڕۆیشتم، دیار بوو کاك عوسمان سەعید ووتارەکانمی بۆ بردبوو، ئەوەندەم زانی هاتە خوارەوەو پێشی لێگرتم. بە گەرمی باوەشی پێداکردم‌و ووتی: ئا ئێستا زانیومە چەند ڕۆژە لێرەیت، گلەیی لە ناکام‌و ئەوانیتر کردو ووتی:

نارۆیت. خێرا ناردی چەند مریشکێکیان کڕی (ئەوە بۆ پێشمەرگەیی ئەودەمە زۆر بوو) هەموویانی بۆ نانخواردن بانگ کرد. دوو شەوم لە خزمەتیدا بردە سەر. ئەوە سەرەتای دۆستیمان بوو کە تا شەهیدبوونی نەبڕا. لەو کاتەوە گەورەیی ئەو پیاوەم بۆ دەرکەوت کە یەکێکبوو لە پیاوە تێکۆشەرە مەزنەکانی کورد.

سەرەتا سوپاسی من‌و دەنگی گەلی عیراقی کرد، بۆ ووتارێك کە لە بارەی ئەوو خێزانەکەیەوە بڵاومانکردبۆوە، پرسیم: باشە، چۆن زانیبووت من نووسیمە. ووتی: هەر تۆ دەبێ وا بە ووردی ژیانی من بزانیت‌و ئاگاداری شیعرەکانم بیت.

پێش گەڕانەوەم، ڕۆژنامەیەکی عیراقیم لە مۆسکۆ دی. لەوێدا نامەیەك بە ناوی خێزانی سەیدا یوسفییەوە بڵاوکرابۆوە لەوێدا داوا لە سەیدا (کە بە وەیزری خەیاڵ..!!) ناوبرابوو دەکات، کە بێتەوە لە شاخ نەمێنێ‌و خۆی تەسلیم بکات‌و خەریکی ماڵ‌و منداڵی بێت. منیش یەکسەر ووتارێکم نووسی: باسی ژیانی سەیدام کرد لە حیزبی هیواوە بۆ پارتی، بۆ شاخ، لە شیعرەکانی دووام. ئەوسا پرسیم بۆچ ئەم خێزانەی لە هەموو ئەم ساڵانەدا شتی وای نەنووسیوە؟ دیارە کۆتایی نامەکەش هەڕەشەی جیابوونەوە بوو. منیش نووسیم: دیارە یا ئەم نامەیە درۆیە، یا بە زۆرو بە هەڕەشە لە خێزانی‌و بە منداڵەکانی نووسراوە. ئینجا پرسیم: ئەی کابرای موسڵمانە درۆ (مەبەسم عەبدولسەلام عارف بوو). ئەمە کام دین یا ئایین یا مەزبە ڕێگەت دەدات ژن‌و مێرد لە یەك، منداڵ لە باوکی جیابکەیتەوە، چونکە بۆ بەربەرەکانیی زوڵم‌و زۆری تۆ ڕوویکردۆتە چیا؟

قەناعەتم بە هاوڕێ عەزیز کرد کە دەبێ ئێمە هەڵوێستمان لە خەڵك جیاواز بێت، خوا هەقە ئەویش هیچ لاری لەوە نەبوو کە دەبێ ئێمە بەرگری لە هەق‌و لە ڕاستی بکەین. سەیر ئەوە بوو کە نێررا بۆ سۆفیا ئەوانیش بەدڵیانبوو، چەند جار بە کوردی‌و بە عەرەبی بڵاویانکردەوە. ئەوەش کاردانەوەیبوو لای سەیدای شەهید.

دوو ڕۆژیــش لای ئــەو مامــەوە. شـوێنی کاریــانم دی. سـتۆدیۆ لــەناو ئەشـکەوتەکەدا بـوو. حکوومـەتی عـیراق لـە کـاتی بڵاوکردنـەوەدا (پـەرەزیت-تەشـەویش)ی ئەخسـتە سـەر. تەشویشـەکەش هـەر ئـەو گۆرانی‌یـە بـو کـەی دەیانخستە سەر دەنگی گەلی عیراق (کیس مـی هـانی هـانی) ( Kise Me Hani Hani). بەڵام ئەمان توانای بەربەرەکانیان زیاتر بـوو. لـە کاتی بڵاوکردنـەوەدا، هەمیشە کاك غالب لە نێوان ئەشکەوتەکەو دەرەوەدا ڕایدەکرد، بۆئـەوەی هـەر تەشـویش چـووە سـەر دەنگەکـە شـەپۆلەکە تـۆزێ ببـات بـەولاوە. خـەڵکیش

فێربووبوون هەر تەشویش هات میلی ڕادیۆکەیان کەمێك دەبرد بەولاوە ئیتر گوێیان لە بەرنامەکە دەبوو. سەیر ئەوەیە لەلای کورد ئێستا ووشەی (هانی هانی) لەوەوە جێگای (پەرەزیت یا تەشویش)ی گرتۆتەوە.

کە چەند ووتارێکم دایە دەست کاك عوسمان سەعید (ڕەحمەتی) کە بێژەری سەرەکیی ڕادیۆ بوو. زۆری پێخۆشبوو، ووتی: توخوا بنووسە، با لەم ووتە دووبارەکراوانەی سەیدا ڕزگارمان ببێت. زۆرتر باسی ئەوەی دەکرد کە دەنووسێ (ثورتنا الدفاعیة- واتە: شۆڕشی بەرگریمان)، وایدەزانی ئەمە ووتەی هەمیشەیی سەیدایە، نەیدەزانی هەر دەووترا (شۆڕش)، بەرزانیی ئەمر هەواڵی دەنارد: ئێمە بە زۆر شۆڕشمان پێکراوە، دەبێ بڵێین شۆڕشی بەرگریمان.

لە ڕۆژی دووای کەوتنەخوارەوەی عەبدولسەلامدا لە زۆر شوێن فرۆکە هاتە سەرمان، شوێنێکیان کە بە خەستی ئەوساو کاتی شەڕی هەندرێنیش بۆمباران کرا ئەشکەوتی سەر دێمانبوو. پاش ئەوەش ناوبەناو ووتارم بۆ ئەو ئێستگەیە دەنووسیو دەمنارد. نازانم چی ئەوەی لە بیری کاك فرەنسۆ هەریریدا هێشتبۆوە کە سەرناوی دوو لەو ووتارانەم بیربخاتەوە. کە یەکێکیان لە وەڵامی ڕادیۆی بەغدادا بوو کە بۆ مردنی عەبدولسەلامو هاتنی ئەورەحمانی برای زوو زوو دەیانووت: "خیر خلف لخیر سلف"، واتە –باشترین جێگرەوە بۆ چاکترین جێگیراوە. منیش نووسیم: کام جێگرەوە بۆ کام جێگیراوە. (أی خلف لأي سلف) کە پاش چەند مانگێك بەرزانی- لیژنەیەکی باڵای بۆ سەرپەرشتیی ڕاگەیاندن دروستکرد، منیش ئەندامی بووم. ڕادیۆش دەبوو بکەوێتە ژێر سەرپەرشتیی ئێمە. زۆرم لا نەنگ بوو، ئێمە کە زوربەمان ئەندامی پارتی نەبووین، سەرپەشتیی سەیدای یوسفی بکەین. زوربەی ئەندامانی لیژنەکەش باوەڕیان وابوو. ئیتر ڕادیۆ هەر سەربەخۆ بوو.

بۆ یادگاری ئەو ڕۆژانە کاك شێرکۆ بێکەس هۆنراوەیەکی جوانی نووسی "پار ئەم وەختە ئەشکەوتەکەی سەردێمان". کردم بە عەرەبیو هەر ساڵی ۱۹٦۷

لە (التآخي)دا کە سەیدا یوسفی سەرنووسەریبوو بلاوکرایەوە. ئەوە یەکەم پارچە شیعری شێرکۆیە بکرێت بە عەرەبی. هەروەك سەرەتای پلەیەکی نوێ بوو لە شیعری ئەودا. ئەوسا زۆری پێخۆشبوو کە یەکێکی وەك من پێی بلێت: شێرکۆ، بە ڕاستی بوویت بە شاعیر.

---

(١)هەندێك لەوانەی لەو ئێستگەیەدا کاریانکردبوو دەڵێن ڕادیۆکە لە ساڵی ١٩٥٧دا دەستی پێکردووە، بەڵام من دڵنیام لە ١٩٥٨دا بوو، چونکە هەر ناوی "ڕادیۆی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو" بوو، ئەو کۆمارەش لە سەرەتای ١٩٥٨دا دامەزراوە. ئەمەش بۆ وەڵام دەڵێم، ئەگینا دڵنیام.

پاش ئەو دوو برایە لەگەڵ ئەواندا گەلێك کەسیتر لەو ڕدیۆیەدا کاریانکردووە.

(٢)ئەفسەرێکی میسری بوو، زۆر لەگەڵ سووریەکانو چەپدا ڕێك بوو، کە عەبدولناسر لەگەڵ شیوعیەکانو سۆفێتدا ساڵی ١٩٥٩ تێکچوو، یا هەر پێش ئەوە ڕایکردە ئەوروپا، دەستگاکانی عەبدولناسر لە ئەوروپا گرتیانو بە بێهۆشی هێنایانەوە قاهیرە. ئیتر نازانم ما یا کوشتیان.

(٣)لەوانە: محەمەد شەیدا، د. فوئاد مەعسووم، ئەحمەد ئەجمەدین.. هتد.

(٤)ئەو شیعرانەم دا بە کاك شەمال سائیب، ئاوازێکی بۆ داناو خۆی بە گۆرانی ووتی بەڵام هەندێك شتی لێ زیادکرد لە شیعرەکانی قەدری جاندا نەبوون.

(٥)لەبەرئەوە هەندێك شت بە درێژای دەگێڕمەوە، تا ئەم ئەوەیە لە هەندێك حاڵو کەش و پێوەندیی ئەوسا بگات.

(٦)سەنان سەعید عەبدولقادر- خەڵکی کەرکووك بوو، باوکی دۆستی باوکم بوو، لە قەزاکانی کوردستاندا قایمقام بوو، کورد بوو، بەڵام سەنان لەگەڵ خاڵوانی گەورە بوو بوو، خۆی بە تورکمان دەزانی. مامۆستای سەرەتایی بوو

کۆمەڵێك بەهرەی هەبوو، نووسین، نەخشەکێشان، دەنگ خۆشی، لەنگەری لەسەر یەکێکیان نەگرت تا تێیدا سەرکەوێت. پاش شۆڕشی تەمووز بوو بە بێژەر لە ڕادیۆی بەغدا. ناردیان بۆ باکۆ. بە زۆر کاری ڕادیۆوە خەریکبوو، تەنانەت هەندێك لە قۆریاتەکانی کەرکووکیشی لەگەڵ گۆرانیبێژی ئازەری ئەرمینە مەحەمەدۆڤا تۆمار کرد. لە پاڵ ئەو هەموو ئیشانەدا خوێندی بەشی ڕاگەیاندنی لە زانکۆی باکۆ تەواوکردو پاشان بۆ دکتۆرا (کاندیدات) وەرگیرا، بە گیانێکی تورکمانانەوە لەسەر ڕۆژنامە تورکمانییەکانی عیراقی نووسی. لە قسەدا لە باکۆ تورکمانی عیراقی بە ئازەری دادەنا. کە گەڕایەوە عیراق بوو بە مامۆستاو سەرۆکی ڕاگەیاند لە کۆلێجی ئادابی زانکۆی بەغدا. هەوڵی دەدا دوورەپەرێز بێت و ئاڵۆزیی تایبەتی و گشتیی لەگەڵ کەس نەبێت. بە نەخۆشییەکی کتوپڕیی درێژخایەن کۆچی دوایی کرد. یادی بەخێر.

(٧)من ووشەی زانستگام بۆ (جامعە- Univercity) پێ باشترە، بەڵام مادام (زانکۆ) ڕۆیشتووە- با هەڵەش بێت، جاروبار بە کاری دەهێنم،

(٨)وەك لە شوێنێکیتری یادداشتەکاندا باسی دەکەم. لەسەر ئەوەی لە هاوینی ١٩٦٢دا نامەیەکم بە ناوی مامۆستا بەشیرەوە بۆ کۆنگرەی خوێندکارانی کورد لە براونشفێك- ئەڵەمانیا نووسیبوو سێ مانگ لە کار لە حیزبدا ڕاگیرابووم (تەجمید کرابووم).

(٩)باسیتری ئەو ڕۆژە دەخەمە شوێنیتری یادداشتەکان، لێرەدا تەنیا باسی ڕادیۆ دەکەم.

(١٠)پاش ڕاپەڕین هاوڕێ عەبدوڕەزاق ئەلساقی ووتوێژێکی لە بارەی ئەو ڕادیۆیەوە لەگەڵما تۆمار کرد. پرسیم هەموو شت. ووتی: جا هیچ بە نهێنی ماوەتەوە تا تۆ نەیڵێیت.

(١١)هاوڕێ عەبدوسەلام (عبدالسلام) ئەلناسری (الناصری)، یەکێکە لە هاوڕێ کۆنەکانی حیزبی شیوعی، بە بنەچە لە تیرەی ئەلبوناسرە (البوناصر)،

کە هەندێك لە سەرکردەکانی ڕژێمی بەعسی عیراقییان لێبووە. بەڵام ئەم لە بەسرە ژیاوەو لەناو کرێکارانی ئەوێدا بووە بە یەکێك لە سەرکردەکانی بزووتنەوەکانی ساڵانی چلی سەدەیٚ بیستەمی کرێکارانی بەسرە دەژمێررێ، زوو بەرەو سەرکردەیی حیزبی شیوعی چوو، من لە بەندیخانەی مەرکەزیی بەغدا ساڵی ١٩٥٣ ناسیم. لە کاتی جیابوونەوەی دەستەی ئاڵای کارگەران (رایة الشغیلة)دا لەگەڵ ئەوانبوو، دووایی هاتنەوە ناو حیزب، تا شۆڕشی تەمووز نزیکەی ١٠ ساڵ لە بەندیخانەدا بوو. کە کودەتای فاشستانەی هەشتی شوبات بوو، لە مۆسکۆ بوو بۆ خوێندنی حیزبی، زۆر چالاکانەو زیرەکانەو مەردانە سەرکردەیی ڕێکخراوی دەرەوەی حیزبی شیوعی‌و چالاکیی نەیارانی دەسەڵاتی تازەی کرد. دەرگا نەما لێی نەدا. بە ناوی (ئەنوەر مستەفا)وە بەیاننامەی دەردەکرد. ئەودەمە لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هەر ئەو لە دەرەوە بوو. کردنەوەی ئەو ڕادیۆیەو کارەکانی هیممەتی یەکەمی بۆ ئەوە. لەبەرئەوەی حیزبە شیوعییەکانی جیهان کوێرانە دووای هەموو هێڵ‌و فرمانێکی یەکێتیی سۆڤێت دەکەوتن، ئەویش پاش کودەتای ١٨ی تشرین زۆر بە گەرمی سەر بەو هێڵە چەوتە بوو. هاوڕێ ئەبوو ئەسیر لەو تێکۆشەرە دڵسۆزە پاکانەیە کە لە ژیاندا دیوومن‌و لە ڕیزی پێشەوەیانە. کە هێڵە سیاسییەکەی ئەوان کە بە هێڵی ئاب ناسرابوو چەوتیی دەرکەوت، ئەمیش لە هەندێ کار کشایەوەو ساردبۆوە، چونکە لای وابوو کە هێڵێك چەوت دەرچوو، دەبێ خاوەنەکەشی بەرپرسیار بێ. لە ساڵی ١٩٧٩دا گیراو پاش بەربوون لە بارێکی دەروونیی تایبەتیدا وازی لە کاری حیزبایەتی هێناو وەك پیاوێکی مەردو بە شەرەف چووە ماڵی خۆی‌و کەوتە کرێکاری کردن بۆ ژیانی خۆی‌و خێزانی. وابزانم کەم کەسی وەك من دەزانن کە لە کیس حیزبی شیوعی‌و بزووتنەوەی نیشتمانی چوو.

(١٢)ئەمە هەر لەبەرئەوە بوو کە کەس نەزانێ ڕادیۆکە لە سۆڤیایە. ئەبوو خالید ووشەیەکی بە شێوەی بەسرایی بە دەمەوە گرتبوو (خۆ.. مالچحوکم)

واتە (خۆنەیاندیون، یا نەیانناسیونەتوە؟). ڕۆژێك لەكار دەهاتینەوە، مەهدی بە ئوتومبیلەکە لە ئوتومبێلێکیدا لێیاندا. خێرا بۆ ئەوەی کار نەکاتە پۆلیس و ئاشکرابوونی لە دووا بێت، ژمارەی تەلەفوونەکەی ئەبوو خالیدی دا بە من لە شوێنێکەوە تەلەفوونی بۆ بکەم تا خێرا بێت. کە تەلەفوونی هەڵگرت یەکسەری پەیامەکەم پێگەیاند، لە جیاتی ئەوەی بپرسێ: خۆتان سەلامتن، پرسی: (خۆ.. ماڵچوکم؟).

(١٣)بە داخەوە هیچ یەکێك لەو ووتارو لێکۆڵینەوە هەمەچەشنانەم بۆ خۆم هەڵنەگرت، یا نەمنووسینەوە. چونکە لام وابوو ئەمانە کاری حیزبن و بێ ناو بڵاوکراونەتەوە ئیتر هەقی منیان بە سەرەوە نەماوە. لە ڕاستیدا ئەگەر هەڵمبگرتنایە ئێستا کەرەسەی چەند کتێبی هەمەڕەنگیان لێ دروست دەکرا. من نەمئەزانی لەو حیزبەدا کەسانی وا هەن نەك نامە حیزبییەکان یا ئەو نامانەی نووسیویانە دەنووسنەوەو لای خۆیان هەڵیدەگرن، بەڵکو کۆنووس (محضر)ی کۆبوونەوەکانیش بۆ خۆیان دەنووسنەوە کە دەبێ لە (ئەرشیف)ی حیزبدا بن و بۆ خۆ دانانیان دەست لە ئەمانەت دانە. ئەوەتا کەسێکی وەك کاك فاتیح و ڕەسووڵ بەو کۆنووسانە بووە بە نووسەرو مێژوونووس و.. هتد. کە ڕەنگە هیچیان نەبێ. لە وڵات هەواڵی ئەو نووسینانەمم لە هاوڕێ عەبدوڕەزاق ساقی پرسی: ووتی کە ڕادیۆکە داخرا هەموو شتەکانمان تەسلیم بە حیزبی کۆمۆنیستی بولگاریا کرد، ئێستا لە ئەرشیفی ئەوێدایە.. بەڵام تۆ بڵێیت تا ئێستاش ئەوە مابێت؟

(١٤)بە داخەوە لە ڕۆژانی بەرەی نیشتمانیی حیزبی شیوعی لەگەڵ بەعسدا، لە یادی ٧ی نیسان و دامەزراندنی حیزبی بەعسدا، نوێنەرانی حیزبی شیوعی بە سەرکردەیی هاوڕێ مەهدیی (براکوژراو) و ئەندامێتی بوسەینە (بثینة) حەکیم شەریفەی میدو مامم و ئامۆزا کوژراو بە دەستی کودەتاچیانی ٨ی

شوبات بە چەپکە گوڵەوە نارد بۆ پیرۆزبایی پیاوکوژان. وەك مەبەستیان نواندنی دڵپاکی‌و لە بیرچوونەوەی ڕابوردوو بێت.

(١٥)ووتەی عەرەبە بۆ ڕابوردوو لە بیرچوونەوە. عەبدولکەریم قاسم زۆری بەکارهێنا، تا بوو بە قوربانی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە.

(١٦)هاوڕێ خالید بەکداش کە باسی مەسەلەی کودم دەکرد، ساڵانی ١٩٥٦-١٩٥٨ جارێك پێی ووتم: تۆ شیوعی نیت، بەڵام قەومی‌یەکی باشیت. ئیتر کاك عەبدوڕەزاق (کە خۆم بۆم گێڕابۆوە) گرتبووی بە دەمی‌یەوە.

(١٧)بە داخەوە کۆمەڵێك کتێب کە بۆ حیزب وەرگێڕرا بوو هەموو بە دەردی ووتارەکانی ڕادیۆ چوون. لەوانە: ئەو نامیلکانەی لیوشاوشی‌و کتێبی "لە پێناوی بە بۆلشویك بووندا- فی سبیل تکوین بلشفي" و کتێبەکەی ستالین لە بارەی گۆڕینی ئابووری‌یەوە. ئەمانە لە عەرەبی‌یەوە کرابوون بە کوردی. بەڵام لە ١٩٦٤-١٩٦٥دا گەلێك کتێبم بۆ قوتابخانەی باڵای حیزب لە مۆسکۆ لە رووسی‌یەوە کرد بە عەرەبی: لەوانە: هەڵبژاردەکانی لینین لە بارەی پڕوپۆگاندەو بانگەشەوە، کۆمەڵێ موحازەرەی جیاجیا لەو قوتابخانەیە. هەڵگرتنی ئەوانیشم -بۆ خۆم- بە تاوان دەزانی. ئەبێ ڕاست بووبم یا ووشك‌و برنگ بیرکەرەوە؟

(١٨)مەبەس قوتابیی بەکالۆریۆسە کە (ستودێنت)ی پێ دەووترا و مانگی ٩٠ ڕۆبڵی دەدرایە، هەرچی قوتابیی بەرەو ژوورترە (ئەسپیرانت) ئەوە ١٥٠ ڕۆبڵی دەدرایە. بەڵام من لەو سەردەمەدا حیزبەکەی خۆمان مانگی ٧٠ ڕۆبڵی دەدامێ.

* * *

بە دەم ڕێگەوەو لە سەفەردا کە ناتوانم بێ کار، واتە بێ خوێندنەوەی نووسین دانیشم دەست دەدەمەوە نووسینی ئەم یادداشتانە.

ئەمڕۆ ٢٠٠٠/٩٠/١٢ لە ڤیرجینیای نزیك واشنتەنی ئەمریکا لە ماڵی ڕازی کچم، وا دەست دەدەمە بەشێکیتر. (ڕازو شوانی زاوام- شوان ئەحمەد زرنگ-

بەیانیان سەعات شەش دەچنە دەرەوە، منداڵەکانیان لانەو ئاران دەبەنە ئەو ماڵەی بە پارە هاوتەمەنانی ئەوان ڕادەگرن ٣-٤ ساڵ، ٢ ساڵ، تا ئێوارە، منیش بە تەنیا لە ماڵەوەم تا ئەوان دێنەوە. ئەمە بە خێری گەشتی ئەمەریکای منە. کە هەر لەو زەمانەوە کە مەکسیم گورگی (لە وڵاتی زێڕی زەرد)ی لەسەر نووسیبوو حەزم دەکرد بیبینم. وا ئەمدی‌و بەڵام پاش دوو ساڵ دووری بە بینینی ڕازو شوان‌ۆ لانەو ئاران زۆر شادمانم‌و هەر لە ئێستاوە خەمی چەند ڕۆژێ‌ترو بەجێهێشتنیانمە. وا دەست دەدەمە قەڵەم. چونکە بۆ خوێندنەوە هیچی ئەوتۆم لەبەردەستدا نییە، ئەوی هەیە هەرگیز لە پرۆگرامی خوێندنەوەی مندا نەبوون.

لەو بەشە بووبوومەوە کە بۆ (ڕادیۆکان)م تەرخانکردبوو، دەزانم لەو سێ هەڵقەیەدا کە لە گۆڤاری (پەیڤین)دا بڵاوکرایەوە، باسی منداڵی‌و خوێندنی سەرەتاییم کردبوو، ئەوسا لە حیزبایەتی دووابووم‌و ڕاپەڕینی کانوون.

ئێستا کە دەست ئەدەمەوە نووسین نازانم دووبارەکردنەوەی تێدایە یا نا، ناچار کە چوومەوە سلێمانی، سەیری ژمارەکانی (پەیڤین) دەکەم‌و ئەوی دووبارە بێت لایدەدەم.

چووینە قوتابخانەی ناوەندی، ئەو سەردەمە سلێمانی یەك قوتابخانەی ناوەندی تێدابوو، کە سانەوی (ثانوي)یان پێدەوت لە پۆلی یەکەمی ناوەندییەوە تا پێنجەمی دوواناوەندیی تێدا بوو. لە ١ تا ٣ پێی دەووترا (موتەوەسیتە- متوسطة)، بە ٤، ٥ دەوترا سانەوی (ثانوية) یان ئەعدادی شەشەم نەبوو، ٤، ٥ یا ئەدەبی یا زانستی (عیلمی) بوو، بە شیتر نەبوو و لە پێنجەمدا بەکەلۆریا بوو.

قوتابخانەکەمان لەو جێیە بوو ئێستا بۆتە چەند قوتابخانەیەکی سەرەتایی‌و هۆڵی (هونەرمەندان) و لە ژوور ئەوێوە تەنیا نەخۆشخانەو بەندیخانە هەبوو، ئیتر خانوو نەبوو.

خوێندن هەمووی بوو بە عەرەبی، ئێمە عەرەبیمان نەدەزانی. وەك لە باسی (زمانی زگماك)دا لێی دووام، من بە هۆی حوجرەو مزگەوتەوە چەند ووشەم هەڵدەگرتن. کاك جەمالەدین تۆفیق (جەمال نەبەز)یش باشبوو، ناتوانم بە تەواوی چۆنیەتیی فێربوونی ئەو باس بکەم. چونکە کوری گەڕەکێك بووین، بەڵام لە سەرەتاییدا لە دوو قوتابخانەی جیادا بووین.

خوێندنەکەی منیش تا چوونە ناوەندی هەر ئەو کەمەی حوجرەی مەلا حامیدو شێخ ئەحمەدین بوو. هاوینێکیش باوکم ناردمی‌یە مزگەوتی شێخ ئەوڵلای هەولێری (کە بە مزگەوتی دوو دەرگا بەناوبانگە). مامۆستا مەلا ئەورەحمان (کە بە کۆڵ ناسرابوو) لەوێ موستەعید بوو، باوکم دەیووت زۆر زیرەکە. هەر بە یەکجار (بیناو عەوامیلی جورجانیو فەتحولقەریبی شەرعم دەست دایە). مامۆستا چەند دێرێکی تێدەگەیاندم ئەوسا خۆی دەچووە ناو باخی مزگەوتەکەوە، من لە ڕاڕەوی مزگەوتەکەدا لاسایی فەقێکانم دەکردەوە کە بە دەم لەبەرکردنەوە دەیانووت: (ئەرێ بابەکەم) و لەبەرم دەکرد. ئێستاش ئەو سەرەتایەم لەبەر (اعلم ان ابواب التصریف خمسة وثلاثون بابا. ستة منها للثلاثي المجرد). خوێندنەکەم زۆر لا خۆشبوو. چونکە ئەوەك حوجرەو نە وەك قوتابخانەی ئەوسا لێدانو تووڕەبوونی مامۆستای تێدا نەبوو. هەرچەندە وابزانم زیرەکیش بووم، بەڵام مامۆستا مەلا ئەورەحمان —تەمەن درێژتر بێت- زۆر ڕەنجی لەگەڵدا دام تا تێم بگەیەنێت (تەسریفی فیعل- تصریف الفعل) چییە، یا لە شەرعەکەدا (تاهیرو موتەهیر- طاهر و مطهر) و (قولەتین- قلتین و ۲۰۰ رەتل- رطل-ی بەغدادیم) تێ بگەیەنێت. بە هەموو حاڵ ئەو سەرەتای خوێندنەو خوێندنی لەمەودوواشم لای باوکم عەشقی ڕێبازی خوێندنی مزگەوتی کوردستانی لە دڵدا هێشتمەوە. کە لە کاتی خۆیدا وەك ڕێبازی پەروەردە دێمەوە سەری‌و باسی دەکەم.

من هیچ فەقێیەتیم نەکرد، کە لام وایە جۆری فەقێیەتیی کورد سوودی زۆری هەبووە لە پێگەیاندنی گەلێك کەسی بلیمەتدا. بەڵام لە ژیانی مەلاو فەقێو جۆری خوێندنیانەوە دوور نەبووم.

هاتبوومە سەر باسی قوتابخانەی ناوەندیمان. لە پۆلی یەکەمدا تاقە مامۆستای کورد کە دەرسی پێ ووتین، مامۆستا جەلال نیهال بوو کە (زانستی گشتی)ی پێ دەووتین. گلەییمان لێی ئەوە بوو. کە زۆر کەم کوردیی بەکاردەهێنا. دووایی کە ناسیمو گەورە بووم زانیم پیاوێکی زۆر باشەو گیانی کوردایەتیی بەهێزە. بەڵام بۆ فێربوون دەبوو بەو جۆرە دەرس بڵێتەوە.

حساب (ماتماتیك) مامۆستایەکی موسڵاوی حەننا تۆبیا بوو، بەلام باشی تێدەگەیانین. ئەندازە مامۆستا سلێمان ئەلەلاح بوو، ئەویش موسڵاوی بوو، وا دیار بوو دایکی کوردە، زۆر لە سلێمانی مایەوە. سەیر ئەوە بوو، بەشێك لە دەرسی عەرەبیشی پێ دەووتین- (ئیملاو ئینشا)، ڕەنگە بۆ پڕکردنەوەی سەعاتەکانی خۆی بێت. ئێمە کرابووین بە سێ لق (شوعبە)وە، وا بزانم ڕەچاوی تەمەنیش کرابوو. ئێمە منداڵتر بووین لە لقەکانیتر، وابزانم لە شوێنیتردا باسم کردبێت. هەر چووینە قوتابخانە (مستەفا ساڵح کەریمو محەمەد کەریم فەتحوڵڵاو من) لەسەر یەك کورسیی درێژ پێکەوە دانیشتین. جوامێر لە پشتمانەوە بوو. بەڵام دیار بوو کە من لە پۆلەکە لە هەموویان منداڵتر بووم.

قەواعیدی عەرەبی مامۆستا شەهاب ئەحمەد خەمیس پێی دەووتین -کە خڕو ڕەشتاڵە بوو. دواتر لە بەغدا زانیم ئەندامی پارتی سەربەخۆیی (استقلال) بوو، بەڵام خوا هەڵناگرێ هیچ ڕەفتارێکی دەمارگیریو شۆڤێنی پێوە دیارنەبوو. ئەو تازە دەرچووبوو، لقەکەیتر کە پەنجەرەیان لەسەر ژوورەکەی ئێمە بوو مامۆستایەکی موسڵاوی (یوسف قەسیر- قصیر) عەرەبیی پێ دەووتن، گوێمان لە دەنگی دەبوو، دەیانووت: زۆر مامۆستای چاکە. داوای ئەومانکرد،

بەڵام دیارە بەڕێوەبەرو دابەشکردنی دەرس نەخشەی خۆی هەبوو ئێمە تێی نەدەگەیشتین‌و هەقی ئەو داواکردنەشمان نەبوو.

بۆ عەرەبی نەزانینمان دوو قسەی خۆش دەگێڕمەوە: مامۆستا شەهاب ڕۆژێك لە قوتابیەکی پرسی (کۆ) واتە (جەمعی) قەڵەم چییە. ئەویش زۆر لە خۆڕازی تینی دایە خۆی‌و هەستاو ووتی: (قەلەمون)، هەموومان دەستمانکرد بە پێکەنین، دیاربوو دەمانزانی وانییە. ئیتر تا ماوەیەکی درێژ ئەو هاوەڵەمان بە (قەلەمون) تووڕە دەکرد، ئێستاش بە گەورەیی ناوێرم ئەوەی بیربخەمەوە. ڕۆژێکیتر مامۆستا شەهاب لە کاك (جەمال جەلال فەتتاح) (جەمال شۆتەر)ی پرسی: ئەسمائی خەمسە چەندە، ئەویش بە پێکەنینەکەی خۆیەوە ووتی: چوارە، ئێمەش هەموو پێکەنین، چونکە دەمانزانی (خەمسە) مانای (پێنجە) یا (ناوەکانیش: واتە —ئەسمائیش نەزانین) تا دووایی دەرس هەر پێکەنین بوو. کاك جەمال خۆیشی تا ئێستا بەوە پێدەکەنێ. بەڵام خۆش ئەوە بوو کە دەرس بڕایەوە کاك جەمالەدین (نەبەز) بەم شیعرەوە بۆی هاتە دەرەوە.

ئەسمائی خەمسە چوارە        دووپشك‌و مشك‌و مارە

قەڵەڕەش‌و کۆلارە.. هتد

مامۆستایەکی موسڵاویتر عەبدولئەحەد (کە مەسیحی بوو مێژووو جوگرافیا)ی پێ دەووتین. زۆر دەرسەکەیمان پێخۆشبوو باشی تێدەگەیاندین، لە خەتیبێك دەچوو، لە تاقیکردنەوەدا شێوەی شەبەحی بەکاردەهێنا (بەڵێ- یا نا). بە ڕاستی هەندێك قوتابیی تەمەڵمان هەبوو، بۆ ئەم پرسیارانە بە دزییەوە (شێرو خەت)یاندەکردو هەندێکجار دەیگرت. هەموومان ئەم جەشنە تاقیکردنەوەیەمان لا خۆشبوو.

مامۆستا عەبدولئەحەد کە بە داخەوە ناوی باوکیم لەبیر نەماوە. کە چەند دەقیقەیەکی دەرس دەماو ووتنەوەکەش تەواو بوو وەك مامۆستایتر نەیدەووت

بچنە دەرەوە یا خەریکی خوێندنەوە بن، بەڵکو بە دەنگە خۆشەکەی خۆی قورئانی بۆ دەخوێندین، ئێستاش بیرمە ئەو ئایەتانەی دەخوێند کە باسی حەزرەتی عیسا دەکات. ئێمەی منداڵ ئەوەشمان زۆر لا خۆشبوو کە مامۆستایەکی مەسیحی[٢٩] قورئان بخوێنێت.

دوو مامۆستای ئینگلیزیمان هەبوو. هەردووکیان دراوسێمان بوون. هەردووکیان هاتوۆچی باوکمیان دەکرد لە مزگەوت. مامۆستا ئەحمەد عەبدولجەببار خەڵکی باقووبە بوو. ئێواران دەهات لای باوکم دەرسی فارسیی دەخوێند. بیرمە خوێندنەکەی لە کتێبی "گوڵستان"ی سەعدیی شیرازیدا بوو. منیش دادەنیشتم گوێم لێدەگرت. بەڵام ئەوەی لە پۆلی یەکەمو دووەمی ناوەندیدا ئینگلیزی پێ دەوتین مامۆستا عەزیز سەبوور (صبور) بوو. باسی ئەم مامۆستایە لاوەستانێکی دەوێت.

پیاوێکی باش، ڕووخۆش، مامۆستایەکی دڵسۆزو زانا. خێزانەکەی فارس بوو، ئەوسا تەنیا کوڕێکی دووساڵانەیان هەبوو ناوی فوئاد بوو مامۆستای ئامادەیی ئەو کاتە زۆر کەمبوون. لە ڕیزی یەکەمی ڕووناکبیری شاردا دادەنران و لە پلەی یەکەمی کۆمەڵایەتیشدا بوون. بەڵام مامۆستا عەزیز سەبوورو خێزانی پێوەندییان لەگەڵ هەموو گەڕەکدا بە فەقیرو هەژاریشەوە هەبوو، هاتووچۆی هەموانیاندەکرد. لەگەڵ ماڵی ئێمەدا هەر تەواو بەینیان خۆشبوو. مامۆستا عەزیز ئێواران لەگەڵ چەند ڕووناکبیرو مامۆستایەکی سەرەتایی گەڕەکدا تا گردی سەیوان بە پیاسە دەڕۆیشتو قسەیان دەکرد. هەبوون دەیانووت: بەهائیێتی

---

٢٩-لە ناوچەی هەولێر وشەی (دیان) بەرامبەر بە مەسیحی بەکاردەهێنرێت. لە بادینان (فەلە) دەڵێن. لە سلێمانی کە پێیان دەڵێن (گاور) و تا ئێستا بە گەڕەکەکەیان دەڵێن (گاوران)، لای مەسیحییەکانی سلێمانی ئاساییە، چونکە خەڵکی ئەم گەڕەکە ئەوەتی سلێمانی دروستکراوە لەگەڵ خۆشیو تاڵیو ترشیی موسڵمانانو نموونەیەکی تێکەڵیو خۆجیانەکردنەوەن.

بڵاودەکاتەوە. بەڵێ بەهائی بوو، بەڵام لە کەسم نەبیستووە (لەمەودووا) کە چ ئەو چ ئەو مامۆستا بەهائییانەیتر کە سەردەمێك لە سلێمانی بوون ئەو هەوڵەیان دابێت (نورەدین عەبباس، ئەدیب ڕەزا بەغدادی- دوواتر).

لێرەدا دەمەوێ شتێك لە بارەی بەهائییەوە بڵێم: ئەم ئاینە یا ئەم ڕێبازە ئاینییە لە باشووری کوردستاندا نەبووە. هەرچەند ئیشارەتێك لە بارەیەوە هەیە. لەناو خەڵکدا (خورمای بابی) بەناوبانگبوو، گوایە بابییەکان کە یەکێك دەچێتە کۆڕو کۆبوونەوەیان جۆرە خورمایەکی دەدەنێ ئیتر گوێ ڕایەڵ دەبێت بۆ هەموو شتێك، بێگومان ئەمە ڕاست نییە، بەڵام خورمای بابی لە مەودووا بووە سیفەتێك کە بە هەموو تاقمێکی ووشك‌و دەمارگیری سیاسی دەووترا. شەهید مەحموود جەودەت کتێبێکی بە ناوی (بەهائوڵاو دەروی نوێ)وە کردووە بە کوردی. بەڵام هەموو ئەوانەی ئەو کوردە ئازاو نەبەردەیان ناسیوەو من لێم پرسیون دەیانووت —لە بارێکی ناخۆشدا بە پارە وەریگێڕاوە. یا ویستویەتی کورد شتێك لەو بارەیەوە بزانێت.

حیکایەتێکیتر لە بارەی سلێمانی‌و بەهائوڵاو دەگێڕرایەوە نازانم چەند ڕاستە یا نا.

گوایە کاتێ شێخ فەتتاحی خانەقا لە پاش ڕۆیشتنی مامی (مەولانا خالیدی ۱۸۲۰) چووتە جێگەی مامی لە خانەقا، سۆفییەك پەیدا بووە بە ناوی سۆفی محەمەدەوە. خەڵکی گەڕەك‌و شار زۆریان خۆشویستووەو باوەڕیان پێی بووە.ساڵێك لە خانەقا بووە. هەمیشە لە ریزی پێشەوە لە پشت شێخ فەتتاحەوە نوێژیکردووە. بەیانییەك خەڵك دێن بۆ نوێژ، تەماشا دەکەن سۆفی محەمەد دیارنییە، لە شێخ فەتتاح دەپرسن، کوا سۆفی محەمەد. دەڵێ: ئەو سەگە لە ژوورەکەی مندا تۆپیوە بیهێننە دەرەوە لە سەرە نوپلکێك فرێی دەن.

کە بە سەرسامییەوە لە شێخ دەپرسن چی بووەو چۆن وا باسی سۆفی محەمەد دەکات، دەڵێت: شەوێ ئەو سەگە هاتە لام ووتی: قوربان، پاروو لە دەم

داکەوێت بۆ گۆش باشە. نهێنییەکەم لایە دەبێ پێش هەموو کەس بە جەنابتانی بڵێم، چی بێ لە ئێوە نهێنی، من وەحیو فەرمانی خواییم بۆ هاتووە، دەبێ پێش هەموو کەس داوا لە ئێوە بکەم بەیعەتم پێ بکەنو چیشتان دەوێ لە موعجیزە داوای بکەن تا پیشانتان بدەم. منیش (واتە: شێخ فەتتاح) ووتم لێرە دانیشە تا دەرەوە دەچمو ئەوسا قسەی لێ ئەکەین، چووم کۆمەڵێ داری باشم هێناو بەربوومە گیانی ووتم: وامن تۆ ئەکوژم خۆت زیندوو کەرەوە. هەموو دارەکانم لە گیانیدا شکان، هیچ بەرەنگاریی نەکردم، گیانی تێدا نەما، زمانی دەرپەڕان، بەو حاڵە بەجێم هێشت. خەڵکەکە دەچن تەماشا دەکەن کەس لە ژوورەکەی شێخ فەتتاحدا نییە. دەڵێن سۆفی محەممەد لەوێوە ڕادەکات دەچێتە سەرگەڵوو ساڵێك لە ئەشکەوتێکدا لە خەڵوەتدا دەبێ.

من هەقی ڕاستیو ناڕاستی ئەم حیکایەتەم نییەو لێرەدا موناقەشەی ئەوە ناکەم، بەڵام کە دەووترا ئەو سۆفی محەممەدە بەهائوڵڵا بوو ئەوە لە بەردەمی چەند تێبینییەکدا ڕادەگرێت.

-زۆرجار ئەوەم بیستووە کە نورەدین عەبباس سەری سەرگەڵووی دەداو بە شوێنێکی پیرۆزی دەزانێ. بەڵام ئەمەی من بیستنە.

-ئەوانەی لەسەر هەقەیان نووسیوە لێم پرسیون لەم پێوەندییە نادوێن، هەرچەندە ئەگەر لە ڕێبازی ئاشتیخوازانە -خەباتی سیلبی هەقە (دارەقوڵە هەڵگرتوو بکۆڵینەوە بەلای ئاشتیخوازانەو دوورە کاریی شۆڕشگێڕیی بەهائییەکانم دەبات. لە کاتێکدا تاقمێکیتر لە نەقشبەندی کە هەندێك لایەنیان لە هەقەکان دەچێت. وەك نوێژ نەکردنو ڕۆژوو نەگرتن، نەچوونە حەج، ئەوە باسی زەکات نەدان مەکە.. هتد کەچی یا وەك هەقە مەسیحییانە نین، بەڵکو لە شۆڕشو چەك هەڵگرتندان، کەچی ساڵێکی پاش ئاوارەیی بچنە گوندە سووتاوەکەیان، دەڵێن: بن میچەکان ڕەش بوون، واتە: کاتی هەڵسانو چەمك هەڵگرتن هاتووە، ئەمانەش بەرزانییەکانن وەك هەقەکان ڕێبازی نەقشبەندییان لە مەولانا خالیدەوە وەرگرت.

-لە کاتێکدا کە کاک مستەفا عەسکەری کتێبی "هەقە"ی نووسی منیش لەگەڵ مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵاو کاکە حەمەی مەلا کەریم هەر یەکە چەند باس‌و لاپەڕەیەکمان خستە سەر، هەر وەك پێشەکیشم بۆ کتێبی کاك دانای کاکە حەمەی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەش لە بارەی هەقەوە نووسی (چاپنەکراوە). نەمویست بە تیسکەی تفەنگیش بە لای ئەم باسەی بەهائوڵڵادا بچم، چونکە ئەوکاتە ڕژێمی بەغدا هێرشێکی زاڵمانەی دڕندانەی نامەردانەی بردبووە سەر تاقمی بەسزمان‌و بێوەیی بەهائی. لەو ئیشارەتە ترسام نەك هەقەش بگرێتەوە. بەڵام ئێستا (کە ڕێی کۆچ گوشادەو ئاسان- کوا سەرخێڵ خێڵی لێخوری بۆ کوێستان) (وەك پیرەمێرد دەڵێ). مەبەسم ئەوەیە کوا کەسێکی شارەزا یا یەکێك کە لەمەوبەر بە هەقەوە خەریکبوون، لەم سەربەستیی‌یەدا کە ئێستا لەم مەیدانی ئەم باسەدا لە کوردستان‌و لە دەرەوە هەیە. وەڵامی ئەم مەسەلەیەمان بە ئا یا نا بداتەوە.

-بۆ باسی بەرزان‌و بەرزانییەکانیش بە داخەوە ڕاستی‌و لێکدانەوەی زانستی لە گێژاوی هێرش‌و سووك کردنی ناڕەوا، یا ستایش‌و خەرمانی جوانی بەبێ-گوێدانە زانستی وا وونبووە. کە بە ڕاستی بێجگە لە لایەنی شۆڕش‌و فیداکاری‌و سەرکردەیی، یا هەڵەی مێژوویی (کە کەس لێی بێبەری نی‌یە) کۆمەڵی بەرزان‌و مێژوو لە ڕووی ئابووری‌و بیرو کۆمەڵایەتی‌و ئاینەوە جێی لێ وردبوونەوەو باسی زانستی‌یەو شتێکی دانسقەیە بەڵام وەرە لەناو ئەم دووبەرەیەدا دڕ بە کاروانی ڕاستی بدە.

-کە بەو جۆرە لە هێرشی سەر بە ئاهائی‌یەکان دووام. مانای وا نی‌یە کە ئاگام لە سەرەتای بەهائێتی‌و هاندانی ئەو ڕێبازەو ڕێبازی قادیانی نی‌یە لە لایەن سەرمایەداری جیهانەوە، یا ئاگاداری هەڵوێستی زانایانی ئیسلام نیم لەو بارەیەوەو ڕای خۆم لەم مەسەلەیەدا نی‌یە. بەڵام ئەوەی کە ئاگادارم ئەوەیە بەهائیش لای ئەوە نوێکانیان لە پێوەندی‌و ڕەگە کۆنەکانی جیابۆتەوەو ئێستا

ئەوانیش وەك کەسانی ئاینیتریان لێ هاتووەو زۆریان هەر ئەوەیە لەسەر ئاینی باوو باپیریانن (بل قالوا انا وجدنا آباءنا علی امةوانا علی آثارهم مهتدون)[30] و ڕەنگە هەر لە دەفتەردا بەو ناوەوە نووسرابن، ئیتر ئەم هێرشی گرتن و کوشتنە ناڕەوایە لەسەر بیروڕاو هەڵوێستی باووباپیر (هەرچییەك بێت، بۆچی، بە داخەوە کەسیش لە بێکەسیی ئەوانیشدا دەنگی بەرز نەکردەوە).

-وەك من بزانم بەهائی لە باشووری کوردستاندا کەسیان نەبوو ئەوە نەبێ کە هەندێك کەس کتێبەکانی ئەوانیان خوێندبێتەوە. (لەو ڕووەوە ئاگاداری ڕۆژهەڵاتی کوردستان نیم).

* * *

چووینە پۆلی دووەمی ناوەندی، هیچ گۆڕینێکی ئەوتۆم لەبیر نییە. مامۆستاکان هەموو نەگۆڕان، بۆ عەرەبی بوو بە مامۆستایەکی لاو. حامید مەحموود ئەلهاشمی کە زۆری پێنەچوو لە ئەنجامی زۆر خواردنەوەدا کۆچی کرد.

شتی نوێ لە پۆلی دووی ناوەندیدا یا نەبوو، یا من کەمم لەبیرماوە. مامۆستاکان زۆریان لە جێی خۆیان نەبوون، ناوی هەندێك دەرس گۆڕرابوو یا زیادیکردبوو. مامۆستا جەلال نیهال کیمیای پێ دەووتین. هەروەك خۆی بوو. مامۆستایەکی زۆر کۆنی قوتابخانەکە، کە نازانم لە کەیەوە مامۆستا بوو دەرسی "تەئریخی تەبیعی"ی پێ دەووتین ئەویش مامۆستا ئەحمەد ئیبراهیم واتە: ئەحمەدی قازی بوو. زۆرمان پێخۆشبوو کە مامۆستایەکی کورد ئەو دەرسە تازەیەمان پێ بڵێت. بە ڕاستی ئەویش ئەو پێخۆشبوونەی لە دڵدا زیادکردین. زۆر جار دەرسەکەی بۆ دەکردین بە کوردی یا بە کوردی بۆی لێکدەداینەوە. ڕووخۆش، قسەخۆش، هێمن، ڕەوشت بەرز. مامۆستا ئەحمەدی قازی گەلێك

٣٠-الزخرف/ ٢٢).

ساڵ پاش ئەوەش هەر مامۆستا بوو. دەرسی بە سەدان قوتابیی سلێمانی ووتۆتەوە. لەو شتانەی لە بیرمە ئەوەیە، کە ئەویش گاڵتەی لەگەڵ کاک جەمال جەلال فەتتاح دەکرد. قسەیەکی خۆش هەیە، من یەکەمجار لە دەرسی ئەودا بیستوومە، ئیتر نازانم پێشتر هەبووبێ یا نا؟ ڕۆژێك پرسیی: ئەرێ جەمال بەراز هێلکە دەکات یا نا. جەمالیش نەیدەزانی ووتی: ئوستاد، بەراز حەیوانێکی موزیرە؟ کە کردی کردی.

لە قسەی خۆشی لەمەودووای مامۆستا ئەحمەد ئیبراهیم شتێکیترم لەبیرە. ساڵی ١٩٥٥ قوتابیی دەرکراوی کۆلێجی بەرزی مامۆستایانبووم، بووبووم بە مامۆستای سەرەتایی. لەبەرئەوە هەر لە ڕێکخراوی نهێنیی قوتابیاندا کارم دەکرد. لێپرسراوی ئەو قوتابییە ناوەندییە بووم کە فاروقی برام (فاروقی مەلا مستەفا) لە پۆلی یەکەمیدا بوو و زۆر منداڵیش بوو. هەروەها ڕۆژانە من نامەم بۆ ئەندامانی لیژنەکەیان لە ڕێگەی ئەوو بەکری خاڵۆزام (بەکر قادر)ی ئەندازیارەوە دەنارد. کە ئەویش هەر لە پۆلی یەکەمبوو و منداڵبوو. ئەوەی بیرم بێت ئەندامەکانی لیژنە عەباسی مەلا قادری نانەوا، فائیق ساڵحی چاپچی، حەمە کاکەی وەرزشکەر، محەمەد فەتتاح بوون. ڕۆژێك کۆمەڵێ بەیاننامەی یەکێتیی قوتابیان (اتحاد الطلبة)ی نهێنیم بۆ ناردن کە لە قوتابخانەکەدا بڵاویبکەنەوە. ئەوانیش فارووقیان گرتبووە کۆڵ و پاڵۆتیەکیان دابو بەسەرشاندا پاڵیان بەم دیوارو ئەو دیواری قوتابخانەدا دابوو ئەویش لە ژێرەوە بەیاننامەکەی لکاندووە بە دیوارەکەوە. قوتابخانە پڕکرابوو لە بەیاننامە. مامۆستا ئەحمەد –یا بڵێین ئەحمەد ئەفەندی پێی زانیبوو، چۆنیشی زانیبوو کە فارووق ئەم کارەی کردووە نەمانزانی. بانگی کردبوو ووتبووی: تۆ ئەم بەیاننامەیەت بڵاوکردۆتەوە. ئەویش ئەوساش هەر زۆرزانبوو، خۆیی لێ گێل کردبوو، خۆی لێکردبوو بە منداڵێکی نەزان. ئەخێر دووا قسەی ئەحمەد ئەفەندی ئەوە بوو: ئەخێر هەر تۆیت، ئیتر وازی لەم بەیاننامەو ئەم

(ئیتیحادی تەنەکە)یە نەمهێنی لای باوکت شکاتت لێ دەکەم. جا بزانن: (لای باوکت)، لای حکومەتو پۆلیس نا.

هەر لە پۆلی دووەمدا دوو دەرس مامۆستای مێژوومان نەهاتبوو، مامۆستا ساڵح سەعید تاقە دوو دەرسی پێ ووتین، مامۆستای کیمیاش دوو دەرس نەهاتبوو بەڕێوەبەرەکەمان کە مامۆستا ومدیع فەتحوڵڵا میرزا بوو دوو دەرسی پێ ووتین، بە ڕاستی هەردووکیان حەپرانیانکردین. ئەتوانم بڵێم تا ئەو کاتە دەرسی وا خۆشمان نەدیبوو. ئەو دوو مامۆستایە دەرسیان بە پۆلەکانی بەرەو ژوورتر دەووتەوە، ئیتر قوتابییانی پۆلی ئێمە کە ئەوەیان دی دەیانووت: دیارە ئێمە لە ژنە دۆمەکەین.

هەر لەو پۆلەدا شتێکی خۆش بگێڕمەوە. دەرگای ژوورەکەی ئێمە لەناوەوە ئەڵقە ڕێزێکی هەبوو. هەندێك قوتابیی گەورە لە پۆلەکەدا فێربووبوون پەتێکیان دەبەست بە نووکی سەرەوەو دەیانهێنایە خوارەوە تا دەرگا دادەخرا ئەوسا لەمدیوەوە پەتەکەیان دەقرتاند کە دیارنەبێ. ئیتر مامۆستا دەهات وا ژوورەکە داخراوەو دەرسی نەدەووتەوە، ئەمە هەر جارێك یادوو سەریگرت. جاری سێیەم، مامۆستا چووە لای بەڕێوەبەر ئەویش هات. کە سەیری منی کرد ئەوەندە بچووکم بە کەتیبە چوار سووچەکەی پەنجەرەکەوە دەچم، کردمیانە ژوورەکەوەو دەرگام کردەوە. ئەمەش هەردوو جار بوو. بانگیانکردم بۆ لای بەڕێوەبەر کە زۆری لێ دەترساین، ووتی: دیارە ئەمە خۆت دایدەخەی من زۆرم سوێند خوارد، زۆری لێ ترسام، ئیتر مامۆستاکان بۆم پاڕانەوەو پێیانووت کە من ئەو جۆرە کارانە ناکەمو لە دەرس ڕاناکەم. ئەوەی ئەو کارەشی دەکرد ئیتر وازیهێنا.

* * *

ئێمە هەوارمان گواستەوە بۆ پۆلی سێیەمو قوتابخانەش گواسترایەوە بۆ ئەو بینا تازەیەی گەڕەکی چوارباخ، تازە دروستکرابوو تا ئێستاش هەر قوتابخانەی

ئامادەییەیە. زۆر دڵمان بە جوانیو پاکیو تازەیی بیناکە خۆشبوو تازە کەوتبووینە سەر ئەوەی گوێ لە شیعر بگرینو باسی شیعری شۆڕشگێڕ بکەین. لە دروستکردنی ئەو بینایە قوتابیانی لە ئێمە گەورەتر باسی شیعرەکەی جەواهیرییان دەکرد کە لە کردنەوەی ئەو بینایەی قەزای حەی (الحي)دا کە بلاسم ئەلیاسین بە ۲۸ هەزار دیناری ئەو کاتە دروستیکرد بوو خوێندبوویەوە.

قم حي هذي المنشئات معاهدا

الناهضات مع النجوم خوالدا

هەندێك ڕەخنەیان لێدەگرت کە چۆن شیعر بۆ دەرەبەگێکی وا گەورە دەڵێت. جەواهیری لە یادداشتەکانیدا لەو شیعرانە دوواوە. بەڵام من شتێکیترم لە بارەیەوە بیستووە. ساڵی ۱۹۵۲ لە بەندیخانەی مەرکەزی بەغدا بەند بووم. تێکۆشەری دێرین ڕەشاد حاتەم (هونەرمەند) زۆر لەسەرخۆ یادگاری کۆنی بۆ دەگێڕاینەوە. بە تایبەتی لە بارەی هاوڕێ فەهدەوە. قسە هاتە سەر ئەم شیعرەی جەواهیری ووتی: ئێمە کەوتینە قسەو لۆمەکردنی جەواهیری، هاوڕێ فەهد ووتی: ئەمە بولبولە، ئەو دەرەبەگە بینایەکی وا جوانی لە قەزایەکی دوورو لاچەپو دواکەوتوودا بۆ خوێندنی منداڵانی گەل دروستکردووە ئەمیش بۆی دەخوێنێ. ئێوەش بۆی ڕاپەڕن، شۆڕشی بۆ بکەن بۆتان دەخوێنێ. هاوڕێ ڕەشاد ووتی: پاش ڕاپەڕینی کانوون کە شیعرەکانی جەواهیریی دەخوێندەوە هاوڕێ فەهد دەیووت: چیم پێ ووتن.

وەك بینای قوتابخانە گۆڕرا، زۆر ڕوخساری خوێندنیشمان هەر گۆڕا. مامۆستا وەدیع گوێزرایەوە بۆ بەغدا لە ساڵی ۱۹۵۲دا مامۆستایەکی کۆلێجی زانست بوو دیمەوە. مامۆستا جەلال نیهال بوو بە بەڕێوەبەر.

مامۆستایەکی ئینگلیزیان هێنابوو ناوی میستەر هەمفری بوو، ئەو ئەگبەتە لەو ساڵەدا هاتبوو کە ساڵی ڕاپەڕینبوو ۱۹٤۷-۱۹٤۸، کەم قوتابی لەوە دەگەیشتن کە ڕەنگە ئینگلیزیش بێتو پیاوی باش بێت. هەندێك لە شیوعییەکان

دەیانووت: بابە، ئینگلیز چەرچلیشی هەیەو هاری پۆلیتیشی هەیەو بۆیان باس دەکرێن هاری پۆلیتو ولیام گلاشێر کین. هەندێك دەیانووت ئێمە لە ئینگلیزەوە باشتر ئینگلیزی فێردەبین، بەڵام قوتابییە شەرلەتانەکان شەڕیان پێ دەفرۆشتو جارێکیش لێیاندا ئەویش ساڵ تەواو نەبووبوو ڕۆیشت.

مامۆستا ئیبراهیم عەزیز (مەسیحیی مووسڵ) فیزیای پێ دەووتین، مامۆستای چاكو پیاوی چاك بوو. لێرەدا بوەستمو بڵێم هەموو ئەو مامۆستا موسڵاوییانەی لە سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەییدا دەرسیان پێ وتووین پیاوی چاکبوون. ئەو گیانە پڕ ڕقو شۆڤێنییەیان تێدا نەدەبینرا کە لە ساڵی ١٩٦١ بەدوواوە، سروشتی نامرۆڤانەی ئەفسەرە موسڵاوییەکانی ناو سوپا بوون.

مامۆستا ساڵح ئیبراهیم (خەڵکی باقووبە) بوو، عەرەبیی پێ دەووتین، زۆر شارەزاو توانابوو. ساڵی ڕاپەڕین بوو، زۆر قسەی باشی دەکرد. ماوەیەکی زۆر لە سلێمانی مایەوە. بە ساڵح چاوشین ناودەبرا.

هەر لەگەڵ ئەو ساڵی ڕاپەڕینەدا دوو مامۆستای تازە دەرچووی کورد بە بەهرەو تواناو گیانێکی کوردانەو پێشکەوتنخوازانەوە دەرسیان پێووتین. دەرسەکانیان تێکەڵ بە لێکدانەوەی سیاسی دەکرد، بە پێچەوانەوە.

مامۆستا کەمال ئەحمەد سەعید (کەمالی ئەحمەد بەگ) جوگرافیای پێ دەوتین، بەڵام لە دەرسەکەیدا باسی کارە سیاسییەکانی ڕۆژی دەکرد. کە ئەوکاتە موناقەشەی (کورد ئوممەیە یا نا) لەناودا بوو. داوای لێکردین بە هێمنی ئەو باسە موناقەشە بکەین. شیوعییەکان هەر بە قسەکردن لە نەبوونی یەکێتیی ئابووری ئەدووان (کە لە شوێنێکیتردا باسی دەکەم). ئێمەی سەر بە پارتی ئەو بڵاوکراوە ناوخۆیەی پارتیمان نووسیوەو کاك مەحموود محەمەد قادر (مەحموودی حەمەی لەیلێ) وەك خۆی خوێندییەوەو ئیتر موناقەشە نەکرا. ماۆمستا کەمال ڕای خۆی دەرنەبڕی. نازانم بۆچ کاك کەمال لەناو قوتابیاندا بە شیوعی دەناسرا.

ماموستای دووەم: محەمەد محەمەد ساڵح (محەمەدی حاجی حمە ساڵح بەگ) بوو (کە دوایی بوو بە دوکتۆرو سەرۆکی زانکۆ) دەرسی مێژووی ئەورووپای پێدەوتین، لە باسی شۆرشی فەرەنسەدا تینی بە بیری شۆرشگێرپمان دەدا. خۆی کوردپەروەرێکی دیاربوو. بەڵام ئەوکاتە دیمەنی کوردێکی چەپی پێوە دیاربوو. کە ئەوە دیمەنی تاقە حیزبی کوردستانیش بوو کە پارتی دیموکراتی کورد بوو[٣١].

لەو ساڵەدا تەنیا لەو ساڵەدا مەلا مستەفای حاجی مەلا رەسووڵ (سەفوەت-باوکم) لەسەر داوای بەڕێوەبەری زانیاری (مودیری معارف) ماموستا عەبدولەجید حەسەن وەلی دەرسی ئاینی پێ دەووتین. یەکەمجار بوو مەلایەك بێتە قوتابخانەی ناوەندیو ئامادەیی‌یەوە دەرس بە قوتابیان بڵێت. هاوەڵەکانم عەرەبی زانینو بیری کراوەییان زۆر لا سەیر بوو.

بۆ یادی ئەو ساڵە دوو گێرانەوەم هەیە:

١-نیوەی ساڵ نازانم لە بەرچی بووە هەموو مانمانگرتو نەچووین بۆ قوتابخانەو تاقیکردنەوە. وەزارەت لە بەغداوە ماموستا محەمەد عەلی مستەفایان نارد. کە سەرۆکی موفەتیشەکانی عێراق بوو. ماموستایەکی گەورەی ماتماتیك بوو لە وولاتدا، لە بنەرەتدا قەرەداخی بو. لەگەڵ نوێنەرانی قوتابیاندا کۆبۆوەو (پاش ماوەی تاقیکردنەوە چووینەوە قوتابخانە. لە زمان ماموستا محەمەد عەلی مستەفاوە قسەیەکی خۆشیان دەگێرایەوە گوایە لە نوێنەرانی قوتابیانی سلێمانیی پرسیووە چیتان دەوێو وتویانە: نەهێشتنی پەیمانی ١٩٣٠. وتویەتی: باشە. بەردانی بەندە سیاسی‌یەکان. وتویەتی: باشە. گوایە هەرچی داخوازە سیاسی‌یەکانی ئەو سەردەمەی وڵات هەیە داوایانکردووە وتویەتی باشە. دوایی هاتوونەتە سەر ئەوەی سەیری ئەوە نەکرێت کە نەچووین بۆ تاقیکردنەوە سەرلەنوێ تاقی بکرێینەوە. وتویەتی: ئەوە بەدەست من نی‌یە.

---

٣١-ئەم بەشە دووبارەکردنەوەی تێدایە، بەڵام وام لا باشبوو بمێنێ.

قوتابییان نوێنەرانیان ئەوەندە سادە نەبوون، ئەمە ڕەنگە هەر بۆ گاڵتەو قسەی خۆش وترابێت.

٢-ئەو ساڵە یەکەم ساڵ بوو، سەیرکردنی دەفتەری تاقیکردنەوەی بەکەلۆریای پۆلی سێیەم لە سلێمانی بێت. مامۆستا سادق بەهائەدین کە بەڕێوەبەری ناوەندیی هەڵەبجە بوو بەڕێوەبەری هەمو تاقیکردنەوەی سلێمانی بوو. لە بارەی ئەم تاقیکردنەوەیەوە کۆمەڵێك یادگارم هەیە جارێ هەڵیاندەگرم بۆ کاتی خۆی.

لەو ساڵەی ڕاپەڕیندا لە هەموو بۆنەو خۆپیشاندانەکاندا بەشداربووم. لە زۆربەیاندا خوتبەم دەخوێندەوە. باوکم لە ترسی ئەوەی بەو منداڵییە تووشی ناڕەحەتیو ئازار نەبم پێی ناخۆش بوو، لە لایەکیتریشەوە ئەو شیوعیەکانی لا پەسەندتر بوو لە پارتی، بە هۆی مەحمود ئەفەندیی هەمەوەندیشەوە لێیان نزیکبوو (تا مەسەلەی فەلەستین هاتەکایەوە) لەبەرئەوە دەیویست دووربم، زۆرجار دڵی ئازاردەدام. کە پۆلی سێیەمیشمان تەواوکردو قوتابخانە کرایەوە. ئەو ساڵە بەشی ئەدەبی لە ئامادەییدا نەبوو، منیش هیچ ئارەزووی بەشی زانستی (عیلمی)م نەبوو. زۆر بێتاقەتبووم. لە پڕ شتێك وەك مزدەی ڕزگاربوونم بوو هات. باوکم چووبوو بۆ بەغدا بۆ کۆنگرەیەك کە ئەوقاف گرتبووی بۆ لێدوان لە حاڵی مەلای عێراقو ژیانو گوزەرانیانو پشتگرتنی مەسەلەی فەلەستینیش.

مژدەکە نامەیەکی باوکم بوو.

(خێرا، تا من لە بەغدام، بەڵگەنامەکانتو جلو بەرگت کۆبکەرەوە، وەرە بۆ بەغدا، دەمەوێ لە کولیەی شەریعە بخوێنیت).

ئەوسا ئەو کولیەیە کە جێگرەوەی دار العلوم (دار العلوم)ی کۆنبوو دەرچووانی پۆلی سێیەمی ناوەندیی وەردەگرت، خوێندنیش تێیدا شەش ساڵ بوو، واتە لەگەڵ بەکەلۆریوسدا یەکی دەگرتەوە. بەڵام هەموو قوتابیان دەرچووی پۆلی سێیەمی ناوەندی نەبوون.

تومەز ئەو کۆنگرەیەی باسمکرد لە هۆڵی کولیەی شەریعە گیرابوو، باوکم ڕێکوپێکیی کولیەکەی لە ڕووی پۆلو دەوامو بەشی ناوخۆ (بە شوێنی نوستنو سێ ژەم خواردنەوە) و زیاد لەوە بە ڕیز پێنج فەرزە قوتابیان بردن بۆ نوێژ بۆ مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم –ئەبوو حەنیفەی زۆر لا جوانبوو. لەولاشەوە مامۆستا نووری عەبدوڵڵای ئاغجەلەری (مەلا نووری)ی دیبوو کە لە پۆلی دووەمی ئەو کولیەیە بوبوو[٣٢]. ئەویش زۆر هانی دابوو کە من بنێرێتە ئەو خوێندنگایەو پەیمانی دابوو کە ئاگای لێم بێو سەرپەرشتیم بکات. ئەمانە سۆزو ئارەزووی کۆنی باوکمی لەوەدا کە ببم بە مەلا تازەکردبۆوەو سەرەتا لەناو مەلاکانی سلێمانیدا شانازیی بەوەوە دەکرد کە جێگەی باوکی کوێر نابێتەوە، تەنانەت بیرمە مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ پێی وتبوو: (ئینشەڵڵا دەبێ بە موفتەدای خێر بۆمان) بەڵام دیاربوو نە ئاواتی ئەوو نە شێخی خاڵ نەهاتەدی.

بۆ من ئەوە مژدە بوو. یەکەم: ڕزگاربوون لەو بارەی تێیدا بووم. دووەم: چوونە بەغدا بۆ من لەو تەمەنی ١٤ ساڵیەدا ئاواتێکی گەورە بوو، ڕەنگە بۆ هەموو کوڕە هەژارێکیش چوونە بەشی ناوخۆو بەرگی باش پۆشینو خۆراکی باش خواردن شتێکی کەم نەبووبێت.

---

٣٢-مامۆستا نوری عەبدوڵڵا، کاتی خۆی لای باوکم لە مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵ دەیخوێند، لە من گەورەتر بوو. بۆ خوێندن لە سلێمانییەوە چووە کەرکووك. وابزانم بۆ مزگەوتی (نائیب ئۆغڵی) دووایی وەك فەقێیەکی زیرەك لە کولییەی شەریعە وەرگیرابوو. کە تەواوی کرد هەر لە سلێمانی بوو بە مامۆستای عەرەبیو ئاینو ماوەیەك بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندیی قەڵادزێ بوو پاشان سەرپەرشتی پەروەردە (مشرف تربوی) بوو. ڕۆڵێکی دیاری لە کوردایەتیو دامەزراندنی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستاندا هەبوو.

بە یەك ڕۆژ هەموو شتم ئامادەکرد بۆ سبەینێ بە ئوتومبیل چوومە کەرکووك‌و ئێوارە سواری شەمەندەفەر بووم‌و سەرلەبەیانی گەیشتمە بەغداو ئەعزەمیە، بەو جۆرە لاپەڕەیەکی تازەو سەیر لە ژیانم دەستی پێکرد. هەرچەندە ساڵێکی نەخایاند، بەڵام زۆر شتی فێرکردم، زۆر شتی لە ژیانم گۆڕی.

-٤-

بۆ ووشەی "مۆتیف" گەڕام لە فەرهەنگی ئەدەبیتناسیدا تا ئەو دیمەنەی کولیەی شەریعەتی پێ بشوبهێنم کە ڕاست لە هەندێ مۆتیفی ئەدەبیتر دەچوون. لە شوێنێکدا بە ڕووسی نووسرابوو: "مۆتیف- ووشەی مۆتیف-ی فەڕەنسی- "ئاوازو گۆرانی ووتنە"ە- ڕەگەزیش بناغەی بەرهەمی مۆسیقایە، مۆتیف لە بەرهەمی ئەدەبیدا جیا لە —باس-ی سەرەکیی خۆی جاروبار ناودەبرێت تەواوکەر، یا باسێك لە پلەی دووەمی ئەو بەرهەمەدا بێت کە بە هاودەنگی لەگەڵ باسی سەرەکیدا مەبەسێکی یەکگرتووی ئاڵۆزی بەرهەم پێك دێنن. ئەم ئیستیلاحە ئێستا کەم بەجێ دەهێنرێت".

لە فەرهەنگی چەند زمانی ئەوروپادا ڕوانیم، مۆتیف هەر ئەوە بو کە بە(هۆ) یا (پاڵپێوەنەر) یا (باس) زانرابو، بەڵام باسی مۆتیف لە زۆرس کتێبی ڕەخنەو تیۆریی ئەدەبیدا وام لێدەکات کە بە کوردی بە (کرۆك) یا (کۆڵەکەی باس)ی دابنێم مۆتیفێك هەیە لە (نشێو)ی گۆرکیدا لە (النخلة والجیران)ی غائیب توعمە فەرماندا دەیبینم. بە کوردی جۆرێکە لەو ماڵانەی پێیان دەووترا (حەوشی گەورە) نزیکتر بیمەوە، مەملەکەتەکەی پوور حەلیم لە (شار)ی حسین عارفدا لەوە دەچێت. چەند خێزانی هەژار هەریەکەی لە ژوورێکی خانوویەکی گەورەدا بژین. ژیانیان، تێکەڵیان، پێوەندیان کەرەسەی باسن.

بەڵام ئەم کولیەیەی شەریعەتە لە ڕوویەکەوە لەو مۆتیفە دەچوو. خۆی خوێندنگایەکی شەش پۆلی بوو. بەڵام تا ئەوکاتەی من چووم تا پۆلی سێیەمی

تێدا کرابۆوە. بە پێی یاسای خۆی دەبوو هەر دەرچووی پۆلی سێیەمی ناوەندیی لێوەرگیرێت. بەڵام زۆر قوتابیی چەند ساڵ لە پۆلی سێیەمدا کەوتووی تێدابوو. فەقێی هیچ لە قوتاخانەدا نەخوێندووی تێدابوو، فەقێ کوردەکان نەبن کە بە ڕاستی فەقێی لە خوێندندا پێشکەوتوو بوون هاتبوونە ئێرە، دەرچووی ناوەندیی ئاینیش هەبوون. چەند کەسی وەك من پۆلی سێیەمی تەواوکردووش هەبوون.

بەڵام هەریەکە بە مەسەلێك هاتبووە ئێرە ئەوانەی لە پۆلی سێیەمی ناوەندیدا دەرنەچووبوون، چەند ساڵ لەسەر یەك دەرنەچووبوون، دەتتوانی بڵێیت کەسانی بێ دەرەتان بوون، ڕوویانکردبووە هەموو جۆرە ئیشێك، لەپڕ دەروویان لێکرابۆوە، (لە شوێنێك وەردەگیرێن، نە بەکەلۆریی سێی ناوەندیو نە بە کالۆریای پێنجی ناوەندیدا تێپەڕ دەبن)، شەش ساڵ جێی نووستن‌و خواردنێکی سێ ژەمەی باش‌و جل‌و پێڵاوو مانگی موچەیەکی بۆ ئەوسا بۆ قوتابی باش. مانگی دوو دیناریان دەدرێتێو بە شەش ساڵ دەبنە دەرچووی کۆلێجێك‌و لە کارێکدا دادەمەزرێن کە مووچەو پلەیان لە دەرچووی کۆلێجەکانیتر کەمتر نابێت. لەناو ئەمانەدا کەسانی وا هەبوو وەك لە خوێندا باش نەبوون، تانووتی ئەوەیان لێدەدرا کە لە فلان شوێن‌و فیسار شوێن کاریان کردووە ئەوسا هاتوونەتە ئێرە. زوربەی ئەمانە دەربەسی نوێژو ڕۆژوو نەبوون، فریان بەسەر ئاینداریەوە نەبوو. کاتی نوێژ بەناو خوێندنەوەوە بەڕیز دەبراین بۆ مزگەوتەکەی (ئیمامی ئەعزەم)، لە یەکێك لەم دەستە قوتابییەیان دەگێڕایەوە. کە ڕۆژی هەینی لەناو بازاڕ دیویانە، لێیان پرسیووە. ئەوە نەچوویت بۆ نوێژی جومعە؟ وتبووی:

-ئەی ئەمرۆ هەینییە، ناو خوێندنەوەو ڕیز نییە، پشووە.

دەستەی دووەم: دەرچووی ناوەندیی ئاینی بوون. کە بە تەمای خوێندن تەواوکردن هاتبوونە ئێرە. ئەمانە وەك بە خوێندنەکەوە خەریکبوون، پیاوی بەدینیشیان تێدابوو. لەناو ئەمانەدا چەند کەس هەبوون کە هەر لە

فەقێیەتییەوە هاتبوون- بە تایبەتی چەند فەقێی کورد. کە دووایی هەر دەبێ باسیان بکەم.

دەستەی سێیەم: ئەوانە بوون کە سێی ناوەندیان تەواوکردبوو. هەر یەکەش شتێك هێنابوویە ئێرە. ئیتر سەر بە بنەماڵەی مەلا بوون –کە من یەکێك بووم لەوانە. یا بە هۆی هەژارییەوە توانستی دوواناوەندی تەواوکردنیان نەبوو. لە رووی سیاسییەوە. ساڵی پێشوو کە ساڵی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ بوو، پێکەوە بەشداربوونی قوتابیانی پۆلی یەکەم و دووەمی کۆلێجەکەلە خۆپیشاندانەکانی ئەو ڕاپەڕینەداو بە کۆمەڵ گرتنی زوربەی قوتابیان بۆ چەند شەو سیمایەکی سیاسیو نیشتمانپەروەرانەی دابوو بە کۆلێجەکە. بەڵام کە کەمێك ئازادی لە وڵاتدا گزنگی داو حیزبە ئاشکراکانو حیزبە نهێنییەکان کەوتنە چالاکیو ناکۆکی، ئەوا ئەمە لەناو قوتابیانی ئێرەشدا ڕەنگی دەدایەوە. زۆر کەم قوتابی لەوێدا بوو هەقی سیاسەتی نەبێ. وڵات بەرەو زەبروزەنگ نواندنی حکوومەت دەچوو، ئاشی عورقو خەڵك بۆ بەندیخانە ناردن لە گەڕدا بوو. بەڵام لێرەدا هێشتا گەرمیی موناقەشە ساردنەبووبۆوە. تەنانەت دیمەنی دابەشبوون بەسەر قاوشی نووستندا ڕەنگێکی حیزبی پێوە دیاربوو. بە قاوشێکیان دەووت قاوشی (قەومییەکان) ئەمانە سەر بە حیزبی ئیستیقلال بوون –هێشتا بەعس لە عیراقدا ناوی نەبوو. زوربەی ئەمانە لە دەستەی یەکەمی قوتابییەکان بوونو هەندێکیان تا ئەم ساڵانەش لە چالاکیدا بوون وەك قاسم سوهەروەردی (کە کوڕێکی زۆرباش بوو)، وەك تاها قەیسی کە لەمەودووا بوو بە بەعسیو پاش ١٧ی تەمووز گەیشتە پلەی باڵیۆز لە هەندێك وڵاتدا.

تاقمێك سەر بە ئیخوانی موسلیمین بوون. ئەمانە کەسانی بەدینی نائیخوانیشیان لە دەوری خۆیان کۆکردبۆوە. کەسانی ڕەقو ووشکیان لەناودا بوو، بەڵام کەسانی ڕەوشت بەرزیشیان لەناودا دیاربوو، وەك بڵێم: نوعمان

سامەرائی‌و ئیبراهیم مونیر ئەلودەریس. زۆری ئەمانەش لە دەستەی دووەم بوون هەرچەندە ناکۆکی‌و موناقەشەی نێوان کەسانی سەر بەم دوو رێبازە لەسەر نەگونجاندنی بیری قەومی بوو لەگەڵ ئیسلامدا، بە لای ئیخوانەکانەوە. بەڵام هەموو رۆژ کێشەی لایەنگیری لە عەمیدی کۆلێجەکە حاجی حەمدیی ئەعزەمی لە لایەن قەومی‌یەکانەوەو سۆزی ئیخوانەکان بەلای محەممەد مەحموود سەوافەوە- کە چاودێری گشتیی ئیخوان بوو لە عیراقداو ئەو ساڵە حاجی حەمدی لە مامۆستایی کۆلێجەکەی دوورخستبۆوە، هۆی ناکۆکی‌و لەیەك توورەبوون بوو. کە چەند کۆڕی ئایینی‌و رووناکبیری‌و ئەدەبی لە کۆلێجەکەدا دەگیرا- هەر لایەنە دەچوون لە دەرەوە خەڵکی وای سەر بە خۆیانیان دەهێنا کە قسە بکەن‌و موناقەشە بکەن. باش موناقەشەیەکی تیژی نێوان بەشیر ئەلخالیدی –کە خۆی ناو نابوو هیتلەری عیراق‌و نورەدینی مەلا رەزای واعیزم لەبیرە کە یەکەم بە لای قەومیەت‌و دووەم بە لای ئیسلامیدا دەدا.. هیچیشیان پێوەندی‌یان بە کۆلێجەکەوە نەبوو.

شیوعیش هەبوون. بەڵام چونکە من لەناو رێکخستنی ئەواندا نەبووم نەمدەزانی کامیان رێکخراون‌و کامیان نا؟ لەو گێژاوی حەوشە گەورەیەی کۆلێجەکەدا دیاربوو ئێمەی کورد هەر هەموومان لەوانەوە نزیکتر بووین وەك لەوانیتر. ئەوانیش سۆزێکی تایبەتی‌یان هەبوو بەرامبەرمان، ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆیانەی بەرەو حیزبی شیوعی‌یان بردم.

غەنی خەمماس بەغدایی بوو، تالب دنهاش لە عانەوە هاتبوو. هەموو بە شیوعی‌یان دەزانن، بەڵام (حەسەن توفیق)ی عانەیی هەر لای ئێمە دانی پێدا دەنا. عەبدولهادی ساڵح لە موسەیەبەوە بەو بیرانەوە هاتبووە ئێرە. لە کوردیش کەمال خورشید حەوێزی لە کرێکاریی نەوت لە کەرکووك دەرکرابوو، باسی مانگرتنی گاورباغیی بۆ دەگێڕاینەوە. ساڵی پێشتر سالم دەبباغ‌و عەبد محەممەد تەهای سامەڕایی دەرکرابوون. ئێوارەیەك تالب‌و کەمال بانگیانکردم. ووتیان:

(ڕەوف)ی برای تالب لە عانەوەو (جەمال)ی برای کەمال لە کۆیەوە بە حەپسی هێنراون لە مەرکەزی پۆلیسی کەرخ حەپسن. چەند کەسی سلێمانیشیان لەگەڵە، هەواڵی تۆ دەپرسن. کە لەگەڵیان چووم دیم حەمە عەلی مەدهۆش‌و حەمە ساڵح دیلانن. حەمە ساڵح هێشتا پارتی بوو. هەردووکیان ڕاسپاردەیان بۆ سلێمانی هەبوو. بۆم جێبەجێ کردن.

کە هاتینەوە دەرێ، لە کەرخەوە تا ئەعزەمیە. تالب‌و کەمال باسی هاوکاریی پارتی‌و شیوعی‌یان دەکرد. بەڵام پەسەندیی شیوعی‌یان وا ئەدا کە کارکردن لەگەڵ ئەواندا شایانی منە.

ئەو کوردانەی لە کۆلێجی شەریعە بوون هەر کەمال لە ناویاندا شیوعی بوو، هەر من‌و عەبدولسەمەد محێدین لەناو پارتیدا ڕێکخرابووین، ئەوانیتر سۆزی کوردایەتی‌یان هەبوو، لایەنە ئاینی‌یەکەشیان پتەو بوو —نووری عەبدوڵڵا، ئیحسان عەبدلحەمید، عەبدولسەلام محەمەد ئەمین، عەبدوڕەحمان ڕەزا، شێخ ڕەزای کۆیی، ئیبراهیمی مەلا، محەمەدی مەخموور.

محەمەد ئەمین عوسمانیش هەروەك ئەوانبوو، بەڵام زۆر گوێی نەدەدایە نوێژکردن. ئەوەی دیاربوو لەناودا مەلا شوکر بوو. کە حیزبی نەبوو بەڵام زیاتر بیری شیوعی‌یانەی هەبوو، ئازاو جەربەزە بوو. تاقە کەس بوو لە فەقێیەتی‌یەوە هاتبێت‌و پێوەندیی بە نوێژو ڕۆژووەوە نەبێ.

ئەو ماوە کەمەی لەو کۆلێجە بووم کاری زۆر کردە سەر بیرو زانینم. لە سلێمانی هەر پارتی‌و شیوعی هەبوون. موناقەشەیان لەسەر ئەوە بوو کامیان مارکسیی ڕاستن. بەڵام لێرە یەکەمجار بوو گوێم لە موناقەشەی نێوان ئیخوان‌و قەومی‌یە عەرەبەکان بوو. کە ئەو دەمە زۆر ناکۆك بوون‌و زۆر لە یەك دوور بوون. بەڵام دیسان لە هەندێ چالاکیی سیاسیدا پێکەوە بوون.

ساڵم نەبردە سەر عەمیدی کۆلێج حاجی حەمدی بانگی کردم‌و ووتی: ئێرە جێگەی تۆ نی‌یە. بڕیاری دەرکردنت لە بەردەمی ئەنجومەنی کۆلێجدایە. خۆت

ڕێگەیەك بۆ وازهێنان بدۆزمەوە، ئەگینا لەوانەیە دەرکردنت گرتن‌و پارەی کەفالەت لێ سەندنیشی بەدووادا بێت. ئیتر من‌و پەناکەم (کاکە دوکتۆر رافید) و ڕاپۆرتێکی دوکتۆرێکی گەورە. کاك رافیدیش لەمەدا هەر لای وا نەبوو ئەرکی خزمایەتیی بەجێهێناوە، بەڵکو خۆی بە ڕزگارکەریشم دەزانی.

لە کتێبی "ئوستاد"دا هەندێ شتم گێڕاوەتەوە، هەرچەندە سیمای چیرۆکیان تێکەڵکراوە، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ یادداشتیش دەست دەدەن. هەر بۆ ئەوە باشن کە بیانکەم بە پاشکۆی ئەم گێڕانەوەیە. لەولاترەوە لە گۆڤارێکدا بەشێك لە یادداشتم بڵاوکردۆتەوە. کە دەبێ بیدەمە سەر ئەم باسەو پاشان دەست پێبکەمەوە.

لە ژمارەیەکی گۆڤاری (بیری نوێ)دا نووسیبووم

(نە لە لووتکەو سەرکردەیی ئەم ڕووداوانەداو نە لە کەنارو پەراوێزیشدا بووم. بەڵکو لەناو جەرگەیدا بووم)

..وەك ووتم بەو جۆرە پۆلی سێیەمی ناوەندیم تەواوکرد بەو چەشنەش چوومە کولیەی شەریعە. هەر لە سەرەتای ئەو چوونە کولیەیەدا دوو جۆرە پێوەندیی سیاسیم دەستپێکرد.

یەکەم: چونکە گرنگترەو پێوەندیی قووڵ‌و درێژی بە ژیانی لەمەودوامەوە هەیە پێش دەخرێت. ئەویش پێوەندیمە بە ماڵە خزمێکەوە کە بیروهۆش‌و بزووتنەوەمیان بەرەو حیزبی شیوعی دەبرد.

بەڵێ –ماڵی ئەدیب ئەفەندیی پورزای باوکم (ئەدیبی حاجی عارف مستو)- کە کوڕێك‌و کچەکانی لەقەبی بابانیشیان- بە پێی حیکایەتێك کە ئێستا شوێن باسی نییە دابوو بە خۆیان. هەرچەند سەد مەترێك لە کولیەکەوە دوور بوو (کە شوێن خوێندن‌و خواردن‌ونووستنمان بوو).

کاکە ئەدیب (کە هەموو خزمان وایان بانگ دەکرد) ئەفسەری کۆنی تورك‌و ئەفسەری پۆلیسی عیراق بوو. بەڵام منداڵەکانی هەر زۆر زوو بووبوونە

شیوعی. (حامید) کە حقووقی تەواوکردبوو. لە حیزبی (هیوا)وە بەرو (تەحرور) و شیوعی هاتبوو، برای دووەمی رافید (دوکتۆر رافید سوبحی ئەدیب)یشی بەرەو شیوعێتی هێنابوو. خوشکەکانیشی سەمیرە (دکتۆر سەمیرە ئەدیب) و (موبەجەل)یش هەر ئەوسەردەمە بەرەو شیوعێتی هاتبوون.

ئەو ساڵەی من چوومە شەریعەو چوومە میحرابی ماڵی ئەوان. ساڵی پاش راپەڕینی کانوونی ١٩٤٨ بوو کەفو کوڵ دامرکابۆوە. بەڵام خوێنگەرمیی تێکۆشەران‌و بەرێکوپێکی کشانەوە لە جێی خۆیبوو. هەر لەبەرئەوە کە لەو تەمەنەدا کۆمەڵی تێکۆشەرم لە هاتوچۆی رۆژانەی ماڵی ئەواندا ناسی. هێشتا تەوژمی راپەڕین تێکەڵ بە لێکدانەوەو ئەنالیزو باری تیۆری دەبوو. فوتەیبە (دوکتۆر فوتەیبەی شێخ نووری- کە لەمەودووا بوو بە هاوسەری سەمیرە) هەموو رۆژ دەهاتە ئەو ماڵە. ئەو سەرۆکی کۆنگرەی سیباعی فوتابیان‌و سەرۆکی یەکێتی فوتابیانی پزیشکی بوو. لەگەڵ (کاك رافیددا) لە پۆلێکدا یەکیانگرتبۆوە. (خەلووفی ئەمین زەکی) گیرابوو و تازە بەربوو بوو. هێشتا شانازیی بە رۆڵی قارەمانیی خۆیەوە دەکرد لە راپەڕینەکەدا. (تەها شێخ ئەحمەد) لە سوپادا مابوو یا نەمابوو رەخنەی لە حیزب دەگرت‌و ئەو دۆستانەی دەیانووت:

ئەفسەرەو گەورەیی دەوێت.

منێکی منداڵی حەز بە زانین‌و تێکۆشان کردنیش، بەرەو گوێگرتن‌و تێگەیشتن‌و فێربوونی ئەم هەموو باس‌و خواست‌و موناقەشانە دەهاتم. لەولاوە هاوەڵەکانی ناوەندیم کە دوورخرابوونەوە بۆ باقووبە سەریان دەدام‌و قسەیان بۆ دەکردم، (عوسمان موحەمەد سلیمان- شیوعی بوو). محەمەد کەریم فەتحوڵڵا- پارتی بوو و لە ناوەندیدا پێکەوە بووین. لەولاوە شەمال سائیب‌و فەرەیدون رەشید جەودەتی هاوەڵی سەرەتاییم هەردووکیان لە (سانەویی ئەعزەمیە) بوون‌و هەردووکیان لە حیزبی شیوعی دابوون، یالەوەوە نزیکبوون.

ئەمە لایەکی ڕێنومام بوو. لایەکەی تر کە دووەمە:

هەر هەفتەیەك بوو هاتبوومە بەغدا برایەکی قوتابیی خانەی مامۆستایانی سەرەتایی (دار المعلمين الابتدائية) کە لە بەغدا بوو هاتە لامو تێی‌گەیاندم کە (پارتی) ناردوویەتی‌و من لەگەڵ قوتابیی کولیەی شەریعە کاك سەمەد محێدینی کۆییدا ئەندامی شانەیەکین‌و ئەو ڕێکخەرمانە.

ئەو برایە کەمال ڕەشید حەوێزی بوو. کە لە مەودووا بوو بە شیوعی‌و ساڵی ١٩٦٣ لە شاری کۆیەدا شەهید کرا.

ئەم دەمەش لەو تەمەنەی ئێمەدا (با من بچووکترین قوتابیی کولیەکەش بووبم) باس‌و خواسی هەمووومان زۆربەی هەر سیاسەت بوو. قوتابیی کورد لەوێ زۆربەیان بەلای کوردایەتیدا دەچوون- برایان: نووری عەبدوڵلا (کە برا گەورەمانبوو) عەبدو سەلام محەمەد ئەمین، عەبدوڕەحمان ڕەزا-ئیبراهیمی مەلا محەمەد تەنانەت کاك ئیحسان عەبدولحەمید لەگەڵ ڕێبازە ئیسلامی‌یەکەی ئەو سەردەمەشیدا هەر زۆرتر باسی کوردایەتیی دەکرد. کاك شوکر مستەفاو محەمەد ئەمین عوسمان هەردوو لایەنە فکرێکەیان لا دیاربوو. بەڵام کەمال خورشید حەوێزی کە کرێکاری نەوت بووبوو و بەشداری مانگرتنی گاورباغی بوو –بە بیرو بە گورجوگۆڵی شیوعیانە ڕەفتاری دەکرد. لە عەرەبەکانیشدا چەند کەسێك بە شیوعی ناسرابوون، بەڵام نازانم پێوەندیی حیزبیان چەند بوو. هەندێ موسڵمانی بیرکراوەش هەبوون.. سەیر ئەوە بوو ئەو سەردەمەو لە پاش ڕاپەڕینی کانوونەوە پێوەندیی نێوان شیوعی‌یەکان‌و قەومی‌یە عەرەبەکان (کە ئەودەمە سەر بە حیزبی ئیستقلال بوون‌و بەعس لە عیراقدا نەبوو) باش نەبوو، کەچی تیژیی کۆمەڵەی (اخوان المسلمين) کە قورسایی‌یان لەناو کولیەکەدا هەبوو شیوعی‌و قەومیی عەرەب‌و کوردی سەر بە کوردایەتی نزیك خستبۆوە. لەبەرئەوە هەر هەمووان لەو خۆپیشاندانانەی ئەعزەمیەدا کە بۆ فەلەستین کرا بەشداربووین‌و لە بەیەکدادانی لای پۆستەی ئەعزمیە لە نێوان

پۆلیس‌و خۆپیشاندەراندا کاك شوکر نەوت‌و پەڕۆی پەیدا کردو ئوتۆمبیلی چەکداری پۆلیسی سووتاند.

کێشەی بیرو پێوەندی لەناو ئەو دوو لایەنەدا دەیانهێنام‌و دەیانبردم. تا مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٤٩ لەدەست پێکردنی یادی راپەڕینی کانووندا ڕیزە خۆپیشاندانێك دەستی پێکرد. هەر لایەنی کاری شۆڕشگێڕیەیانە بەرەو بەشداریی بردم. ئەوەندەم گوێنەدەدایە ئەو موناقەشەیەی پارتی کە ئەو چەشنە خۆپیاشندانەیان لا ڕاست نەبوو. بەڵێ- ئەو ڕابەریەی بە ڕێکەوت بووبوو بە مەرکەزی حیزبی شیوعی (ساسۆن دەلال —رفیق چالاك- سەبری عەبدولکەریم) لە چەند ڕۆژێکدا بەم چەشنە خۆپیشاندانانە سەدان تێکۆشەریان ناردە بەندیخانەو زیانی ئەم چەشنە شۆڕشگێڕێتیەیەی ئەمان لە زیانی خیانەتی مالیك سێف‌و خەڵکی زۆر تەسلیم کردنی زیاتر بوو. بەڵام بۆ کەسێکی ١٤-١٥ ساڵی وەك من، لە سلێمانیەوە هاتوو. هەر هاوارو دەنگ‌و بەیەکدادان هەستی بەرەبەرکانی‌و ئازایەتیی لا دەجووڵاندم.

ڕەفیق چالاك چووە سەر شوێنێکی بەرزو بە (بۆری)یەك هاواری دەکرد (پێشەوە —لای چەپ- لای ڕاست- پاشەوە) یا (المقدمة- الميسرة- الميمنة- المؤخرة) هەموو شمان ٢٠٠-٣٠٠ کەس دەبووین- کە لەو بەرزیە هاتە خوارەوەو منی بچووکی ئاسیاوی دی بۆریەکەی دایە دەستم‌و ووتی: دووام کەوە. ئیتر کە بە کۆڵانەکانی (راس القرية)دا بڵاوبووینەوە، من بوومە بۆریە هەڵگری سەرکردەی خۆپیشاندانی ڕۆژی ١٩٤٩/١/٢١- کە زوو زوو سەردەکەوت‌و بۆریەکەی وەردەگرت‌و کە دەهاتە خوارەوە دەیدایەوە دەستم. پاش چوار ساڵ چالاك لە کاتی گرتنێکمدا ووتی من بۆری یەکەم چاك لە بیرە. بەڵام هیچم نەوتووەو پارمەتیت ئەدەم.

(لە بەشدارانی خۆپیشاندانەکە کاك ئەکرەمی عیزەت ئەجیبم لە بیرە)

ئەنجامی بەشداریی ئەو خۆپیشاندانە تووڕەبوونی پارتی بوو لێم، بۆ منیش بوو بە بیانووی دابڕان. ئیتر چاوەڕێی کاری تر بووم بۆ حیزبی شیوعی.

-شوباتی ١٩٤٩ هات لەسەر پیپلیکەی کولیەوە دەهاتمە خوارەوە خزام پشتم ئازاری گەیشت بردمیانە نەخۆشخانەی مەجیدیەیە (پادشایی پاشان کۆماری). لەوێ کەوتبووم کە ئێوارەی ١٣ی شوبات سەمیرە هاتە لام و ووتی ئەڵێن سبەینێ هاورێ فەهدو چەند هاورێی تر دەکەن بە دارا. بۆ سبەینێ بەیانی زوو ئیشکەرێکی نەخۆشخانە هات و دەم بە ئازارەوە ووتی. لە بابولوعەزەم یەکێك کراوە بە دارا. نەخۆش دەم پڕ لە پرس، هەندێك چاوپڕ لە فرمێسك کۆبوونەوەو منی لە هەمووان بچووکتر یان بۆ سۆراخ ناردە بابولوعەزەم.

دیمەنی -هاورێ حسین محەمەد شەبیبی- بەسەر سێدارەوە مەشخەڵێکی لە دڵمدا داگیرساند کە هەرگیز ناکوژێتەوە. هاتمەوەو هەواڵم گەیاند چاوەڕێی دوکتۆرم کردو کەوتمە پاڕانەوە بۆ چوونە دەرەوە. بەڵێ ئیزنی دام و چوومەوە کولیە زەکی بەسیم هەر لە گۆڕستانەکەی تەنیشتمانەوە نێژرابوو. بڕیاری خۆم دا. (ئەم لاپەڕەیەی ژیانم لە نووسینێکی چیرۆك ئامێزدا تۆمار کردووە- لە نامیلکەی (ڕازی دووری)دا بە ناونیشانی تۆو چرۆ بڵاوکراوەتەوەو بە عەرەبیش ساڵی ١٩٦٤ چەند جار بە ناوی (نهایة وبدایة) وە لە ڕادیۆی دەنگی گەلی عیراقدا بڵاوکرایەوە.

شەو چوومەوە ماڵی کاکە ئەدیب. هەموو کش و مات بوون. کاك حامید نەبێت دەکەوتە قسەو دەیووت: ئێمە نامرین. شەو بە تەنیا لە ژوورێکدا نووستبووم. نیوەشەو لە پەنجەرەکەیاندا ڕاپەڕیم. تارمایی موبەجەل دیاربوو. پەنجەرەم کردەوە. بە بێدەنگ دەستی هێناو (لوولە)یەکی خستە ناو دەستمەوە. زانیم بڵاوکراوەیە- زوو پێش نوێژی بەیانی چوومە دەرەوە. بیانووی نوێژی بەیانیم لەلا بوو. گەیشتمە کولیە، ئەو دەمە بو کە قوتابییەکان بۆ نوێژی بەیانی چووبوونە مزگەوتەکەی تەنیشتمان. ئەو بڵاوکراوەیەم بە ژوورو داڵاندا بڵاوکردەوە. پەیامی حیزب بوو دەربارەی بەداراکردنی هاورێیان (فەهد- شبیبی- بەسیم) بەم جۆرە یەکەم کارو هەنگاوم لە ڕێبازی نوێدا تۆمارکرد.

کۆمەڵێك جموجوڵی جیاواز خستینییە ژێر چاودێری‌و لێپرسینەوە. ڕۆژێك عەمید، ڕۆژێك بەڕێوەبەری بەشی ناوخۆ دەیاننارد بە دووامانـدا. نەگبەتیش لەوەدا بوو کە چاودێری‌و بەگژداچوونی قوتابی‌یە کۆنەپەرستەکانی هاوەڵمان زیاتر ئازاریان دەداین.

هەموو ئەمانە وەڕسیانکردم. لەسەر یەکدوو موناقەشە درابووم بە "ئەنجومەنی کولیە" ترسی دەرکردن‌و پارەی کەفالەت لێ سەندنەکەم لێنیشتبوو. زۆر ڕازی دڵم دەبردە لای کاك ڕافید، ئەو لە پاڵ ئامۆژگاریی کۆمەڵایەتیدا. یەکەم دەرسی مەتریالیزمی پێ ووتم.. لەم کۆسپەدا فریام کەوت. ئامۆژگاریی ئەو ئەوە بوو کە هەر دەست لەو چەشنە خوێندنە هەڵگرم‌و بچمەوە سلێمانی‌و دوا ناوەندی تەواو بکەم، باوکیشم‌و کولیەش لەسەر ئەوە بوون. بەڵێ ڕاپۆرتێکی دوکتۆری بۆ پەیداکردم، کە ئەو چەشنە خوێندن‌و ڕێبازە نیمچە سەربازی‌یە بۆ کەسێك دەست نادات کە لە تەمەنی منـدا بێت.

بەو چەشنە. لاپەڕەیەکی تازەی ژیانم هەڵدایەوە، بە بیرێکی تازەوە، بە تەمای پێوەندی‌یەکی تازە ڕوومکردەوە سلێمانیی خۆشەویستم..

چووەمەوە سلێمانی- پاش نیوەی ساڵی ١٩٤٩ بوو، دیاربوو بۆ ئەو ساڵە لە قوتابخانەی ڕۆژ وەرنەدەگیرامەوە. چوومە شەو، بەڕێوەبەر مامۆستا سلێمان مەللاح بوو، ووتی: نمرەکانی نیوەی ساڵت لەسەر تافیکردنەوەکەی کولیەی شەریعە بۆ حساب دەکەم، هەفتەیەك دەوامم کرد، دووایی بەڕێوەبەر ناردی بە دووامدا ووتی: دەرسی هاوبەش لە نێوان ئێرەو ئەوێدا هەر (عەرەبی)یە، کە (نەحو) و (ئینشا)ت خوێندوە. هەرچەندە هەستم کرد، پەشیمان بوونەوەکەی هۆی سیاسیی هەیە، بەڵام قسەکەشی ڕاست بوو. ئێمە لە (شەریعە)، شێخ عەبدولقادری خەتیب فیقهی حەنەفیی پێ ووتبووین، حاجی حەمدی (عیلمی کەلام) بە ڕێبازی ئەشعەریدا، مامۆستایەکی میسری محەمەد ئەحمەد مووسا تەجویدی قورئان. مامۆستایەکی گەورەی میسری بەدر موتەوەلی

عەبدولباسیت دەرسێکی گشتیی لە بارەی ئیسلامەوە پێ دەووتین. لە (نەحو)دا (شەرحی ئیبن عەقیل)مان لەسەر ئەلفیەی ئیبن مالیك دەخوێند کە مامۆستا محەمەد سەعید عەبدورەحمان. -باوکی ئەفسەری لەمەودووای شۆڕشی تەمووز خەلیل سەعید) پێی دەووتین. هەموو ئەمانە زوور پلەی تێگەیشتنی دەرچووی پۆلی سێیەمی ناوەندی بوون. مامۆستا مەحموود یوسف -بە ئەسڵ میسری- بناغەی ئینشانووسینی بە شێوەیەکی زانستیو ئەدەبیانە فێرکردین.

ماوەکە کەم بوو، بەڵام من سوودێکی باشم بۆ بناغەی فێربوونی لەمەودووام دامەزراندن بینی. هەر لەوێوە چێژی بە عەرەبی نووسینم وەرگرت. لەوێ یەکەم ووتارم لە ڕۆژنامەیەکی عەرەبیەدا بلاْکردەوە- کە لە جێی یەکیترا باسم کردووە.

ئەو پاش نیوەی ساڵە بێکار بووم، بەڵام هەر لە (شەریعە)وە دەستدانە لەبەرکردنی ئەلفیەی ئیبن مالك چێژی خوێندنی دامێ. باوکم زۆری حەز دەکرد، ئەو کوڕە مەلایانەی خوێندنیان تەواو نەکردبوو کە باوکیان مردبوون، خرابوونە جێی باوکیان بکات بە مەلا. واتە لە کاتێکدا لە مزگەوتەکەی خۆیان پێش نوێژی دەکەن، یا بەیانیان یا عەسر بێن لای ئەم دەرس بخوێنن. منیش با تەمەنیشمان جیا بووبێت لەگەڵ هەندێك لەواندا کەوتمە خوێندن. یا بە واتەی مەلایان "سەماع- یا گوێگرتن". لەگەڵ شێخ ڕەوف شێخ سەعیدی تەکیەو شێخ محەمەدی شێخ خالیددا بەشێك لە شەرحی (سیوطی)م لەسەر ئەلفیەو "ئیساغۆجی"م لە مەنتیقدا خوێند.

هەر لەو کاتەدا من بە دووای حیزبدا دەگەڕامو دیاربوو حیزبیش بە دووای مندا دەگەڕا.

مەحموود ئەفەندی (مەحموود فەهیمی فەقێ محەمەدی هەمەوەند) زۆر دۆستی باوکم بوو. زۆرجار (کەماڵی لە سلێمانی نەدەما) و لە مۆرتکەی بازیانەوە دەهاتە سلێمانی. میوانی ئێمە دەبوو. سەرۆك عەشیرەت بوو، لە

حیزبی برایەتیو یەکێتیدا دەوری گەورەی هەبوو بوو. وا بزانم ئەو ماوەیەی مامۆستا ئەحمەد هەردی لە مۆرتکە مامۆستا بووبوو بەرەو حیزبی شیوعیی هێنابوو. بەڵام مەحموود ئەفەندی زۆر خوێندەوار بوو، شیعری جوانی هەبوو. لەناو حیزبی شیوعیدا پێش کەوت، لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٤٨دا بۆ پەرلەمان پاڵێوراوی شیوعییەکان بوو، لەناو شانەکانی حیزبی شیوعیدا دوو نووسینی ئەو کەرەسەی فێربوون بوون: (جوتیاری زەبوون) و (ڕاپۆرتێك لە بارەی زەوی لە بازیاندا).

گرتنو ئازار وازی پێ نەهێنا. بەڵام هەندێك هۆی تر ژیانو ئەنجامیی بەرەو کارەساتو تراژیدیا برد. (لە دەرفەتێکدا دوو ووشەی فراوانو ڕاست لە بارەیەوە دەنووسم).

مەحموود ئەفەندی زۆری پێخۆشبوو کە لە بەغداوە بەو بیرەوە هاتوومەوە کە لە حیزبی شیوعیدا کاربکەم. چەند ڕۆژی پێ نەچوو بردمییەو لاوەوە ووتی:

(سبەینێ سەعات ٢،٣٠ پاش نیوەڕۆ لەبەر دەرگای ئەودیو —دەرگا بچووکەکەی مزگەوتی گەورە دەوستیت. یەکێك دێت لێت دەپرسێك سەعات چەندە؟ دەڵێیت: خەڵکی ئەم شارە نیم).

بەمجۆرە لە نیسانی ١٩٤٩دا یەکەم پێوەندیو یەکەم ڕێکخەرمم لەنا حیزبی شیوعیدا دی.

کاك محەمەد ئەمین عەلی- کە برای فەرەجی شیرینو ئەوانبوو —هاتو یەکترمان ناسی. بێ ئەوەی من ناوی ئەو بزانم. ئیتر هەردوو ڕۆژ جارێك لەبەر دەرگای مزگەوتێکدا یەکترمان دەدی. هەفتەی جارێك کۆدەبووینەوە. یەکەم شانەی ئەو ڕێکیدەخست دوو کەس بووین، منو کاك حسین محەمەد- فەرمانبەر لە موتەسەریفییەت. ناسراو بە حسێنی لیمو. کەرەسەی کۆبوونەوە هەر خوێندنەوەی بڵاوکراوەکانی حیزب بوو.

پاش چەند هەفتە زانیم کە حیزب بووە بە دوو پارچەوە. ئێمە (بەلای ڕێکخەرەوە) بناغەی حیزبەکەین‌و ڕۆژنامەی (ئەستێرە- النجمة) دەردەکەین-کە بە دەست دەنووسرایەوە، چونکە هەموو چاپخانەکانی حیزب گیرابوون. دەستەکەیتر بە ناوی (الصراع)ەوە ڕۆژنامە دەردەکەن. هەردوولا بە ناوی حیزبی شیوعییەوە کاریان دەکرد، بەڵام خەڵك هەر بە ناوی ڕۆژنامەکەوە ناوی دەنان تاقمی (...)، ئەمە لە چەند جیابوونەوەی لەمەودووای حیزبی شیوعیشدا هەر وابوو.

جیاوازیی بیرو ئایدیۆلوژیەتی ئەوتۆ لە نێوان ئەو دوو تاقمەدا نەبوو. تەنیا یەك لە دووای یەك گرتنی سەرکردەییە دروستبۆوەکانی حیزب وایکردبوو کادری پێشکەوتوو و تێگەیشتوو نەمێنێ، هەندێ لاو، کە زوربەیان ئازاو بەجەرگبوون دەست بدەنە باڵی حیزبەکەو پاشماوەکانی دروست بکەنەوە. بۆ نموونە: ڕابەری (النجمة)- ئەکرەم یامولکی پۆلی پێنجەمی ناوەندیی تەواوکردبوو، تەمەنی هەر ٢٠ساڵ دەبوو، بەهائەدین نووری پۆلی سێیەمی ناوەندیی تەواوکردبوو و لە مزگەوت کەمێکی خوێندبوو، هەر لە نێوان ٢٠-٢٥ ساڵدا بوو، هەردووکیان لە سلێمانی بەولاوە هیچ شوێنێکیان نەدیبوو. ئەوەی وەك جیاوازی باسدەکرا، ئەوە بوو: (النجمة) ڕۆژنامەیەکی حیزبی شیوعیی سوریایان دیبوو- لە جیاتی باس (لە دیموکراتیەتی بۆرژوازی) هاتنە سەر کار، باس لە دیموکراتیەتی گەلی –شەعبی- کرابوو، ئیتر ئەوەیانکرد بە دروشم، لە (الصراع)دا وەڵام دەدرایەوە. کەچی هەر ئەمە لە پاش ٣-٤ ساڵ پێچەوانە بۆوە. کاك بەهادین لە (القاعدة) و پەیمانی (باسم)دا دیموکراتیی گەلی کردبوو بە دروشم‌و دەستەی (ئاڵای کارگەران- رایة الشغیلة) (عەزیز محەمەد-جەمال حەیدەری) دەیانووت: هاوڕێ فەهد لە دیموکراتیی بۆرژوازیی زیاتری نەووتووە.

ئەکرەم یامولکی تینی دابووە خۆی ڕەخنەی لە هاوڕێ فەهد دەگرت، بە لێپرسراوی دەزانی لە کاردانە دەست مالیك سەیف‌و یەهودا سدیقدا، کە کەسی

ئازا نەبوون‌و زوو تەپین (مالیك بە ئێجگاری بوو بە جاسووس، یەهودا هەڵوێستی کز بوو، بەڵام چونکە جولەکە بوو لە ١٩٤٩/٢/١٥دا ڕۆژێ پاش هاوڕێ فەهد بە دار کرا).

(الصراع) زۆر بە توندی وەڵامی (النجمة)ی ئەدایەوەو توخنی هاوڕێ فەهد کەوتنی بە تاوان دەزانی. کەچی هەر لەمەشدا چەند ساڵ دووای ئەوە هاوڕێ بەهادین لە (پەیمانی باسم)دا هەڵوێستی هاوڕێ فەهد بەرامبەر بە مەسەلەی کورد بە هەڵوێستی بۆرژوازییانەی هەلپەرست دادەنێ‌و (راية الشغيلة) بە بەرگرێ لە پێغەمبەران بەرگریان لە هاوڕێ فەهد دەکرد.

ناکۆکی‌یەکانیتر شەخسی‌و تانووت لە یەکتردان بوو. ئەوان باسی ئەکرەم‌و خەسرەو تۆفیقیان وەك کوڕە بۆرژوازی دەکرد (کە یەکەمیان ڕەنگە بە کوڕە هەژاریش بژمێررایە) و ئەوانیش شتی ناڕاستیان بۆ کاك بەهادین دروست دەکرد. لەناوهێنانی ئاشکرای کەسانی سەر بە هەر دوولا بردن سڵ نەدەکرا.

چەند هەفتەیەك لەو شانەیەدا مامەوە، ڕۆژێك مەحموود ئەفەندی هاتە شار، سکاڵای ئەوەمکرد کە تا ئێستا هیچ فێر نەبووم. چونکە من بە تاسەی فێربوونەوە هاتبوومە ناو حیزبی شیوعی‌یەوە. پاش چەند ڕۆژ ڕێکخەرەکەم پێی ووتم: دەچیتە ناو خەتی قوتابیان، ئەوە بۆ فێربوون‌و سەقافەت (ڕووناك بیری-ع) باشترە. دیسان بۆ دەرگای ئەو دیو واتە دەرگا بچووکەکەی مزگەوت. (نازانم بۆ: ئەو دەرگایەیان؟) بەڵام ئەمجارە مزگەوتی شێخ ئەوڵڵای هەولێری -کە بە مزگەوتی دوو دەرگا بەناوبانگ بوو. سەیر ئەوەیە لە سلێمانیی ئەوسا کە ٤٠ مزگەوتی تێدابوو زوربەیان دوو دەرگایان هەبوو کەچی هەر بەو مزگەوتە دەوترا دوو دەرگا. ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ کە دوو گەڕەك لەسەر ئەو مزگەوتە بوون‌و مزگەوتەکە بێجگە لە نوێژکەران سەرەڕێی خەڵك بوو. دەرگای ماڵی قازی (ئەحمەد موختار)ی هەولێریش لەسەر حەوشەی مزگەوتەکە بوو.

دەی.. چووم بۆ (مەوعید)مکە. ڕێکخەری نوێ، هاوەڵ و برادەری منداڵیشیم بوو، بەڵام هەر پرسیارە سەیرەکەی خۆی کردو وەڵامی سەیری بیستەوە

-کەی بانگی ئێوارە (شێوان) دەدات؟

-کە ڕۆژ لە گۆیژەوە هەڵات

کاك دارا تۆفیق ڕێکخەری تازەم بوو. پێوەندیم جارێ بە تەنیا پێوەی بوو. چەند هەفتەیەکی خایاند، ڕۆژێك هات بەیاننامەیەکی تازەی بۆ هێنام. هەر ناوونیشانی بەیاننامەکەی (النجمة)ی لەسەر بوو، (دەستی ئاسنین بەردەوامە لە ڕاماڵینی ئینتیهازیەت دا). بەڵام ئەگەر بەیانی پێشوو کاك ئەکرەم یامولکی بۆ دەرکردنی حەمید عوسمان (صابر) و بەهادین نووری بوو (باقر)، کە یەکەمیان گیراو لە پاش مالیك سەیفەوە یەکەم سەرکردە بوو ئازایانەو مەردانە خۆی بەرامبەر بە ئەشکەنجەیەك ڕاگرێت کە کرابوو بە ئەفسانە. ئەوا ئەمجارە دەستی ئاسنینەکە دەستی کەریمی سۆفی بوو. (سەعیدو وەلیدو ڕەشید)ی لە حیزب دەرئەکردو ناوی ڕۆژنامەکەی بە نیازی یەکگرتنەوەی حیزبەوە ناونا (یەکێتی- الاتحاد).

دەبوو ئەو چەپۆکەی لە حیزبی شیوعی درابوو، بە خنکاندنی پێنج لە سەرکردەکانی (فەهد- زەکی بەسیم (حازم) – حسێن محەمەد شەبیبی (صارم) – کە شێرانەو مەردانە چوونە سەر سێدارەو هەریەکە لە بەردەمی سێدارەکەدا ووشەیەك یا پەندێکی بەنرخی بەجێهێشت، هەروەها یەهودا سدیق و پاش ئەوان ساسۆن دەللال کە بە خوێندنی سروودی ئەنتەرناسیۆناڵە بە بەرچاوی خەڵکەوە چووە سەر سێدارە)، هەروەها بە گرتنی سەدان کادرو ئەندامی سەرکردەو ئەندام و دۆستانی حیزب. لە پاڵ ئەوەشدا بە ڕوخانی چەند سەرکردەی وەك مالیك سەیف و ڕەفیق چالاك و فوئاد بەهجەت و سەبری عەبدلکەریم.. هتد. دەبوو هەروەك ئەم چەپۆکانە کەسانی لاوی وەك کەریمی سۆفی و بەهادین نووریی پاڵ پێوەنا لەو کاتەدا شان بدەنە بەر حیزبەکە، یا

چەندین (مێرمنداڵ)ی وەك ئێمەی والێکرد یا تازە بێینە ناو حیزبەوە یا حیزب بەجێنەهێڵین. دەبوو ئەمە ببوایە هۆی ڕیزی پتەو دروستبوونو نهێنی نەدرکاندن، کەچی ناوی سەرکردەو ئەندامانی هەموو لا، قسە بۆ هەڵبەستن باو بوو، دیارە ئەمە هەمیشە لەو حیزبەداو لە شوێنیتردا هەر باو بووە، ئەمڕۆ لە سەدا سەد یەکین، سبەینێ لە سەدا سەدا جیاین. من ئەم بارەم لە دوو جیابوونەوەیتردا دی. کە ساڵی ۱۹۵۳ و ساڵی ۱۹٦۷ بوونو لەمەودووا باسیان دەکەم.

بە کورتی زۆری نەدەویست کە هەموو بزانین ڕەشید —ئەکرەم یامولکیو سەعید ناوی حیزبیی عومەر عەلی ئەمینەو غەفووری میرزا کەریمیش وەلیدە. هەروەك ناوی کەریمی سۆفیش ئاشکرا بوو.

کەریم لە خوێندنی ناوەندیدا هەرسێ ساڵەکە لەگەڵ ئێمە بوو. لە خوێندندا خراپ نەبوو، بەڵام وا دیاربوو زیرەکیو فێربوونەکەی دابوو بە لای کاری حیزبیو فێربوونی تیۆریدا. چونکە ئەو شتانەی دەینووسین لە نووسینی خوێندەوارێکی باشو کوردی زانێکی باش دەچوون. هەر ناوەندیی تەواوکردبوو کە خۆی شاردەوە.

کاك دارا پێی ووتم: من ئیتر وازدەهێنم، لەگەڵ (الاتحاد) و (الصراع) ئیش ناکەم، دیاربوو وازهێنانەکە پێوەندیی بە دەرکردنی ئەکرەمو وازهێنانی کاك خەسرەوەوە هەبوو. کە چەند ساڵی خایاند. هەروەها بە ئەمانەتەوە ووتی: من ناوتم داوە بە برادەران خۆیان دەتبینن. لە سلێمانی زوربەی ئەو کەسانەی بە شیوعی مابوونەوە هەر لەگەڵ (النجمة)دا بوونو بە ئوتوماتیکیش بوون بە (الاتحاد).

دووای چەند ڕۆژێك لە ڤوتابخانە کاك هیوا مستەفا بەهجەت کە لە منداڵیەوە هاوڕێ بووین بانگی کردمو نامەیەکی پێچراوەی دامێ بە ئیمزای (ئەبوو عەزیز)ەوە بوو، ئەم (ئەبوو)ە ناحەزە لەوساوە لای شیوعیەیە کوردەکان هەبوو.

مەوعیدێکی تازە –کەسێکی تازەهات، برایەکی بچووکی چوار-پێنج ساڵەیی لەگەڵ بوو. نامەیەکی لە پزووی دەرپێی براکەی دەرهێناو دایمێ. پێشی ووتم: ڕێکخەرەکەت خۆی شاردۆتەوە (ئەوسا بە مانەمان دەووت: مختفی)، من تەنیا موراسیل (نامەهێنەر)م.

هەردوو ڕۆژ جارێك نامەهێنەرم لە مەوعیددا دەدی کە نەدەبوو یەك چرکە لێی دووا بکەوین. بە زۆر قەناعەتم پێکرد کە مەوعیدەکان لە مزگەوتەکەی خۆماندا (مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵ) بێت بۆ من باشترەو بێگومانە. نامەکانی ئەبوو عەزیز نیوەی دروشمی شۆڕشگێڕانە بوو بە عەرەبی، واتە شتی لەبەرکراو بوو، لە کۆتاییدا بە کوردی (هەواڵێك، فەرمانێك)ی حیزبیی تێدابوو. لەو دروشمانەی زۆری دەنووسینەوەو لە بیرم ماون.

"لا حركة ثورية بدون نظرية ثورية

الشيوعية اقوى من الموت واعلى من المشانق- فهد

من يدافع عن الانتهازية سيقع حتما في مستنقع الانتهازية... الخ".

پاش دوو هەفتە، پەیامهێنەر کاتێکی دانا کە شەو لە گەڕەکی مەڵکەندی "ئەبوو عەزیز" ببینم. فەرمانیش وابوو. بە کۆڵانی تاریکدا بچم. کراس و شەرواڵێك لەبەر بکەم چاکەتێکی بەسەرداو کڵاوێك لەسەر بکەم. گوایە ئەمە خۆشاردنەوەیە. لە کاتێکدا بەو جۆرە بینینم لە شاردنەوەو لەوە دەچوو کارێکم هەبێت.

ساڵی ١٩٥٥ کە ماوەیەك بە خۆپیشاندانی کتوپڕی شەوو ڕۆژەوە خەریکبووین. بە (دەماغ) کردنەوە دەچووینە ناو بازاڕ بۆ (هوتاف) کێشان. بە کاك عەلی فەوتاومان ووت: تۆش دەماغ بکە. کاك عەلی کە قسەخۆشەو خۆشترینی قسەکانی ئەوانە بوون کە خۆی بۆ خۆیی دروست دەکرد. ووتی:

ئەمە ئەشارمەوە (چاوی)، ئەمە دیارە. ئەمە ئەشارمەوە (لووتی). ئەمە دیارە (لێوی). کە کاك عەلی ئەمانەی لە ڕووداوێکدا گوللە شێواندبووی کە هەر

زۆرمان لێکرد ووتی: کاکە منیش ڕۆژێك وەك ئێوەمکرد منداڵان دووام کەوتن: ئای کاك عەلی بۆ خۆت وا لێکردووە. (ڕەنگە ئەمە هەر گاڵتە بێت خۆی بۆ خۆی درستکردبێت، بەڵام ئەوەی من ڕاستبوو، چونکە بە ڕاستی تەمەنمان کەم بوو. خەریکی کارێکی گەورە بووین).

پێش ئەوەی بگەمە لای کاکی ڕێکخەر ئەم قسەیە دەگێڕمەوە:

لەم ساڵانەی دواییدا —پاش نزیکەی پەنجا ساڵ، برادەرێکم دی، پاش چاكو چۆنییەکی گەرم پرسیی: دەمناسیتەوە ووتم: شێوەت ئەکەم. ووتی: بچووکترین پەیامهێنەر لە حیزبی شیوعیدا کە دیبێتت، یەکسەر ووتم: ڕەزا نەبیت، ووتی: بەڵێ، ئەوەم، تومەز کاك (ڕەزای کارەباچی) کە لە لیستەی حیزبی شیوعیدا خۆی پاڵاوتبوو ئەو منداڵە بچووکە بوو کە لەگەڵ کاك (سابیر)ی ڕەحمەتیی برایدا ئەهاتو نامەکانی لە پزووی دەرپێکەیدا دەشاردەوە.

گەیشتمە ماڵکەندی، وەك بڕیار بوو بەو جۆرە لە دەرگام دا، برامە ژوورەوە. ژوورێکی چۆڵ، حەسیرێك داخرابوو، کوپەیەك دانرابوو (نازانم هەر خۆی وابوو یا دیکۆر بوو)، هاوڕێ هات: ئەویش شەرواڵێكو کراسێکی لەبەردا بوو، مشکییەکی کۆنی بەستبوو، ئەختێ قوڕی لێدرابوو. وەك ئەوەی بە ڕۆژ کرێکاریی کردبێ. تەوقەیەکی لەگەڵ کردم، پلیتەی چراکەی بەرزکردەوە، تەماشامکرد کاك محەمەد ساڵح سەعیدە کە فرمانی گرتنی لەسەر بوو و خۆی شاردبۆوە. دیاربوو ئەویش نەیزانیبوو ئەو هاوڕێیەی دێت منمو یەکتر باش دەناسین (لەبەر ئەوە خۆی والێکردبوو).

زۆر باسی وولاتمانکرد، زەبروزەنگێك کە باڵی بەسەردا کێشابوو. حیزبو دوو کەرتبوون. بەرامبەر بە (الصراع) خۆی لە قسەی ناشیرینو ناڕەوا بە دوور گرتو وای نیشان دا کە لەسەر بناغەیەکی پتەوو (مەبدەئی) ئامادەی یەکگرتنەوەین، ئەوانیش ئێمە، پاش —النجمة- بە شیوعی دەزانن. ئەرکی من ئەوە بوو ئەگەر بتوانم بۆ ئەو ڕۆژنامانە بنووسم کە دەرئەچوون: "یەکێتی،

الاتحاد، دەنگی قوتابیان، دەنگی فەللاح، دەنگی کرێکار.. هتد" خەریکی وەرگێران بم، کاری گەورەتر نووسنیەوە بوو. چونکە چاپو تایپ نەمابوو، هەموویمان لەسەر کاغەزی تەنك، بە کاربۆن خستنە ژێری دەنووسیەوە.

ساڵی (١٩٥٢) کە لە بەندیخانەی بەغدا یادی ئەو ساڵانەو نووسنیەوەمان دەکرد هۆگر گۆران دەیووت: "دە ساڵیتر ئیفلیج ببم هەر هی نووسینەوەی کتێبی – لیۆنتیفـە". کتێبی لیۆنتیف کتێبێکی قەوارە گەورەی "ئابووریی سیاسی" بوو، راشید بەڕاوی –کۆنە باڵیۆزی میسر لە مۆسکۆ نازانم لە چ زمانێکەوە کردبووی بە عەرەبی. ئەوە لەو شتانە بوو کە دەبوو بیانخوێنینەوە. بەڵام نازانم لەو تەمەنەدا چەندی تێگەیشتبووین. ئێمە هەر ڕۆژنامەمان دەنووسیەوە، هۆگری بە سزمان نووسینەوەی ئەو کتێبە گەورەیەی درابوو بە سەردا.

* *

ساڵی ١٩٤٨-١٩٤٩ تەواوبوو. بۆ ساڵی داهاتوو ١٩٤٩-١٩٥٠ بوو چووبوومەوە قوتابخانە. ئەو ساڵە لە سلێمانی پۆلی چوارەمی (ئەدەبی) نەمابوو، ناچار چوومە (عیلمی). نە خۆم زۆرم حەزلێدەکردو ئەو کارە حیزبییەش ڕێگەی زۆر پێوەخەریکبوونیان نەئەدامێ. ڕەنگە بڵێم پاش خوێندن ئەوەندە. سەیری کتێبم نەدەکرد. لە تاقیکردنەوەی مانگەکانی پێش نیوەی ساڵدا خراپبووم. ڕۆژێك بانگیانکردم بۆ لای بەڕێوەبەر. تەماشا دەکەم لە ژووری بەڕێوەبەر قومیسەری شوعبەی خاصە- ئەمن دانیشتووە، ئەو حسابی نەرمەم لەگەڵ دەکاتو دەڵێت: تۆ بە قوتابییەکی زیرەك ناسراوی. دیارە زۆر خەریکی کاری تریت بۆیە لە دەرسا خراپیت. وەڵامم حازر بوو: نەخێر هیچ کاریترم نییە، نە وەرزشو نە تەمسیل (کابرا پێدەکەنی)، بەڵام من ناتوانم لە بەشی عیلمیدا بخوێنم. بۆچی بەشی ئەدەبیتان داخست.

ناردیان بە دووای باوکمدا کە سەرێك لە قوتابخانە بدات. بۆ سبەینێ کە هاتە لای بەڕێوەبەرو حاڵی منیان تێگەیاند. من قسەی خۆم کردەوە. باوکم

ووتی: شەو پاش کارەبا کوژانەوەش (کە ئەو دەمە نیوەشەو دەکوژایەوە)، سەر بە سەر چرادا شۆڕدەکاتەوەو خەریکی خوێندن (سەعی) کردنە. دیارە باوکم نەیدەزانی کە لەو کاتەدا خەریکی نووسینەوە بوم.

لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارم دا کە بەو خوێندنەشەوە هەر خەریك بم. لام شەرمبوو قوتابیی تێکۆرشەر بە تەمەڵ بناسرێت.

دەرسی عەرەبیم بە (قەاعیدو بەلاغەوە کە بەشی مەعانیی لەو پۆلەدا دخوێندرا لای باوکم، لە پاڵ سیوطیدا خوێند، باوکم نامیلکەیەکی ماتیماتیك – یا ریاضیات-ی بەهادینی عامیلیی پێ ووتم کە بۆ دەرسی جەبرو موسەلەسات – مثلثات- زۆر سوودی هەبوو)، مامۆستای جەبرو موسەلەساتمان –جەرجیس ئیبراهیم حمێکا، کە خەڵکی ئەلقۆش بوو، مامۆستای چاكو پیاوی چاك بوو زۆری لا سەیر بوو کە قوتابییەکی هیچ نەزان لە فەسڵی دووەمدا وای لێ بێ هەندێك شت بزانێ کە لە کتێبی قوتابخانەدا نییە. پاش پرسینو وەڵامێك ئەوی مەسیحی بە شەوقەوە هات لە مزگەوت سەری باوکمی دا. بە هەناسەبڕکێش بێت دەرچووم‌و چوومە پۆلی پێنجەمی عیلمی.

پۆلەکەمان زۆر سەیر بوو، من لە کیس چوونی ساڵی پێشوو لە شەریعە وایکردبوو هەواڵەکانی ناوەندیم بەجێیان هێشتم: دارا تۆفیق، بەدیع قوتب، مەحموودی لەیلێ، جەمال نەبەز، جوامێر مەجید.. هتد لە پۆلی پێنجەم بوون، ئەم پۆلی چوارەمە بۆ من تازە بوو. هەرچەندە زوربەیانم دەناسی، بەڵام یەکەمجار بو لە پۆلێکدا پێکەوە بین.

ساڵ ساڵی زەبروزەنگ بوو. هێشتا عورق مابوو، لە پۆلەکەدا کە چاوم دەگێڕا دیاربوو تەنیا عەلی مەحموود فەرەج‌و کەمال عەبدولکەریم (فوئاد) سەریان لە سیاسەت دەخورا بەلای شیوعێتیداو جەمال شاڵی بەلای پارتیدا، ئیتر ئەوانیتر کە لە ساڵی ڕاپەڕیندا خوێن گەرمبوون‌و لەکاردا بوون وازیان هێنابوو.

پۆلەکەمان زۆر سەیر بوو، لە خۆیەوە سێ ڕیزی تێدا دیار بوو. تاقمێك هەر خەریکی خوێندن بوون، لە کاتی پشوودانیشدا مەسەلەی جەبریان لێك دەدایەوە، بە تەمابوون لە تاقیکردنەوەی سەری ساڵدا لێیان ببوورن (مەعفوو بن)، لە بەکەلۆریای پۆلی پێنجەمیشدا نمرەی چوونە دەرەوەی وولات (بعثة) بهێنن. لە ڕووی سیاسەتەوە پیاوی چاکبوون، هەستی پاکیان هەبوو، بەڵام خەریکبوون بە سیاسەتەوە یا باسکردنی لە لایان —بۆ قوتابی پەشم بوو- لەمانە: ئەکرەمی حاجی ڕەشیدی وەسمان چاوەش- کە خزمم بوو، محەمەدی حاجی عەبدوڵلای شاڵی، عومەر ڕەمزی مەعرووف (کاکە عەمە) لە (بعثە) وەرگیران‌و چوون بۆ لەندەن، هەر لەناو ئەواندا فازیل فەرەج‌و جەمال جەلال قەرەداخی‌و محەمەد ئەمین حەسەنی کاکەییم بیرە یەکەمیان لە بەکەلوریادا بە قوتابی‌یەکی دەووتەوە، سەرپەرشتکەری تاقیکردنەوەکە نەتەوەپەرستی عەرەب بوو لە بەغداوە هاتبوو کردی‌یە دەرەوەو ئەو ساڵەی لە کیس چوو. پاشان چووە کۆلێجی پزیشکی، جەمال لە (بعثە) وەرگیرا بەڵام باوکی چوو بە قیناو دەیووت: منداڵی وا چۆن بە تەنیا دەچێ بۆ لەندەن، هەمووومان زۆر بە ڕەقی لەگەڵ باوکیدا دووایین، سوودی نەبوو. لەگەڵ ئەوو حەمە ئەمیندا لە خانەی بەرزی مامۆستایان (دار المعلمين العالية) یەکمانگرتەوە.

کەمال عەبدولکەریم (فوئاد) لە خوێندندا باشبوو دەتوانین لە ڕیزی ئەو برایانەی دانێین، کەچی بە گاڵتەپێکردنەوە ئەوانەی ناو نابوو (ئەنشتاینەکان)، تاقمی دووەم قوتابیی ئاسایی‌و مام ناوەندی‌یەکان بوون. دەستەی سێیەم تەمەڵەکانبوون کە کەمبوون.

لە ڕووی سیاسیشەوە فازیل فەرەج لە کۆلێجی پزیشکیدا بوو بە شیوعی‌یەکی ئازاو فیداکار لە پۆلی سێیەمدا دەرکرا، تا شۆڕشی تەمووز خۆی شاردەوەو چوو بۆ مۆسکۆ بوو بە پسپۆڕی زمانی ڕووسی‌و پزیشکیی نەخوێند. محەمەد ئەمین حەسەنیش پاش تەواوکردنی کۆلێج تا کۆچی دووایی (٢٠٠١)

هەر لە حیزبی شیوعیو سەر بە شیوعێتی بوو. بۆ جەمال نازانم لە حیزبدا بووبێ. بەڵام هەمیشە ڕێبازی نیشتمانیو چەپی هەبوو، کە لەودووا ئێمەمانان دەگیراین لەناو هاوەڵەکانماندا زۆر پیاوانە بەرگریی لێ دەکردین.

بۆ (کاکە عەمە)ش ساڵی ١٩٥٧ لە شام بووم، ڕۆژێك کابرایەکی (ئەمنی عامە) هاتە ئەو چایخانەیەی لێی دادەنیشتین خۆی بە ناوی (تەیسیرتیبە- تیسیر طیبة)وە پێشکەشکردو وتی: من کوردمو کاتی خۆی لە گەڕەکی کودان لە یانەی کوردستان عوسمان بەگ (مەبەسی عوسمان سەبری بوو) دەرسی کوردیی پێ ووتووم. نامەیەکت بۆ هاتووە بە کوردی داویانە بە من وەریگێڕم، لێی تێناگەم، بۆم وەرگێڕە.

سڵم زۆر لە کابرا کرد، لەبەر ئەوە نامەکەم خستە قاڵبی نامەیەکی ئاساییەوە، لە پڕ لەلای ئەوە وەستام کە بە عەرەبی نووسرابوو (مؤتمر سیاسي كردي عام)، یەکسەر بۆم هاتو وتم: (هەندێك داوای بەستنی ئەو کۆنگرەیە دەکەن. ئێمە پێوەندیمان لەگەڵیاندا نییە). کابرا چەند پرسیارێکی لە بارەی خاوەن نامەوە لێکردمو بۆچ نامە بۆ من دەنووسێت ووتم: لە خوێندندا لەگەڵم بووە، دەمێکە ئاگای لێم نییە، ئێستا بیستوویەتی لە دەرەوەم سۆزی غەریبی گرتوویەتی. ووتی: بۆ باسی کۆنگرە دەکات. ووتم: ئەی باسی چی بکات. سیاسەت لە هەردوولا، (بەریتانیاو سووریا ئازادە) وا باس دەکات، منیش باسی ئێرەی بۆ دەکەم.

نامەکە بە ناوی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردەوە بوو کاك عومەر ڕەمزی ئیمزای کردبوو. بەڵام ئەوکاتە لە سووریا زۆر شت ئازاد بو باسی کورد کردنو بە کوردی نووسین نەبێ.

پێم خۆشبوو ئەوا یەکێکیتریش لە ئەمنشتاینەکان دەستی داوەتە سیاسەتو کوردایەتیش. بۆ کابرای (ئەمن)یش لە عوسمان سەبریم پرسی: ووتی چاکت کردووە، سڵ کردنەکەت لە جێی خۆیدا بووە. ئەو کابرایە بە ڕاستی لە بنەماڵەیەکی باشە کە لەقەبی (طیبة) دێنن، بەڵام خۆی نا.

لەم لادانەوە بێمەوە سەر ئەم پۆلی چوارەمی عیلمی‌یەمان (١٩٤٩-١٩٥٠) (دەنووسم عیلمی‌و لێرەدا زانستی نانووسم، چونکە لە سلێمانی- زانستی بەو قوتابخانەی‌شەوە دەووترا کە بۆ گەورە بوو و پیرەمێرد سەرپەرشتیی دەکرد. پاش نەمانی ئەویش تا ساڵی ١٩٥٦ خەڵک بە قوتابخانەی شەوەکەی فەیسەلیەیان دەووت: زانستی).

لە قوتابیانی ئەو پۆلە- نووری ئەمین باڵدارو جەمال ئیبراهیمم لەبیرە. ئەوەش کە لە بیرمە ئەوەیە کە هەر لەو پۆلەدا قوتابی‌یەکی زیرەکی عەرەبی فەلەستینیمان لەگەڵبوو، باوکی (کەمال ریماوی) مامۆستای عەرەبی بوو، ئەم (ریاز- ریاض)ەی کوڕی لە ڕیزی ئەنشتاینەکانبوو، کوردی‌یەکی زۆر باش فێربووبوو، دووایی بۆ خوێندن چووە قاهیرەو لەوێوە نامەی بۆ دەناردم. جارێك نووسیبووی ویستم گۆڤاری (الکاتب)ی میسریت بۆ بنێرم پۆستە وەرینەگرت. (الکاتب- گۆڤارێکی چەپبوو). ریاز زوو کۆچی کرد.

قوتابی‌یەکی مەسیحیشمان لەگەڵبوو ناوی میساك بوو نازانم چیی لێ بەسەرهات. بەڵام بۆ سەیری (زەمان‌و مەکان) دەڵێم: قوتابی‌یەکی جوولەکەی خەڵکی هەڵەبجەمان لەگەڵبوو ناوی (حسقێل) بوو، پێشتر لە هەڵەبجە لەسەر شیوعێتی گیرابوو، کوڕێکی کراوەو باشبوو. من ئەمەو ئەوم هەر لە بیر بوو. ئەم یادداشتانە زۆرتر لە کاتی گەشتی دەرەوەی وولاتدا دەنووسم. چونکە زوربەی لە بیری خۆمدایەو کتێب‌و سەرچاوەی ناوێ. ئەمڕۆ لە وانشتۆنم (٢٠٠١/٨/١٧)، بۆ دیتنی ڕازی کچم، شوانی زاوام، منداڵەکانیان (لانە، ئاران) هاتووم. پێرێ (٢٠٠١/٨/١٥) لە ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا بووم، کاك هۆمەری دزەیی ووتی: جولەکەیەکی سلێمانی هەیە ناوبەناو تەلەفوون بۆ بەشی کوردی دەکات هەواڵی سلێمانی دەپرسێ، ئێستا لە ئیسرائیل لە شاری (نەتالیا)یە. ناوی (حسقێل)ە. ووتم:

-ئەوە هەڵەبجەیی‌یە. یەکسەر هۆمەر تەلەفوونی هەڵگرت‌و لام سەیر بوو بڵێ: کاك حسقێل، تۆ بۆ ناڵێیت هەڵەبجەییم.

-بەڵێ هەڵەبجەییم.

بە سۆزێکی گەرمەوە کەوتە باسی هەڵەبجە. هەواڵی سلێمانی پرسین. مژدەیەکی خۆشبوو کە زانیی من لەوێم بە (عیزەدینی مەلا مستەفا) ناسیمیەوە. نیو سەعاتێك قسەمانکرد، دەتووت نیو سەدە نییە، هەفتەیەکە وولاتی بەجێهێشتووە. زۆر لە هاوەڵەکانی خوێندنی لەبیر بوو. لە گەڕەکی جوولەکەکانی هەڵەبجەو سلێمانیی دەپرسی. ماڵی کێ ماوە، هی کێ نەماوە. کوردیەکەی هەر ئەوەی خۆی بوو. سەیر ئەوە بوو ئەیووت: لەم شارە ئێمە کورد زۆرین. ئەمە یەك جولەکە خۆی بە کوڕی میللەتێکی تری (واتە: کورد) بزانێت. نە من دەسەڵاتو ماق ئەوەم هەبو بانگی بکەم بۆ کوردستان، نە ئەو.

هەر لەم ساڵی ١٩٤٩-١٩٥٠یەدا کە ساڵی کارێکی حیزبیی گەرمو گور بوو، دەبێ چەند شتی سەر بەو ساڵە تۆمار بکەم:

-پاش ماوەیەك لەو پێوەندیەیە بە هاوڕێ محەمەد ساڵح سەعیدەوە، سابیر نامەیەکی دامێ، کە ڕێکخەرەکەم گۆڕاوە، مەوعیدی ناوێ، ڕێکخەری نوێ خۆی دەمبینێ. هەر لە قوتابخانە کاك عەلی مەحموود فەرەج پێی ڕاگەیاندم کە پێوەندیم بەوەوە دەبێت. بۆ هۆی ئەو گۆڕینە ووتی: من هیچ ڕێکخستنم لەلا نەبوو، دەبێ ئیشم هەبێو خەڵکم لە لابێ- ئەم پێوەندییە زۆری نەخایاند گەردەلوولی زەبرو زەنگ توند بوو.

-گرتنو مەرگی کەریم:

بەهاری ١٩٥٠ بە شاردا بڵاوبووە کە کەریمی سۆق گیراوە. کشو ماتیەکت لە قوتابخانەکەدا دەدی، ماتەمینیت بە ڕووی زۆر کەسی ناو بازاڕەوە دەدی. کەریم لای زۆر کەس بووبوو بە جێی نومێد، نموونەی لێهاتوویی، وەك ووتم فیداکاریو لە خۆشاردنەوەدا زرنگ.

چۆن گیرا. تا ئێستا من نازانم چۆن گیرا. هەرچەندە شار ئەو سەردەمە بچووکبوو، خۆشاردنەوە لە ماڵێکدا بێ ئەوەی دەرو دراوسێیش بزانن ئاسان

نەبوو، بەڵام دەستگاكانی ڕژێمیش ئەوەندە بەهێزو خاوەن تەجروبە نەبوون. هەموو كاریان پشت بە چەند پۆلیسێك بوو هێندەی پەنجەكانی دەست، جلی كوردییان لەبەر دەكردو كە زستان پاڵتۆی پۆلیسیان لەبەر دەكرد. هەموو خەڵك دەیانناسینو بە سووكی تەماشایاندەكردن.

ئەوەندە زانرا كە لە گەڕەكی چوارباخ- لە ماڵی ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە (شەهیدی كانی ماسی) گیراوە. گرتنی كەریم بۆ ئێمەی ناو ڕێكخراوی (الاتحاد) كارەساتێكی گەورە بوو، من ئەو ماوەیەی لەو ڕێكخراوەدا بووم كەریم خۆیم نەدی. بەڵام زۆر جار پێویست وابوو نامە بۆ (مەسئوول) بنووسیتو وەڵامت بۆ بێتەوە. ئەوەبێ پەیوەوتن دەمانزانی مەسئوولەكە كەریمە.

وەك دووایی زانیمان، محەمەد ساڵح سەعیدو كاك فەتتاح ڕەشید (لەمەودوا بە بێسارانی ناسرا) پێكەوە یا وەك یەكەمو دووەم ئەركی ڕێكخراوەكەیان گرتبووە ئەستۆ.

لەو ماڵەی-كەریمی تێدا گیرابوو، كۆمەڵێك بڵاوكراوەو نامەی حیزبی گیرابوو، هەمووومان ترسمان لەخۆمانبوو، بیستمان هەر لە ماڵەكەوە كەریمو ئەوڕەحمانیان بە لێدان بردبوو. پاش چەند ڕۆژێك بەڕێوەبەری قوتابخانە مامۆستا مووسا سەمەد بانگی كردین ۱۰-۱۵ كەس دەبووین. ڕەئیس عورەفای ئەمن عەبدوڵڵای حاجی حەملان دانیشتبوو، هەمووومانی دایە پێش خۆیو بردینی بۆ (شوعبەی خاصە-ئەمن). لەوێ دوو ئەفەندی دانیشتبوون بە عەرەبی قسەیان دەكرد. دووایی لە گرتنێكدا زانیم كە لە ئەمنێ گشتی (تەحقیقاتی جینائی) كاردەكەنو شارەزای نووسین، واتە (خەت)ن، یەكێكیان درێژێكی شەل بوو. ئێوارە یەكە یەكە بە كەفیل ئازادیان كردین ئەوە یەكەم جار بوو من بانگ بكرێم، ئاوانیتر هەندێكیان لە حیزبدا بوون، هەندێكیان وازیان هێنابوو.

كابرا وەك تاقیكردنەوە شتێكی دەخوێندەوەو ئێمەش دەماننووسییەوە. لە بڵاوكراوی بە دەستخەت نووسراوو لە نامەی حیزبی هەندێ شتی

پێنووسینەوە. لەوانەی کە بە منی نووسیەوە نامەیەك بوو —نازانم کێ نووسیبووی- تکا لە کەریم دەکات کە گوێ بداتە خۆی. ئەو نەخۆشە، پێویستی بە خواردنە، حیزب پارەی هەیە (هەموو ئەو پارەیەی لەو ماڵەدا گیرابوو ١٢,٥٠٠ دوانزە دینارو نیو بوو، نازانم چەندی هی حیزب بوو)، ئەو برادەرە داوای لێدەکات هەنگوین بخوات. بەلام دیارە ئەو نموونەی فیدارکاریە بە قسەی نەکردبوو.

دەمێك بوو دەمانبیست هاورێ کەریم تووشی سیل بووە. دیارە توانای چوونی نەخۆشخانەی نەبوو، کاك دارا تۆفیق هەرچەندە لە حیزبدا نەبوو —ماوەیەکی کەم- بەلام جارێك بە منی ووت: دەڵێن هاورێ کەریم نەخۆشە، دکتۆرە نەزیهە دلێمی وەك سزا گواستراوەتەوە بۆ سلێمانی، ئەگەر دەیەوێ من دەیبەم بۆ لای. من نامەیەکم نووسی، ئیتر نەمزانی چی کرابوو.

پاش چەند مانگێك بیستمان هاورێ کەریم لەژێر ئەشکەنجەدا کوژراوە. هەندێك ووتیان: بردوویانەتە نەخۆشخانەی (توێسە- تویثة) و لەوێ کۆچی دوایی کردووەو نێژراوە.

ئەو هاورێیەمان نەدیەوە. لە یەکەم ژمارەی (یەکێتی- الاتحاد)دا کاك حەمە ساڵح شینێکی ئەدەبیی جوانی بە ناوونیشانی (هەڵۆ)وە بۆ نووسیبوو.

کە هاورێ کەریم گیرابوو عورق نەمابوو لەبەرئەوە ئەوەی دەگیرا دەدرا بە دادگای ئاسایی، هێرشی گرتنیش کزبووبوو. لە قوتابخانەکەی ئێمە کۆمەڵێ زەبرو زەنگ نوێنرا. کاك عەلی مەحموودیان بانگ کرد ووتیان: تۆ لە کەرکووکەوە هاتوویتە سلێمانی. دەبێ بچیتەوە بۆ کەرکووك. هەرچەندە هاواری کرد- من بێ باوكو دایکم، لە ماڵی خاڵمدا دەژیم (میرزا مارف)، ئەودەمە خاڵم لە کەرکووك بوو. سوودی نەبوو لە بیستو چوار سەعاتدا بە پۆلیس ناردیان بۆ کەرکووك. ئەو رۆژە تا نیوەڕۆ لە قوتابخانە کاری ڕێکخستنی خۆیی ڕێکخستبوو. بە منی ووت: ئەگەر هەفتەیەکیتر حیزب خۆی

نەیدۆزیتەوە لە رێی کاك کەمال عەبدولکەریمەوە داوای پێوەندی بکە. چەند رۆژێك پاش رۆیشتنی عەلی، موتەسەریفی لیوا (پارێزگار) نەجمەدین سائیب (کەرکووکی بوو) هاتە قوتابخانەو پۆل بە پۆل ئەگەرا. کە هاتە ژووری بەرێوەبەری مەعاریفی شارو بەرێوەبەری قوتابخانەی لەگەڵدابوو. لەهەر پۆلە قوتابیەکی بۆ دەسنیشانکرابوو، لای ئێمە پرسیی "منو کەمال عەبدولکەریم؟" کاك کەمال هەستا (سەیر ئەوە بوو کابرا کوردیی باش دەزانی، بەڵام بە عەرەبی کەوتە قسەکردن). زۆری هەڕەشە لە کاك کەمال خۆیو باوکی کرد. وەك زانیمان یا لە بیرم ماوە لە پۆلی پێنجەم ئەم هەڕەشەیەی لە (مەنشێ سەبیلە)ی جولەکەو لە پۆلی دووەم لە محەمەد شوکر خەلیفە کردبوو کە سەر بە پارتی بوو. کاك کەمال لە ساڵی ١٩٤٥ەوە دەناسم. مامم (ن. ئاری نەجمەدین) لە هەڵەبجە فەرمانبەر بوو. باوکمو مەحموود ئەفەندیی هەمەوەند چوون بۆ سەردانی، منیشیان لەگەڵ خۆیانبرد، لە هەڵەبجەو پێشتر مەحموود ئەفەندی باسی کەریم بەگی دەکرد، لە هەموو رووییەکەوە ستایشی دەکرد، بڕیاریاندا بچن بۆ لای بۆ خورماڵ، چونکە ئەودەمە لەوێ بەرێوەبەری ناوچە (مودیری ناحیە) بوو. منیشیان لەگەڵ خۆیانبرد. چەند شەوێك لە خورماڵ ماینەوە. کەریم بەگ گەشتێکی (سەرچاوەی زەڵم)ی بۆ رێکخستن. (کە لە شوێنێتردا یادگاری ئەو گەشتە تۆمار دەکەم). کاك جەمال لە ئێمە گەورەتر بوو، کاك کەمالو کاك ئیحسانیش هاوتەمەنی من بوون، ساڵێك زیاد، ساڵێك کەم. لەو کاتەوە دۆستایەتیم لەگەڵیاندا خۆشبوو. تا ئەو کاتەو دوورکەوتنەوەی کاك عەلی مەحموود لەگەڵ کاك کەمالدا باسی حیزبو سیاسەتمان دەکرد، بێ ئەوەی پێوەندی رێکخستنمان بەیەکەوە هەبێت. بە هەموو حاڵ لە یەکتر ئاشکرا بووینو دەشمانزانی کە هەردووکمان سەر بە دەستەی (الاتحاد)ین. بەڵام وا رێکەوت من راسپاردەکەی کاك عەلی مەحموود چەند رۆژێك دووای ئەو هەڕەشە لێکردنەی ئەو بگەیەنم. زۆرم لا سەیرو ناخۆشبو کە کاك کەمال لە

جیاتی ئەوەی بڵێ: باشە بە حیزب ئەڵێم پچڕاویت، یا بڵێ: سەیرە شتی وا بە من نەوتراوە. وەڵامی ئەوە بوو کە من هیچ پێوەندیم بە حیزبو ئەو جۆرە شتانەوە نییە.

من لە شوێنیترەوە نامەم نارد (وابزانم بە کاك هیوادا)، کەچی کاك کەمال پاش چەند ڕۆژێك لە پشووی دەرسدا بانگیکردمو وتی: ئەوە کارەکەتم جێبەجێ کردوە. منیش وەڵامم ئەوە بوو کە پێویست ناکات، ئەو کارە دەبێ کەسێك جێبەجێی بکات کە پێوەندی هەبێتو باوەڕی پێم بێت. زۆر تووڕە بوو، ماوەیەك هەر لالووت بوو لێم، پاش چەند ڕۆژێك کاك هیوا نامەیەکی بۆ هێنام. لە شار ڕێکخەری تازەم دی.

کاك لەتیفی ئەحمەدی تۆفیقی عەزیز ئاغا. کە لە بەهاری ١٩٥٠ەوە تا ١٩٥١/١٢/١٧ ڕێکخەرمبوو. بووین بە دۆستو هاوڕێ، بووم بە خۆشەویست لای دایكو باوکی. کەماڵو میوانخانەی هەژارەیان بۆ ئەو لاوانە کردبۆوە کە لەو ڕۆژە تەنگانانەدا لە ڕیزی تێکۆشاندا مابوونەوە.

نازانم (لەتیف) ئێستا لە کوێو ئەوە کێی ماوە. بەڵام شادمانم کە چەند ووشەی ڕاستگۆیانەو وەفای بۆ تۆمار بکەم. لەتیف –ئەو سەردەمە کە من لە پۆلی چوارەم بووم، لە پۆلی دووەم بوو. لە ڕێکخراوی (الاتحاد)دا کاری دەکرد. وریاو زیرەكو ئازاو لەخۆبوردوو. کە ئێستا بیردەکەمەوە لام سەیرە (ئەوەی ئێمە) چی بووین، چۆن قوتابییەکی پۆلی دووەمی ناوەندی ئەو هوشیاریو توانا سیاسییەو ئەو گیانە جەنگاوەرانەیەی دەبێت.

لەتیف کۆڕێکی ڕەوشت بەرز، هێمن، دۆست پەروەر بوو، دایكو باوکی خۆشیان دەویست، لەبەرئەوە هەمیشە دەرگای ماڵیان بۆ برادەرانیو بۆ هاوڕێیانی کرابۆوە. دایكو باوکی دەیانزانی ئێمە خەریکی چین، بەڵام لارییان لەوە نەبوو.

لەمەودووا باسی یەکەم گرتنمان دەکەم لەگەڵ لەتیفدا لە ڕۆژی ١٩٥١/٣/١٧دا من لە پۆلی پێنجەمی شەو بووم، ئەو لە پۆلی سێیەم، پێکەوە بە کەلەپچەوە

بردیانین بۆ بەغدا، لە گرتنەکەشدا ئازا بوو لە پاش چەند مانگێك بەربووین ئیتر لە حیزبدا یەکترمان نەدیوە. نازانم کەی‌و چۆن وازی هێنابوو. بەردەوام بوایە دەبوو بە کادرێکی باش. لەم دووایانەدا دەم دی سەلامێکی گەرممان لە یەکتر دەکرد. بەڵام کە کارە حیزبیەکەمان پێکەوە نەما ئەو نزیکی‌یەش نەما. بیستم لەم ساڵانەی دوایدا کە من لە بەغدا بووم کۆچی دووایی کردووە. هەزار سڵاو لە یادی. شادم کە هیچ نەبێ بەم دوو ووشەیە یادی بکەمەوە هەر لەو سەردەمەدا برادەرانی (سیراع- صراع)، یا بڵێم لێپرسراوەکانم دەناسی.

مەلا عەزیزی جوانرۆیی (عەبدولعەزیز ڕەحیم) لە خوێندنی مزگەوتدا گەیشتبووە پلەکانی دووایی، هەر لەو کاتەشدا لە قوتابخانەی شەو خوێندبوویی‌و ساڵی ١٩٤٩-١٩٥٠ گەیشتبووە پۆلی پێنجەمی سانەوی (ئانەوی) کە ئێستا (دواناوەندی) پێ دەڵێن. بەڵام لەبەر خوێندنی قوتابخانەو لەبەر ئەوەش کە بە شیوعیی ناسرابوو مەلاکانی سلێمانی وایانکردبوو کە لە هیچ مزگەوتێکدا جێی نەبێتەوە. باوکم بەوەی زانی زۆری پێ ناخۆشبوو، منی نارد بەدووایدا، لە مزگەوتەکەی خۆماندا ژوورێکی دایە، زۆری هاندا کە لە خوێندنی قوتابخانەکەدا بەردەوام بی، هەروەها پەیمانی دایە ئەگەر بیەوێ خوێندنی بەرز تەواوبکات پارمەتیی بدات.

(مەلا عەزیز دووایی کۆلێجی حقووقی تەواوکرد). ئەوەی بیرمەو من لەلای باوکم بە واتەی مزگەوت لەگەڵیا (سەماع)م دەکرد دەرسی تەفسیری قورئان بوو. من زۆر سوودم لە ڕووی ڕووناکبیری‌و عەرەبی زانینەوە لە مەلا عەزیز بینی.

وا دیاربوو مەلا عەزیز پێوەندییەکی بە حیزبی شیوعی دەستەی (سیراع)ەوە مابوو، بەڵام لای من بە ئاشکرا ئەوەی نەدەوت. ڕۆژێك ووتی: مەلا ئەسعەدی بانیخێڵانی لە بارێکی تایبەتیدایە، دەڵێی چی بیهێنمە ژوورەکەی خۆم، بەڵام باوکت نەزانێ. چونکە دەبێ پێی بڵێین چی دەکات. ئەگەر بڵێین

هەر فەقێیە، دەبێ بخوێنێت، ئەویش کاتو ئارەزووی خوێندنی نییەو لە هاتو چۆدایە. مەلا ئەسعەد هاتە ئەوێ. بەڵام زۆرجار یا لە شوێنیتر دەنووست یا سەفەری دەکرد -من ئەم دەپرسی-.

زۆرجار من لە ماڵی خۆمانەوە خواردنم دەبرد پێکەوە دەمانخوارد.

مەلا ئەسعەد لێپرسراوی (سیراع) بوو لە سلێمانی. سەیر ئەوەیە هەوڵی ئەوەی لەگەڵ نەدەدام بچمە ناو (سیراع)ەوە، بەڵام هەندێجار ڕایدەسپاردم کە فلان هەواڵ بگەێنمە لێپرسراوی یەکەمی (ئیتیحاد)، لەوانە: ڕۆژێك ووتی: دەتوانی هەر ئەمڕۆ ئەم هەواڵە بگەێنیت. ووتم: بەڵێ. ووتی: (فلان) لەناو (سیراع)دا بووە، دەرکراوە. پەیمانی بە پۆلیس داوە بچێتە ناو (ئیتیحادەوە) و (کەریمی سۆق) و (عەلی حسێنیان) تەسلیم بکات. من (عەلی)م نەدەناسیو ناویشیم نەبیستبوو دووایی زانیم کە (شەهید عەلی بەرزنجی)یەو ئەوو مەجید عەبدوڕەزاق لە کاك بەهادین جیابوونەتەوەو هاتوونەتە ناو ئیتیحادەوە. من هەواڵەکەم گەیاند. بەڵام نە کابرا جاسووس دەرچوو نە هاتە ناو ئیتیحادەوەو نە کەسی تەسلیم کرد. قوتابییەك بوو هێزی کاری نەمابوو، دەترسا، وازی هێنابوو. وابزانم ئیتر هەرگیز توخنی حیزبایەتی نەکەوتەوە. ئێستا وا دەبینم لەو تەمەنەدا ویژدان پاڵی پێوەناوم، یا گومان. لەبەرئەوە تەنیا بە گەیاندن وازم هێناو لە قوتابخانە بە کەسم نەووت.

ڕۆژێك مەلا ئەسعەدو مەلا عەزیز بەیاننامەیەکیان بە دەستەوە بوو، بە دەست نووسرابوو و بە ڕۆنیۆ چاپکرابوو، واتە: بە قەڵەم لەسەر ستێنسڵ نووسرابۆوەو چاپکرابوو، دایانمێ خوێندمەوە، ئیمزای (حیزبی شیوعی عیراق)ی پێوە بوو. سەیری یەکترمان دەکردو دەیانووت: خەتەکەی خۆشە، ئەیانویست تێم بگەێنن کە خەتی هاوڕێ بەهادینە. داوام کرد بمدەنێ، دایانمێ. بردم بۆ لەتیف، ئەویش وەك من سەرسامبوو، ئێمە هێشتا هەر بەدەست بەیانو ڕۆژنامەمان دەنووسییەوە، وا ئەوان چاپیشیان هەیە. ئەمە وەك

بۆمبایەك وا بوو لەناو ئیتیحادا تەقییەوە. ڕەنگە ئەوە سەرەتای بیر لە یەکگرتنەوەی دروستکردبێ.

ڕۆژێك هاتمە مزگەوت، لە حەوشەکەدا نووری محەممەد ئەمین (وەشتی) و برایمی شێخ ڕەشیدم دی. لێیان پرسیم: مەلا ئەسعەد دەناسی، ووتم: بەڵێ. ووتیان: بزانە لە کام ژوورە بۆمان بانگ بکە. ووتم: دەمێکە نەمدیووە، باوەڕناکەم لێرە بێت، چونکە فەقێی باوکم نییە. سەیری یەکتریان کردو پێکەنین، ووتیان: بە ژوورەکاندا بگەڕێ، خۆی پێی ووتبووین لە تۆ بپرسین. مەلا ئەسعەد لە ژوورەکەی مەلا عەزیز بوو. کە لە ژووری فەقێکان جیابوو. یەکڵوو ژوور گەڕام، ئەوسا چوومە ئەوێ، یەکسەر هاتە دەرەوەو برنییە ژوورەوە.

دیاربوو نامەیان بۆ هێنابوو، چونکە نووری سەرباز بوو لە کەرکووك (لە قوتابخانە دەرکرابوو).

چەند هەفتەی پێچوو. ڕۆژێك پۆلیس هاتنە ناو مزگەوتەوە.

گوایە فەرمانی گەڕانیان پێیە. خێرا باوکمم بانگ کرد. باشبوو مەلا ئەسعەد لەوێ نەبوو. باوکم کردی بە هەرا، بە پۆلیسی ووت: فەرمانی گەڕانم بۆ بێنن‌و دەبێ موختاری گەڕەکتان لەگەڵدا بێت. موختاری گەڕەکێکیتریان هێنابوو، ووتی: من ئەوەم قبووڵ نییە، موختاری گەڕەکی ئێمە "جەمال"ی موختارە. (بە ڕاستی پیاوی چاکبوو، بە تایبەتی لەم حاڵانەدا کە لەگەڵ پۆلیس دەهات). دووایی قەناعەتیان پێکرد. ووتیان: ماموستا دڵنیابە ئێمە مزگەوت ناگەڕێین. تەنیا ئەو ژوورەی مەلا عەزیز نەبێ. ئەویش تەنیا سەیری دەکەین. هاتنە ژوورەکەوە. ئەوەی ئەوان بووی دەگەڕان نەبوو. گەڕانەوە، مەلا عەزیزیان لەگەڵ خۆیاندا برد. تومەز یەکێك لە کەرکووك گیراوە. لەو شتانەدا کە ووتبووی ئەوە بوو کە مەلا ئەسعەدو کتێبخانەی حیزب لای مەلا عەزیزن.

باوکم جبەکەی دا بە شانیداو بەرەو سەرا چوو. عورق نەمابوو، ئەو کارانە لای حاکمی تەحقیق بوو (دادوەری لێکۆڵینەوە). فایەق هوشیار دادوەر بوو،

باوکم چووە لای، ووتی: کاک فایەق من بۆشاهیدی هاتووم. وەڵامی ئەوە بووبوو: مامۆستا من جەنابتم بانگ نەکردووە. بەڵام فەرمانت بە چییە. ووتبووی: مەلا ئەسعەد کوڕی مەلا قادری سۆفییە، کە خۆیو مەلا ئەحمەد دێنە سلێمانی میوانی من دەبن. من لە ماڵەوە جێگەم نییە. لە مزگەوت ژوورم بۆ میوان هەیە. ناشزانم کە مەلا ئەسعەد کاری سیاسی دەکات یان نا. کەواتە مەلا عەزیز ئاگای لێ نییە. مەلا عەزیزی هێنایەوە. بەڵام زۆر گلەیی لە هەردووکمانکرد. کە لە بوونی مەلا ئەسعەد ئاگادارمان نەکردووە.

کەریمی سۆقی نەمابوو، چونکە کەریم ناودار بوو، توانا بوو، با تەمەنیشی زۆر نەبووبێ، بەڵام لەناو حیزبەکەی ئەوسایدا لەو بەتەمەنتر کەمبوون. من جارێك نامەیەکم بۆ کەریم یا بڵێم بۆ مەسئول نووسی، پرسیم بۆ چ ئێمەش وەك (سیراع) هەوڵ نادەین لە بەغداو شارەکانیتردا پەرە بە خۆمان بدەین. وەڵامی ئەوە بوو. ئێمە دەمانەوێ جارێ لە سلێمانیو ئەو شوێنانەی لێی هەین پتەو ببین، ئەوسا پەل بهاوێژین بۆ شوێنیتر. وەك ووتم: کەریم نەمابوو، کادری دووای ئەو لە (ئیتیحاد)دا ئەو ناوەیان پەیدا نەکردبوو دیارە تەمەنیشیان لەوەدا نەبوو ئەو ئەرکە هەڵگرن. هەر لە سەرەتاشەوە، لەناو (ئتیحاد)دا ئارەزووی یەکگرتنەوەی حیزب لە (سیراع) زیاتر بوو. کاک بەهادین چووبووە بەغدا، چالاکبوو، عەرەبیی باش دەزانی. خۆی بە لێهاتوو و سەرکردە دەزانی. ناوی ڕۆژنامەکەی گۆڕی بە (القاعدة)[٣٢] کە لە زەمانی هاوڕێ فەهددا ناوی ڕۆژنامەی مەرکەزیی حیزب بوو. تایپی پەیداکردبوو. ڕۆژنامە بە تایپو ڕۆنیۆ دەردەچوو. ئێمە هێشتا شەو تا بەیانی لەبەر چرادا ڕۆژنامەمان

---

٣٢-لە ساڵی ١٩٥٦دا لە (سائیغ)م بیست کە یەکەمجار ئەو ڕۆژنامەی حیزبی بەو ناوەوە دەرکردووە.هاوڕێ فەهد لە ووڵات نەبوو، عەبدوڵڵا مەسعود. دەستی بەسەر چاپەمەنیدا گرتبوو. ئەیوت کە هاوڕێ فەهد هاتەوە ئەوەی پەسەند کرد.

دەنووسێوە. ئەمانە هەموو کاری تێکردین. ئەوەندەمان زانی وەك مژدەیەکی خۆش هەواڵی یەکگرتنەوەی حیزبمان بیست. یەکگرتنەوە بەو جۆرە بوو کە کاك بەهادین‌و هاورێکانی[٢٤] دەیانویست، واتە: (ئیتیحاد) خۆی هەڵوەشانەوەو ئێمە تاك تاك چووینە ناو ڕێکخراوە یەکگرتووەکەوە کە موناقەشەی ئەوەمان دەکرد، دەیانووت: ئەوان بڕبڕەی پشت، یا (عەموودی فەقەریی) حیزب بوون.

بێگومان هەموو دڵمان بەوە خۆشبوو. وەرە لەو تەمەنەدا (کە هێشتا منداڵ یا مێردمنداڵ) بووین. لە جیاتی یاری‌و دیاری ئەو کارە گەورەیە دڵی خۆش دەکردین. دیارە نووسینەوەشمان لە کۆڵ بۆوەو دەتوانین ئەوکاتە بدەین بە خوێندنی قوتابخانەمان.

لە بارەی ئەو یەکگرتنەوەیەوە، تێبینی‌یەك هەیە دەبێ بینووسم. کاك بەهادین لە یادداشتەکەیدا نووسیوی‌یەتی، کە دووای کەریم، کاك کەمال مەحموود فەرەج لێپرسراوی (ئیتیحاد) بووەو بە دەمیش دەڵێ: ئێمە ڕێکخراوەکەی (ئیتیحاد)مان لەو وەرگرت.

لەو دەمەدا کە هەندێك نهێنی لە (خوارەوەی حیزبدا)هەر دەزانرا، ئێمە نەمانبیستبوو کە کاك کەمال لێپرسراوی ڕێکخراوەکە بێت. چەند جار ئەمەم لە کاك کەمال پرسیووە –وەڵامی ئەوە بوو کە من نە لەناو (ئیتیحاد)دا بووەو نە لێپرسراو بووم. بەڵام هەر لە زەمانی شەهید کەریمەوە هەوڵی زۆرم بۆ ئەو یەکخستنەوەیەدا. زوو زوو لەخانەقینەوە دەهاتمە سلێمانی‌و دەچوومە بەغداش بۆ بینینی ئەولا. تا لەگەڵ لێپرسراوەکانی پاش کەریمدا ڕێك کەوتەو دەتوانی بڵێی ئەو یەکگرتنەوەیە لەسەر دەستی مندا بوو.

---

٢٤-بە چوونە بەغدا.کاك بەهادین کۆمەڵێ کادری عەرەبی توانای لە دەوری خۆی کۆکردەوە، بەڵام هەر خۆی لێپرسراو بوو.

ساڵی خوێندنی ١٩٥٠-١٩٥١ دەستپێکرد، بەو جۆرەی باسم کرد ساڵی ڕابوردوو و پۆلی چوارەمی زانستم بڕی. چەند ڕۆژێک لە پۆلی پێنجەم خوێندم، لەگەڵ بەشی (زانستی)دا ڕاهاتبووم، بەڵام زۆرم لا خۆش نەبوو.. لەپڕ لە کاتی پشووی نێوان دەرسەکاندا بووم، مام ئەحمەدی فەڕاش بە حەوشەکەدا دەسووڕایەوە، دیاربوو بۆ من دەگەڕێ، بانگی کردم. وەرە بەڕێوەبەر داوات دەکا.

چوومە ژوورەوە. بەڕێوەبەر مامۆستا مووسا سەمەد[1]، ڕووی خۆشبوو، ئەمجارە بە پێکەنینەوە ڕووی تێکردم:

-بچۆ دوو وێنەی خۆت بهێنە.

-بۆچی؟

-ئەی تۆ لە پارەوە داوای بەشی (ئەدەبی) ناکەیت، وا بە شەو بەشی ئەدەبیمان کردۆتەوە، بچۆ ئەوێ.

-من تازە لە پۆلی چوارەم دەرچووم، بە بەشی زانستی ڕاهاتووم. پاشان چۆن لە شەو یەکسەر دەمبەیتە پۆلی پێنجەم؟

-لەسەری مەڕۆ. هەر بە دەمی (شەفەوی) تاقیت دەکەینەوە دەتبەینە پۆلی پێنجەم. لێرەش لە کۆڵم ببەوەو بچۆ شەو لەناو ئەو تەمەن زۆرو فەرمانبەرانەدا شیوعێتیی خۆت بکە.

نازانم بۆ لە دڵدا چوونە بەشی ئەدەبیو چوونە قوتابخانەی شەویشم پێ خۆشبوو، هەروەك حەزم لە خوێندنە ئەدەبییەکە دەکرد، هەروەها قسەکەی بەڕێوەبەریش لە دڵی دام. لە جیاتی خوێندن لەگەڵ ئەم ئەنشتاینانەدا لەگەڵ کۆمەڵێك دەبم بە هاوپۆل کە تەمەنیان لە من زۆرترەو بە هۆی تێکۆشانو بەندیخانەوە لە خوێندن دووا کەوتوون. یا ژیان کردوونی بە فەرمانبەرو ناچار بە شەو خوێندن تەواو دەکەن، لام وابوو کە لە هەردوو چەشنەکە سوودو تەجروبە وەردەگرم.

لەو پۆلی پێنجەمی شەوەدا ئەوەی لە بیرمە لەگەڵ برایان: غەفووری میرزا کەریم، بەهجەت محەمەد بابان (حاکم)، محەمەد مستەفادا یەکمانگرتەوە.

هەر لەو پۆلەدا قسەخۆشەکانی کاك غەفوری مەلا تاهیر لە بیر ناچێتەوە. لەوانەش کە زۆر بە تەمەنبوون: کاك برایم گوردیو کاك ئەحمەدی حەماغای خوبیلە (کاکەیی)، کە بە ئەحمەد سمێڵ ناوی دەرکردبوو و نموونەی نەگبەتی بوو لە دەرنەچوونی تاقیکردنەوەدا. لەوانەو کوڕی گەڕەکی خۆمان کاك ئەحمەد محەمەد عەبدوڵڵا بوو، کە لەمەودوا بوو بە مامۆستاو مامە ئەحەیان پێدەووت. بەڵام کەسانی تر هەبوون کە ڕەنگە بە هۆی دوو ساڵ لە یەك پۆلدا دەرنەچوونەوە هاتبوونە شەو.

لەوانە قادر دیلانو برایمی مامەشێخەو بەرقی ڕەشیدو غەفوور تاهیرم لە بیرە. مامۆستاکانمان دەستەیەکی سەیرو تواناو ناسراو بوون.

هەندێکیان هەر لە مامۆستاکانی ڕۆژ بوون، وەك مامۆستا مووسا خۆیو مامۆستا ساڵح ئیبراهیم کە عەرەبی زانێکی باش بوو. بە ڕەگەز کوردو خەڵکی باقووبە بوو. ئەوانیتر لە دەرچووانی کۆلیجی حقووقو فەرمانبەر یا سەرۆکی ناسراوی دائیرەکانی سلێمانی بوون. لەوانە:

-عەبدولباقی ئەلسەلام- بەڕێوەبەری بانك

-خەلیل ئیبراهیم خالید- کە لە دائیرەی (تەسویە)ی زەوی کاری دەکرد. یاساناسێکی باشو پیاوێکی زۆرباشو بە بیر چەپ بوو. خەڵکی شارەبان بوو لە سلێمانی کوردییەکی باشو گاڵتەوگەپی سلێمانی فێر بووبوو. پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووز برایە بەغداو لە ئیسلاحی کشتوکاڵدا ڕۆڵێکی باشی بوو:

-جیهاد حسین جاف- بەڕێوەبەری بەندیخانەی سلێمانی. ئەمانە هەریەکە دەرسێکی ئەوتۆیان دەوتەوە کە شارەزای بوون. سوودی زۆرمان لە دەرسیانو شەخسییەتیانو موناقەشەیان دەبینی.

دەرسی: ئابووری، ئەحوالی عیراق، مێژوو، تەنانەت جوغرافیاو عەرەبیش موناقەشەیان تێدا پەیدا دەبوو. لەو سەردەمەدا بزووتنەوەی ئاشتیخوازان پەرەی سەندبوو، ئێمە ئیشمان ئیمزا کۆکردنەوە بوو لەسەر بانگەوازی

ئوستوکهۆڵم بۆ قەدەغەکردنی چەکی ئەتۆم. فۆڵمان لێهەڵکردبوو، لە قوتابخانەو گەڕەك و بازاڕدا لە خەڵکمان دەگەیاندو ئیمزامان پێدەکردن. ئەوی ئیمزای زۆرتری کۆبکردایەوە بە چالاکترین تێکۆشەر دەژمێررا. لە بیرمە کاك بەدیع عەبدولخالق قوتب، کە حیزبییەکی چالاك بوو، ئەو دەمە لە پۆلی پێنجەمی زانستی (عیلمی) بوو لە هەمووان زیاتری کۆکردەوە. باوکی بەڕێوەبەری ئینحیساری تووتن بوو کە لە هەموو دائیرەیەك زیاتر فەرمانبەرو کرێکارو پاسەوان و کۆڵبەر (حەممال)ی هەبوو، کاك بەدیع کەسی لەوانە نەهێشتبوو ئیمزای پێنەکات.

شەوێك لە دەرسدا بێ هیچ پێشەکی و باسکردنێك مامۆستا مووسا پرسیی: کێ بانگەوازی ئوستوکهۆڵمی ئیمزا کردووە. نازانم بۆچ وەك زۆر جار بووم بە کەڵە سووری بەر لەشکرو دەسم هەڵبڕی و وتم: من.

پرسیی: بۆچ.

کەوتمە باسی بۆمبای ئەتۆم و ئاشتی، دیارە ئەو شتانەی من دەمووت ئەو لەو سەرییەوە دەهاتەوە. دووای ووتم:

-ئوستاد بێدەنگییەکەت مانای ڕازی بوونە. ئەگەر پێت خۆشە سبەینێ بۆت دەهێنم ئیمزای بکە. ووتی:

-نا.. تۆ خوێندنەکەت تەواوبکە، ئەوسا خەریکی ئەم شتانە بە. ووتم:

-ئوستاد، خۆ جەنابت دەمێکە خوێندنت تەواوکردووە.

هەردووکمان بێدەنگ بووین. بەڵام لە یەکەم گرتنمدا پاش ئەوە بە چەند مانگ لە ١٩٥١/٣/١٧دا، بە دەم شەقوشەقازللەوە قۆمیسەری ئەمنی سلێمانی- حازم لەبەرچاوی ئەو ئەمنە گەورانەدا کە لە بەغداوە هاتبوون پێی ووتم: بەڕێوەبەر جوگرافیاتان پێدەڵێ، تۆ دەیبەیتە سەر باسی ئاشتی. (پۆلەکە قەڵەباڵغ و هەمەجۆر بوو، لەبەر ئەوە گومانم بۆ کەس نەدەچوو).

پێوەندیی حیزبیم لەو ساڵەدا هەر بە (لەتیف)ەوە بوو، حیزب یەکی گرتبۆوە. هەرچەندە پێوەندییەکەم تەنیا بوو، بەڵام لەولاوە بە نهێنی ڕێکخراوی یەکێتیی قوتابیانیش هەبوو لەوێشدا هەر کارمان دەکرد. زۆرجار ئەو کاری قوتابیانە وابوو کە کۆمەڵێك لە ماڵێك دادەنیشتین لە شێوەی دۆستداو قسەمان دەکرد. یا کتێبمان دەخوێندەوەو، دەماندا بە یەك‌و بۆ یەکترمان لێك دەدایەوە. من عەرەبییەکەم باشتر بوو لەبەر ئەوە ئەرکم زیاتر دەکەوتە سەر. نووسینەوەی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەی حیزبیمان لە کۆڵ بووبۆوە، بەڵام هەندێك شتی قوتابیانمان هەر بەدەست دەنووسییەوە.

لە وانەی لەو ماوەیەدا پێوەندیی هەمەڕەنگم پێومیانەوە هەبوو (قادری میرزا کەریمی وەستا ئەحمەد، جەلالی برای – جەلالی میرزا کەریم، کە هەر ئەو سەردەمە دەستی دابووە شیعر نووسین‌و ڕای منی وەردەگرت، ئەمینی میرزا کەریمی حاجی شەریف، وەهاب ساڵح کۆیی..).

ساڵەکە لە جاران خۆشتر بوو، حوکمی عورفی هەڵگیرابوو. ڕەشبگیر نەمابوو. گرتن لەسەر شتێك دەبوو. یا بڵاوکراوەت پێ بگیرایە، یا کەسێك بڕووخایەو ناوی بېردیتایە.

لە بەغدا کۆمەڵێك ڕۆژنامە دەستیان کردەوە بە دەرچوون. (صوت الاحرار)ی لوتفی بەکر سدقی، "الاهالی"ی کامیل چادرچی. جەماهیری لەو ساڵانەدا یا (الرأی العام)ی خۆی دەردەکرد یا (الجهاد) و (الثبات)ی لە ڕۆژنامەوانی تر وەردەگرت (سەیری بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەکان بکە).

بێگومان هیچ کارێك بێ پرسی حیزب نەدەکرا. پرسم کردو یەکەم کاری ڕۆژنامەنووسیم ئەوە بوو هەفتەی نامەیەکم لە بارەی سلێمانییەوە بۆ (صوت الاحرار) دەنووسی.

لەبەر ئەوەی بە شەو دەمخوێند. بە ڕۆژ بێکار بووم. فریا دەکەوتم لە مزگەوت بخوێنم یا بە واتەی مەلاکان (سماع)ی هەندێك دەرس بکەم. واتە گوێ

لە دەرسی هەندێ فەقێیتر بگرم. وا بزانم هەر لەو ساڵەدا (فەنناری) و (ئیساغۆجی)م لە مەنتیقدا لای باوکم خوێند. هەر بە جارێك گوێگری دوو پلەی جیاواز بووم. کاکە شێخ ڕەوفی شێخ سعیدی تەکیەو کاك شێخ محەمەدی شێخ خالید لە جێی باوکیان بووبوونە مەلا، یا (پێش نوێژ)، باوکم سوور بوو لەسەر ئەوەی وایان لێبکات بە دەم پێش نوێژییەکەوە خوێندن تەواو بکەم. هەردووکیان لای باوکم. شەرحی (سیوطی)یان لەسەر ئەلفیەی ئیبن مالیك دەخوێند. منیش لە گوێگرتن زیاتر بەشدار بووم. هەروەك بە باشی گوێم لە فەقێیەکی خۆی. کە وا بزانم مەلا محەمەدی ڕۆغزایی بوو دەگرت کە ئەو (مختصر)ی تەفتازانیی دەخوێند لە بەلاغەدا.

ئەوەش بڵێم کە مەلا عەزیزی جوانڕۆیی پار هاتبووە مزگەوتی ئێمە. لای باوکم (تەفسیر)ی دەخوێند. منیش هەر گوێگر بووم. زیاتر پشتی بە تەفسیری (المنار)ی شێخ ڕەشید ڕەزاوە دەبەست کە قوتابیی شێخ محەمەد عەبدە بووە.

*ژیانی ئەدەبی:*

لە پێشەکی دیوانی کاکەی فەللاحدا نووسیبووم:

یانەی تایبەتیو یەکێتیی نووسەران نەبوو، زۆر جار دوکانێك دەبووە یانەی کۆمەڵە کەسێك، هەر دوکانە کەسی خۆیو بابەتی خۆی هەبوو، جۆرە پێوەندیو یەکێتییەك ئەندامانی یانەی بە خاوەن دوکانەوە دەبەست. ڕەنگە لە خۆیەوە نەبێ کە زۆرتری خاوەنانی ئەو دوکانانە بەرگدروو بوون.

باسی یانەی تر ناکەم، بەڵام یانەکەی ئێمە بناغەیەکی پتەوی هەبوو، پێش هەموو شت بیری شۆڕشگێڕیو بەشداری خەباتو ئەدەب دۆستی لەگەڵ ئەو یانەیەی کۆدەکردینەوە.

شێخ کەریمی بەرگدروو (بەرزنجەیی) و تۆفیق محەمەد تازە دوکانیان کردبوو بە یەك، ئێمەش هەریەکە لە لای کۆنە دوکانی یەکێکیانەوە ڕوومان کردە ئەو یانە تازەیە.

تەمەن جیا بوو، وەك تەمەنی کەسانی سەر بە هەموو یانەکان، پلەش هەر جیا بوو. هەردیی شاعیر لە تەمەندا گەورەترو لە پلەدا بەرزتر بوو، کۆڵەکەی یانەکەمان بوو.

کاکەی فەللاح تازە لە جارێکی تری، ماوە درێژی بەندیخانەوە هاتبۆوە، دۆستو ناسیاوو هاوڕێی هەمووومان بوو، بەڵام تیشکی هەردی ڕووەو ئەم یانەیەی هێنابوو، هەرچەندە لەگەڵ شێخ کەریمی کۆچ کردوو و کاك تۆفیقیشدا دۆست بوو.

دڵزارم لە بەندیخانەی کووت بەجێهێشت. هەر ئەمە سەرناوی یاداشت گێڕانەوەی ساڵانی بەندیخانەی ئەوو دانیشتنی چەند ڕۆژی ئێمە بوو.

شیعری کۆنو نوێ ئەخوێندرایەوە، دیوانی شاعیران هەڵئەدرایەوە. لە دەنگی شاعیرێکی پیری وەك عارف عورفی قاپ ڕەشەوە تا دوا پارچەی شاعیرانی تر. هەڵچوونو نیشتنەوە بەرامبەر بەهەشتو یادگاری گۆرانو شیعری دڵداری. هەندێ پارچە شیعرم نووسیبوو، وا بزانم دوو چیرۆکیش بە عەرەبی، تێکڕا لای هەردی پەسەند بوون، بەڵام خۆم شیعرەکانم لا کز بوون، کاکەی فەللاح هاتەوە، زۆری حەز دەکرد بەرهەمی من ببینێ، وا بزانم هەر بۆ فەوارە گەورەکردن بوو، چەند پارچە شیعرێکیترم دروستکرد.

تێبینیی زۆر هێژاو ڕێنیشاندەری دامێ، ئەو نەیوتبوو، بەڵام من شیعرەکانم دڕی.

بڕیار وابوو لەسەر خوانی چیرۆکەکان یەك بگرینەو، چۆوە بۆ چوارتا، لە ڕێگە پارچە شیعرێکی دڵداریی هەردیی بە دەستنووسی لە گیرفاندا گیرا. تووشی چەرمە سەرێ بوو، هەر ئەوەش سەرەتای خۆشاردنەوەی تازەی بوو.

هەر لە پەراوێزی ئەم نووسینەدا لە پێشەکیی دیوانی کاکەی فەللاحدا نووسیبوم.

شێخ کەریمی بەرزنجەیی، زۆر دۆستی هەردی بوو، دوایی بوو بە خەزووری. لە پاڵ حەز لە ئەدەبیاتدا، ماوەیەکی زۆر لە کۆڕی تێکۆشانی سیاسیشدا جێی خۆی هەبوو. پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووز کۆچی دوایی کرد.

لە بارەی کاك تۆفیقیشەوە نووسیبووم:

تۆفیق محەمەد، تا ئێستا لە سلێمانی بەرگدرووە، بەشداریی خەباتی شۆڕشگێڕیو پاشان ئاشتیخوازی لەگەڵ کۆمەڵێك تێکۆشەرو ڕۆشنبیردا تا ئێستا کردوویەتی بە دۆست. سەرەتا ئەوە بوو باسکرا، بەلام لە مەودوا دۆستی نزیکی گۆرانی نەمر بوو، کاك تۆفیق ئینسانێکی دڵپاكو دڵسۆزو قسەخۆشە سۆزێکی تایبەتی دەدات بە قسەگێڕانەوە، هەر ئەمە وایکردبوو گۆران هەمیشە دەیوت: ئای چەند بەهرەی وا گەورەمان لە کیس چووە. ئەگەر تۆفیق خوێندەوار بووایە، دەبوو بە گەورەترین چیرۆکنووسی کورد.

سەرەتا لە دوکانە هاوبەشەکەی ئەواندا دوایی لە دوکانە جیاکەی کاك تۆفیقدا مەمەند ئاغای فانیی شاعیرمان ناسیو پێوەندیی بەتینی گۆرانو فانیو خوانی شیعری (عیشقی) زادەی ئەو یانەیەو کەرەسەی هەندێك یاداشتی ئەدەبییترە، کەلە جێی خۆیدا دەبێ ڕاگەیەنرێت.

لە بارەی ئەم دوو کەسەوە شتی زیاتر دەنووسرێ: ئەوەی کەماڵی شێخ کەریم شوێن داڵدەو خۆشاردنەوەی کادیرانی حیزبی شیوعی بووە، دەچێتە ناو یادداشتی خەڵکیترو ئاگادارترو پێوەندیدارترەوە. لە پاش شۆڕشی تەمووز کەوتبوە ژێر کاری بیری قەومیی نوێی مامۆستا هەردییەوە زووش کۆچی دوایی کرد.

هەرچی کاك تۆفیقە ئەوە لە (      )دا کۆچی دوایی کرد، هەرچەندە لە کاری حیزبیدا نەمابوو، بەلام هەر سەر بەو ڕێڕەوەی خۆی بوو. خۆی بۆ پێگەیاندنی براو کوڕەکانی زۆر ماندوو کرد، سەردەمێك هەژاریی بۆیان چەشت، بەلام گوێی نەئەدایە. لە براکانی (برایمی بەرگدروو بوو بە هونەرمەندێکی دیارو دەنگخۆش. (سمایل) لە کۆڕی تێکۆشاندا بوو. کاك (فەرەج)ی براشی هەر لە ژێر کارتێکردنو سۆزی ئەودا بوو. لە کوڕەکانی کاك شێرزاد- ئێستا مامۆستایەکی چالاکە لە زانکۆی سلێمانی. نووسینەوەی یادگارو

قشەخۆشەکانی کاك تۆفیق گەلێك لاپەڕەی دەوێت کە لە سنووری ئەم یادداشتە دەچێتە دەرەوەو کاتێ خۆیی دەوێت[٣٥].

هەر لەو پێشەکییەدا لە بارەی عارف عورفییەوە نووسیبووم:

عورفی (عارف مەحموودی بەرزنجەییە کە بە عارف قاپ ڕەش ناسراوە) ساڵی ١٨٩٦ لەدایکبووە، ساڵی ١٩٦١ کۆچی دوایی کرد، زەوقێکی ئەدەبیی بەرزو شیعری کلاسیکی جوانی هەبوو.

چاوەڕێی ئەوەین کە برای مامۆستاو نووسەرمان عومەر عارف (کە کوڕە گەورەی شاعیرە) دیوان و ژیانی ئەدەبیی بە چاپ بگەیەنێت.

دیوانەکەی چاپکرا: (کاك ئومێد کاکە ڕەش) سەرپەرشتیی کرد. بەڵام لێرەدا چەند وتەیەك هەیە دەترسم ژیان دەرفەتی ترم بۆ باسکردنیان نەدا تێ، وا تۆماریان دەکەم:

کاك عارف. ئەفسەرێکی دیاری پۆلیسی ئەوسا بوو. بەڵام زەوقێکی ئەدەبیی بەرزی هەبوو شیعری زۆر لەبەر بوو، ئێمە لەو دانیشتانەدا سوودمان زۆر لێدەبینی.

لەبەرئەوەی تا ئەو کاتە هیچی بڵاونەکردبۆوە، لەناو هاوتەمەنەکانی ئێمەدا کەم کەس دەیزانی کە شاعیرە. لەبەرئەوە من ناوەکەیم هەر بە (قاپ ڕەش) بڵاوکردەوە کە بەو جۆرە بەناوبانگ بوو. کاك عومەر –کە ساڵی ١٩٨٥ کۆچی دووایکردو ماوەیەکی خوێندن و بەندیخانە پێکەوە بووین. چونکە بە هۆی تێکۆشانەوە ئەو زۆر دوواکەوتبوو. ئەو ناوەی باوکی دەبردەوە سەر ئەوەی کە بە منداڵی زۆر بە جووڵەو هاتووچۆ بووە هەر هاتۆتەوە ماڵەوە دایکی قاچیی شتووەو پێی وتووە (عارف قوڵ و قاپ ڕەش)، ئیتر بە سەریا دابڕاوە. کاك عومەر خۆی پێی وتم هەر بە عارف قاپ ڕەش ناوی بێنە.

---

٣٥-کە ئەم یاداشتانە چاپ دەکرێن. بە داخەوە براکانیشی هیچیان نەماون.

دیسان لە مەیدانی قسەی خۆش‌و گاڵتەو گەپی کوردیدا دەبێ ناوی کاك عومەر عارف بە گەشی بێت -کە نووسەرێکی لێهاتووش بوو. لە (ئازادی)دا بە ناوی (شەن)ەوەو لە (شەفەق)دا بە ناوی (هەسان)ەوە نووسینی گاڵتەئامێزی باشی هەبووو. هەروەك گاڵتەی نێوان باوك‌و کوڕی خۆی‌و باوکی خانەیەکێتری گاڵتەوگەپی کوردییە.

لە بارەی چیرۆکی ئەو سەردەمەشەوە لە پەراوێزی ئەو پێشەکییەدا نووسیبووم:

"بە داخەوە ئەو کۆمەڵە چیرۆکەم پاش ڕاپەڕینی تشرینی ١٩٥٢ وون بوو. دەستنووسێکی لە سلێمانی برادەرێکم سووتاندبووی، دووەمیش: لە بەغدا درا بە ئاشتیخوازان‌و بڕیاری چاپییان دا، بەڵام ئەو هێرش‌و زەبرو زەنگەی پاش ڕاپەڕینەکە هات‌و هەموومانی گرتەوە تا ١٩٥٤ هێواش نەبۆوە، ئەوساش کۆمەڵە چیرۆکەکە نەمابوو، لەبەرئەوەی بڕیاریشم بە پێی ئامۆژگاریی ڕابەرو مامۆستایەکی ژیانم ئەوە بوو کە ئەدەبیات بە کوردی بنووسم‌و عەرەبی زانین بۆ کورد بە برای عەرەب ناسین بەکاربێنم، ئیتر هەوڵی نووسینەوەیانم نەدا. ئەگەر چاپ کرانایە زۆر نیشانەیان بۆ ڕێڕەوی ئەدەبیی خۆم‌و چیرۆکی کوردی‌و سەرەتای بەرهەم دەستنیشانکردن دەهێشتەوە".

ئێستا زیاتر لە بارەی ئەو کۆمەڵە چیرۆکەوە دەنووسم.

لە لایەکەوە خەفەت بۆ ونبوونی دەخۆم. لە لایەکی ترەوە ڕەنگە بڵێم ساکاری‌و سەرەتاییان وای نەدەکرد بچنە ڕیزی چیرۆکە باشەکانی کوردی یا عەرەبییەوە. ئەودەمە چیرۆکی کوردی ئەوانەی "گەلاوێژ" بوون، بەڵام من‌و ئەو هاوەڵانەمان کە دەمانخوێندەوە زیاتر لەژێر کاری چیرۆکەکانی زەنوون (ذوالنون) ئەیوب‌و عەبدوڕەزاق شێخ عەلیدا بووین، هەرچەندە هەندێك نووسینی عومەر فاخووری‌و هەندێ چیرۆکی وەرگێڕاویشمان خوێندبۆوە.

سکێچی هەندێك لەو چیرۆکانەم هێشتا لەبیرە، بەڵام تازە نە بۆ ئەوە دەبن کە بەو ساکارییەی ئەو سەردەمە بیانووسمەوەو نە بۆ ئەوەش دەبن بە جۆرێکی تازە دایانرێژمەوە.

ڕۆژان ڕۆژی باسی ئاشتیو ئاشتیخوازان بوو، لەبەرئەوە چیرۆکی یەکەمیان خەونێك بوو بە هەڵگیرسانی جەنگی ئەتۆمیو دیمەنی وێرانی وڵاتی پاش ئەو جەنگەی تێیدا پیشاندرابوو.

قارەمانی چیرۆکی دووەم لە دیمەنو قسەو ڕەفتاری یەکێك لە شێتەکانی شارەوە وەرگیرابوو، کە سەیری ئەو خانووانەی شاری دەکرد کە دەڕووخێنران بۆ کردنەوە یا دروستکردنی شەقامی "کاوە" و یەك لە دووای یەك دەیوت:

-جادە دروست دەکەنو خەڵك لە برسا دەمرن.

سێیەمیان: بەم وشانە دەستی پێدەکرد –"فەرەج رژیا، فەرەج رژیا"، "رژیا بە شێوەی خانەقین، واتە: وەرگەڕا" کەوتە چیرۆکەکە لە بارەی وەرگەڕانی پاسێکەوە بوو لە نێوان "خانەقینو قۆرەتوودا" ئیتر دیارە شتی کۆمەڵایەتیو ئینسانیو سیاسیش لەسەر ئەو ڕووداوە بیناکرابوو.

ئەم سێ چیرۆکەم بیرە، بەڵام دیارە زیاتر بوون. بە هەموو حاڵەوە ئەمەندە لە توێی یادگارا ماوەو دەبوو تۆماریان بکەم. ئیتر چاپ نەبوونو فەوتان چاك بن یا خراپ ئەوە شتێکی ترە. بەڵام لێرەدا لام باشە ئەوەش بنووسم کە ئەو مامۆستایەم –لە ڕێگەی خەباتدا- ئەوە شەهید جەمال حەیدەری بوو کە هاوینی ١٩٥٢ یەکەم جار لە بەندیخانەی بەغدا یەکترمان دی. بە تەما بووم کە بەربووم چیرۆکەکانم بکەم بە کوردیو بڵاویان بکەمەوە. بەڵام وا ڕۆیشت..

دانیشتنی ئەو دوکانە لەبەرئەوە شوێنی لە بیرو یادگارمدا هێشتۆتەوە، چونکە وەك قوتابیی شەو لە ریزی لە خۆم گەورەتردا دادەنیشتمو گوێم دەگرتو فێردەبووم. دوو هاوەڵی خوێندنی شەوم کاك بەهجەت محەمەد بابان –حاکمی کۆچکردوو و محەمەد مستەفا وەستا ئەحمەد- پارێزەر لە دانیشتوانی

هەمەڕۆژە بوون. بێجگە لە کۆچکردووان: ئەحمەدی شێخ حەسەن‌و ڕەئوف عەلی ئەفەندیی حاجی ئەمین کە لە تێکۆشەرە دیارو دڵسۆزەکانی ئەو سەردەمە بوون.

## ١٩٥١/٣/١٧.. بەرەو بەندیخانە

نیوەڕۆی ئەم ڕۆژە لەتیفم دی، بڵاوکراوەیەکی حیزبی دامێ، دەمەو عەسر چوومە ئەو چاپخانەیەی کاک ڕەوف سەعیدی فەتاح کە لە سووچێکی نزیك پۆستەخانە بوو، لەم دواییەدا بووبوو بە کتێبخانەی زێوەر. چونکە قوتابخانەی ناوەندیی شەو لە مەکتەبی گۆیژەی (ڕۆژ)دا بوو —کە ئێستا بازاڕەو تەواو بەو بەر ئەو چاپخانەیەوە بوو. زۆر کات لەوێ دادەنیشتین تا کاتی خوێندنی شەو دەهات.

زۆری نەمابوو بۆ هەستان. لەگەڵ چەند کەسێکدا دانیشتبووین خەریکی قسەو باس بووین. لەسەر مێزێك دانیشتبووم پشتم لە دەرگای چاپخانەکە بوو، لە پڕ یەکێك لە پشتەوە دەستی دایە قۆڵم. ئاوڕم دایەوە (....) بووە کە ئەو دەمە ڕەئیس عورەفای ئەمن بوو، دووهەم کەس بوو لە ئەمنی سلێمانیدا کە ستافەکەی بریتی بوو لە قۆمیسەرێك‌و ئەوو چەند پۆلیسێك کە جاسووسەکانیان پێ دەوتن‌و بۆ پەرلە دەوترا (سیخوڕەکان) کەچی وا ئێستا سیخوڕ خراوەتە ناو فەرهەنگی کوردییەوەو جێی وشەی جاسووس یا خەفیەی ناو کوردی پێگیراوەتەوە (ئێمە لە بەرامبەر ئەوەدا وشەمان نییە: چەند مانام لایە کە لە کوردیدا بەرامبەریان نییە- ئەوە کەرەسەی وتارێکە لەبەردەمدایە).

دەعە.. کابرا ووتی: هەستە — قۆڵمم لەدەست بەرەدا ڕووم کردە وەجاخی چاپخانەکە، بەڵکوو لەوێوە دەرچم‌و ئەوی لە گیرفانمدایە فرێی بدەم. وەجاخەکە دەرگای بۆ دەرەوە نەبوو. فڕێدانی لەوێدا لەوانە بوو ببێتە هۆی گرتنی خەڵکیتر، لەبەرئەوە لام باش بوو هەر بە خۆم بگیرێ. کەسیش لە دانیشتووان هەڵنەسا.

لەبەر دەرگای چاپخانەکە دایمە دەست پۆلیسێکی ئینزیبات‌و وتی: ئەمە بەرە دەست (نایل بەگ)[٣٦].

پۆلیسەکە لە هیچ نەدەگەیشت. بە دەم ڕێوە دەیووت: هیچ نییە ئێستا (معاون) بەرت ئەدا. مەبەسی ئەو معاونی پۆلیسە بوو، کە دراوسێمان بوو. ئەوسا بەڕێوەبەری پۆلیس هەردوو معاونی هەبوو.

حەوشەی ئەوسای سەرا باخچە بوو. بە هێواشی هەنگاوێك دووای پۆلیسەکە ڕۆیشتم‌و بلاوکراوە یا (بەیانەکە)م فڕێدا. (موفەکەرە)یەکی گیرفانم پێبوو، بە خەیاڵی ئەو تەمەنە هەندێ شتی ڕۆژانەم نووسیبوو. جۆرە شفرەیەکم بۆ خۆم دروستکردبوو هەندێ وشەم پێ نووسیبوو، هەوڵم دا فڕێی دەم، بەلام وام هات بە بیردا کە ئەناسرێتەوە. لە دڵی خۆمدا وتم: هیچی وای تێدا نییە، با پێم بگیرێ باشترە.

بردمیانە ژوورێکی تەنیشت (گرتووخانە- تەوقیف)ەکەی ئەوسای سلێمانی کە لە بینای پشتەوەی سەرادا بوو. کۆمەڵێك بە پێیەوە وەستابوون. زەلامێکی زلی سوورکەلە لەسەر مێزێك دانیشتبوو. (حازم) ناوێکی مووسڵاوی کە ئەوکاتە قۆمیسەری ئەمن بوو. پێی ووت: من ناوم چییە. بەو باسانەی بیستبووم‌و بە قسەکەی (...)دا زانیم ئەوە (نائیل)ە. ووتی: وەرە پێشەوە، چوومە بەردەمی. وتی: نا، وەرە تەنیشتمەوە. چوومە تەنیشتییەوە. پرسیی: حەسەنی شێخ سەعید دەناسی؟ وتم: بەڵێ. نەختێ گەشایەوە، پرسیی: چۆنی دەناسی؟ وتم: لە قوتابخانە لەگەڵماندا بوو. وتی: ئەی لە حیزبدا ووتم: ئاگام لە هیچ حیزبێك نییە‌و لە هیچ حیزبێکدا نیم.

---

٣٦-نائیل عیسا، دووەم کەس بوو لە ئەمنی عێراقدا، کە (تەحقیقاتی جینائیان) پێدەووت. خۆی هاتبووە سلێمانی بۆ گرتنمان. زۆر دڕندە بوو، لە ڕۆژی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨دا گیرا. هەر ئەو ڕۆژە دڵی تەقی‌و مرد.

ووتی: دەسەبرکە چێی لەسەر نووسیوێت: لاپەڕەی فایلێکی هەڵدایەوە بە خەتی درشت ناوی من نووسرابوو، لە ژێریدا نووسرابوو: لە جەماعەتی (پارتییەکان) بوو، هاتەلای ئێمە، من پالأوتم بۆ ئەندامێتیی حیزب، وەرگیراو زۆر چالاك بوو.. هتد.

ووتم: هەمووی درۆیە، لە هیچ لایەك نەبوومو نیم- جا لە ڕاستیدا وەك لەمەو بەر باسم کردووە ئەو منی نەپالأوتووە. جارێك ڕێکخەرەکەم بە سەفەر ڕۆیشتبوو، نەمدەزانی دێتەوە یا نا، ئەو دابڕانە بۆ ئەو سەردەمە زۆر ناخۆش بوو، دەمزانی حەسەن لە حیزبدایە، نامەیەکم دایە گەیاندیو وەلأمی بۆ هێنامەوە کە مەوعیدێکی تێدابوو.

نائیل بە (حازم)ی ووت، لەشی بگەڕێو ببیە توقیف بۆ لای ئەوانی تر. کە گەڕا (موفەکەرە)کەی لە گیرفانم دەرهێنا، کە شفرەکەی دی پرسی: ئەمە چییە؟ وتم: هەروا خەت کێشانە لە خۆمەوە بۆ بێکاری کێشاومە. لەپڕ ووشەی (الوثبة الوطنية المباركة)ی دی بە گاڵتەپێکردنەوە خوێندییەوە، منیش بە جۆرە تووڕەییەکەوە ووتم: نعم الوثبة الوطنية المباركة. هەر ئەوەندەم زانی ئەفەندییەك کە دووایی زانیم معاونێکی ئەمنەو لەگەڵ "نائیل هاتووە، لە پشتەوە ڕایکێشامو دامیە بەر شەقو شەقازللە تا کەوتمو بە لەقە هاتە سەر ورگم تا ماندوو بوو. پەلیان گرتمو بردمیانە ژوورەوە کە دیم کاك بەهجەت بابانو کاك محەمەد مستەفا لەوێن. کە دەموچاویان دیم پرسییان، بۆم باسکردن کەوتنە ورە بەرزکردنەوەم، منیش بە خەیاڵی خۆم دەبوو من ورەی ئەوان بەرز بکەمەوە. تومەز ئەوانیش حەسەن لە خۆیەوە کردبوونی بە لێپرسراوو جێگری لێپرسراوی سلێمانی- کەوا نەبوو.

وورده ورده هاتن: لە پەنجەرەوە چاومان لێبوو کێ دێنن.

لەوانەی هێناین، تەنیا یەکێکیان نەهێنایە لای ئێمە. بۆ سبەینێ بەرەو کەرکووكو بەغداش لەگەڵ ئێمە نەبوو. تا لە ئیستگەی شەمەندەفەر دیمان لە

فارگۆنێکی تر دایانبەزان‌و بە جیا سواریان کرد بەرەو (تەحقیقات). تومەز هەر یەکسەر ڕووخابوو. شەو ئێمە بووین بە پانزدە کەس بۆ بەیانی سواری پاسیان کردین بەرەو کەرکوک، دوو دوو دەستمان لە کەلەپچەدا بوو:

-من‌و کەمال فوئاد تا بەغداش پێکەوە کەلەپچە کرابووین. ئەوانی تر: بەهجەت بابان، محەمەد مستەفا، لەتیف ئەحمەد، سەید تاها جەلال، محەمەد فەرەج، مستەفا عەبدولڕەحمان، کەریمی ڕەشید ناسك، قادری شاگرد خەیات، عەبدوڵلای لاستیك بڕ (پێنجوینی).

لەتیف هەر هاتە ژووری تەوقیف بە چرپە ووتی: خەمی بەیانەکەم بوو، ووتم: مەترسە فڕێمدا.

پاش چەند مانگ کە بەربووین هەر لەسەر جادە تووشی (....) بووم، پێی ووتم: لە بەغدا ڕەفیق چالاکیان بانگکردبوو تا شفرەی ناو موفەکەرەکەت بکاتەوە. پێی ووتبوون نە شفرەیەو نە هیچ، هەر خەتەو یاریی منداڵانە. (ماڵی ئاوا).

بەڕێوەبەری پۆلیس کابرایەکی سامەڕایی بوو –بەیانی کە دەیانبردین حازم پێی وتبوو: ئەو کوڕەی مەلا مستەفا زۆر منداڵە، بەشکم بە (نائیل بەگ) بڵێیت بە کەفالەت بەریبدەن‌و نەیبەن بۆ بەغدا. ووتبووی: وس بە، مەلا مستەفا خۆیشی شیوعییە.

پاسەکە لەبەر سەراوە کەوتەڕێ. کە لەبەر گەراجی فەرەجە فەنیدا ئەختێك وەستاو خەڵك سەیری ئێمەیان دەکرد کە لەناو کۆمەڵێك پۆلیسدا لەو پاسە تەختە گەورەیەدا دانیشتبووین. یەکسەر پێکەوە دەنگمان بەرزکردەوە:

ئازادیخوای کوردین ئێمە
شورەی پۆڵاو بەردین ئێمە
باررووت‌و قورقوشم‌و پۆڵا
گوللەی زۆرداری ناقۆڵا

زنجیری سەد بەندیخانە
شمشێری(١)[٣٧] دەستی بێگانە
یەك زەرە كارمان تێناكا
تەركی ڕێگامان پێ ناكا
گەر مردووین لەم ڕێگەوبانە
نابین بە پیاوی بێگانە
ناوی ترسانن نازانین
چونكە خاوەنی ئیمانین

خەڵكەكە وڕ بوون، دیاربوو لە پاش ڕاپەڕینی كانوونەوە ئەو سروودەیان بە ئاشكرا نەبیستبوو (لەوە دەچوو پۆلیسە كوردەكانی لەگەڵماندا بوون ئەوانیش پێیان خۆشبووبێ). لە شار چووینە دەرەوە، ڕێگەی كەركوك بە پاس دوور بوو، ٧-٨ سەعات دەبوو، دەمەو عەسر براینە كەركووك یەكسەر بردیانینە گرتووخانە، كە بەرامبەر پردی دووەمی ئێستا بوو (كە ئەوسا نەبوو).

زۆربەی گرتووخانەو بەندیخانەكانی سەردەمی نووری سەعیدم بە گیراوی یا بە سەردانی گیراوەكان دیوە. بەڵام هیچیان وەك ئەو گرتووخانەیەی كەركووك تاریكو نووتەكو سامناك نەبوون. شوێنێكی گەورەو پانو پۆڕ، بەڵام ناوەوەی هەموو تاق تاق بوو، لەو جۆرە تاقانەی لە كەركووك بە گەچ دەكرێن. بەڵام كۆنیو پاكو تەمیزی ڕانەگرتنی ئەم گرتووخانەیە هەموو ئەو تاقانەی ڕەشو چڵكن كردبوو. گەلێك خەڵكی تێدابوو، بەڵام چاو چاوی نەدەدی. ئێمە پاشنیوەڕۆ گەیشتین كەلەپچەكانیان كردەوەو فڕێیان داینە ژوورەوەو هەموو پێكەوە لەسەر ئەو ئەردە پیسە دانیشتین. خۆمان كەمێك خواردنمان پێبوو كە لە سلێمانییەوە هێنابوومان، پێكەوە خواردمان، لە بیرم نییە كە زۆر تێكەڵی

---

٣٧-كردبوویان بە (ڕەشاشی).

گرتووەکانی تر بووبین، کە دیاربوو زۆربەیان لەسەر تاوانی ئاسایی گیرابوون. ئەو سەردەمە شەمەندەفەری نێوان بەغداو کەرکووك لە سەعات نۆی شەودا دەجوولا، لە هەردوو سەرەوە وابوو، شەمەندەفەری دوو سەرە لە قەرەغان (جەلاولا) بە یەك دەگەیشتن. ئەوی بۆ خانەقینیش بچووایە لەوێ دادەبەزیو دەچووە شەمەندەفەری تایبەتیی خانەقینەوە.

ئێمە کە خۆمان دەچووین بۆ بەغدا، هەر دەبوو سەر لە ئێوارە بە عەرەبانەی دوو ئەسپی بچین بۆ ئێستگەی شەمەندەفەر. تا لە فارگۆنێکدا جێگە بگرین. چونکە ئەوەی بە دەرەجە یەك یا دوو نەڕۆیشتایە، دەبوو بە دەرەجە سێ بڕۆیشتایەی کە زۆر قەڵەباڵغ بوو. بەڵام ئەم جارە ڕەنگە دڵمان بەوە خۆشبووبێ کە زۆری نەمابوو بۆ جووڵاندنی شەمەندەفەر دوو دوو کەلەپچەیان کردین‌و بە پاس بردیانین بۆ ئێستگە. جێگەگرتنی نەدەویست، چونکە یەك فارگۆنی تەنیایان بۆ ئێمەو پۆلیسە پاسەوانەکانمان گرتبوو. هەریەکێ لە کورسییە تەختەڕەقەکان جێی دوو کەس بوو، جێگەیەکی بەتاڵ بە پشتی کورسییەکەوە بوو، بە کەلەپچە بە پێیانەوە بەستینەوە.

ئەمجارە، من‌و کاك کەمال (د. کەمال فوئاد) پێکەوە دانرابووین. پاش ماوەیەك کە شەمەندەفەر جووڵا پۆلیسەکان کە هەر ئەوانە بوون لە سلێمانییەوە لەگەڵمان نێررا بوون کەلەپچەکانیان کردەوە. دەستمان ئاسوودە بوو، ئێمە بە هەمووومان نیوەی فارگۆنەکەمان پڕ نەکردبووەوە. پۆلیسیش ڕێی نەئەدا کەس سەرکەوێت. تەنیا لەو سەرەوە هەر پیاوێك بە کەواو چاکەت‌و جامانەوە دانیشتبوو، بە جلەکانیدا لە کوردی کەرکووك دەچوو. کابرا کەوتە خزمەت کردنمان. چوو چاگێڕێکی هێنا کە بە ناو شەمەندەفەردا دەگەڕاو بە دەم چا فرۆشتنەوە هاواری دەکرد (چای.. مال حسن عراقی) — (عەینەکە بە بۆر- ضمەوە- نەك بەژێر- کەسرە). چەند ڕیز چامان خواردەوە. لە ڕێگە لە یەکێك لە ئێستگەکان- وابزانم (تووز) بوو، کابرا چوو خواردنی بۆ هێناین. ئیتر

لە هەر ئێستگەیەك كە شەمەندەفەر بوەستایەو بیزانیایە شتێك دەست نەکەوێت دەچوو دەیکڕیو پۆلیسەکانیشی بێ بەش نەدەکرد. ئێمە یەکەم جارمان بوو لە زۆر شتمان نەدەزانی. بەڵام برایان: بەهجەت محەمەد بابانو محەمەد مستەفا بە چرپە دەیانوت ئەمە (ئەمن)ەو لەگەڵمان نێرراوە. هەرچەند دەچووە خوارەوە. ئەمان بە دەنگی بەرز دەیانوت: کابرا مەسرەفی گرانبوو، لیستەکەی بەرز بۆوە. بە ڕاستی زۆری بۆ کردینو زۆر خزمەتی کردین. تا نزیك بەغدا، لەوێ پۆلیسەکان سوپاسیان کردو داوایان لێکرد بچێتە ناو ڤارگۆنێکی تر. ئینجا زانیمانو ناسیمان —تومەز ئەمە برا گەورەی هاوڕێیەکی خۆمانە، کە ئەو جارەش پێش ئێمە گیرابۆوەو تێکۆشەرێکی بەردەوامو ئازا بوو، لە ١٩٦٣دا بە دارا کرا. کابرا ئەو سۆزە وای لێکردبوو. پارە بدات بە پۆلیسەکان لەگەڵ ئێمەدا جێی بکەنەوە بۆ ئەوەی خزمەتمان بکات. ماڵی ئاوا. بێگومان ئێستا ئەماوەو ناوی ناهێنم. ئەك هەندێك بڵێن: ئەو دوو برایە ڕاستیان کردووە. لە شتە خۆشەکانی ئەو جارە ئەوە بوو. بە دەم ڕێگەوە خەڵك لە شەمەندەفەردا خەوی لێدەکەوت. زۆرجار لە وەستاندا لەو ئێستگە زۆرانەی ڕێگا خەبەرت دەبۆوە. هەر لە پۆلی سێیەمی سەرەتاییەوە لە دەرسی جوگرافیادا. ناوی ئێستگەکانی شەمەندەفەریان پێ لەبەر کردبووین.

کە لە قەرەغان (جەلاولا) وەستا. منو کاك کەمال بە خەبەر بووین، سەیرمان کرد، برادەرەکانمانو پۆلیسەکان نووستوون. من پێشتر بەغدام دیبوو، دەمزانی شەمەندەفەری هەردوو سەرپێکەوە دەگەنو ئەوەی دەچێ بۆ خانەقین دەچێتە ناو ئەو ڤارگۆنانەی خانەقین. وەستانی قەرەغانیش لە هەموو شوێن زیاترو نزیکەی سەعاتێکە.

ووتم: کاك کەمال فرسەتە هەموو نوستوون ئەچینە خوارەوە ڕازی بوو، کەس ئاگای لێنەبوو. چایخانەو لۆقەنتەی ئێستگە کە گەڕاینو سەیری شەمەندەفەری لە بەغداوە هاتوومان کرد. ناسیاوی تێدا نەبوو.

نازانم بە گاڵتە یا بە ڕاست بە کاك کەمالم ووت: ئەزانی دەتوانین هەر سواری شەمەندەفەرەکەی تر ببین‌و بگەڕێینەوە کەرکوك نە کەس پێی دەزانێ، نە دەمان گرنەوە. بەڵام ئیتر خۆمان بشارینەوە، بە واتەی ئەو کاتە (موختەفی) بین. ڕەنگە نەزانم یا نەڵێم وەڵامەکەی چی بوو، بەڵام خولاسەی ئەوە بوو کە ڕاکردن‌و خۆشاردنەوە بە بڕیاری حیزب دەبێ. منیش نە کادیر بووم، نە پێشکەوتوو تا حیزب ئەرکی خۆشاردنەوەم بکێشێ‌و ئەوەندە پێویستی پێم بێت.

شەمەندەفەری جارانی بەغدا لە دوو ئێستگە دەوەستا. یەکەمیان (بابولشەیخ) دووایی دەجووڵا بەرەو (بابولموعەزەم). ئێمە کە گەیشتینە بابولشێخ، دیمان چەند کەسێك بە جلی سویل (مەدەنی)یەوە هاتنە بەر فارگۆنەکەی ئێمەو بە پۆلیسەکانیان ووت کە دامانگرن. تومەز ئەمانە لە (تەحقیقاتی جینائی- ئەمنی عامە)وە هاتوون، پۆلیسەکان پێش گەیشتنە بەغدا کەلەپچەیان کردبووینەوە. دوو دوو هاتینە خوارەوەو کۆمەڵێك تاکسییان ڕاگرتبوو، سواریان کردین‌و بەرەو (تەحقیقاتی جینائی)یان بردین، کە لە نزیك تۆرزدی باگی کۆن، لەو سەر ڕووباری دیجلە بوو، پشت ئەو شەقامەی لە مەودووا (شارع النهر)یان پێ دەووت. ئێمەیان بردە ژوورێکەوە، کە دەرگای شیشی هەبوو. پاش چەند دەقیقە بە کەلەپچەوە، دوو پۆلیسی تر (ر. ع)یان هێنا. ئێمە لە سلێمانی لە ژووری گرتووخانەکەدا بووین، چاومان لێبوو کە ئەویانبردە لای (نائیل)، ئیتر نەیانهێنایە لای ئێمە. نە لە سلێمانی‌و نە لە شەمەندەفەردا نەماندیبۆوە. کە ڤۆمیسەرێکی ئەمن پرسیی، یەکێك ووتی (معترف- واتە شتی ووتوە). ئیتر دیاربوو دان پێنانی ئەو بووبوو بە هۆی ئەوەی چەند کەسیتر بگرن‌و ڕۆژی دووایی بیانهێننە بەغدا، هەروەك شایەتی لەسەر کاك کەمال‌و کاك لەتیف بوو بە دوو. دووایی لە گرتووخانەی گشتی (الموقف العام) چەند برادەریتریان هێنا کە لە بەغدا گرتبوویانن. وەك: جوانەمەرگ حەسەن تۆفیق‌و مستەفا ساڵح کەریم.. هتد. بەڵام دووایی ح (ر..) و ح (ح. ش.

س) یان هێنایە گرتووخانەی گشتی‌و لەوێ پەشیمان کرانەوەو لە بەردەمی داداگادا ئەوەیان دەرخست کە بە زۆر ئیعترافیان پێکردوون‌و شایەتییان نەدا.

ووتم: بردیانینە تەحقیقاتی جینائی، تا نیوەڕۆ لەوێ بووین، دووای نیوەڕۆ هەر پانزەمانیان بردە گرتووخانەی (عەبباخانە).

گرتووخانەی (عەبباخانە) لەناو مەرکەزی پۆلیسی عەبباخانەدا بوو لە گەڕەکی (مورەبەعە)ی بەغدا، هەر پشت گازینۆی (مورەبەعە) بەرامبەر بە مزگەوتی سەید سوڵتان عەلی. گرتووخانەکە سێ ژوور بوو، یەکێکی زۆر بچووك بە جیا لە دووانەکەیتر، لە ڕێوەبردیانینە ئەوێ، ووتیان: جارێ دانیشن تا جێگەتان لەودیو بۆ چۆڵ ئەکەین. بە حاڵ جێی بە چیچکانەوە دانیشتنمان لای ئەو دوو کەسە بۆوە کە لەو ژوورەدا دانرابوون. خۆمان پێشکەش کردن، ئەوانیش خۆیان پێشکەش کرد. (صاحب..) سەرۆکی کرێکارانی چنینی کازمیەو (ئیبراهیم..) سکرتێری ئەو نەقابەیە کە هەردووکیان پاش مانگرتنی کرێکارانی کارگەی چنین گیرابوون. بە درێژی باسی (نەقابە) و (مانگرتن) و سووتاندنی مەڵبەندی نەقابەیان لە لایەن پۆلیسەوە بۆ گێڕاینەوە. ئەو باسانە بۆ زۆربەمان تازەو خۆشبوون. بە تایبەتی کە باسی سووتاندنی کورسی‌و مێزو ڕایەخی مەڵبەندەکەیان دەکرد دەیانووت: (العمال (مثل الورد) اجتمعوا وجمعوا فلوس واشتروا اثاث جديد- واتە: کرێکارەکان (وەك گوڵ) کۆبوونەوە، پارەیان کۆکردەوەو کەلوپەلی تازەیان کڕی). تا چەند ڕۆژ ئێمە لەناو خۆماندا هەر دەمانووتەوە. (مثل الورد) دیارە ئەو وشانە بۆ ئێمەی ئەوسا دوور لە عەرەبی تازە بوو.

پاش چەند سەعاتێك گواستینیانەوە ژووری ئەودیو تەماشامانکرد دوو ژوور بە بێ دەرگا لە یەکدراون. ئێمەیان بردە ژوورە بچووکەکەو ئەودیو پڕبوو لەو گیراوانەی لەسەر شتی دوور لە سیاسەت گیراون. کاك بەهجەت‌و سەید تەها کە کۆنە حەپسیان دیبوو جێگەیان دابەشکرد هەریەکە نوێنی

خۆی ڕاخست (دیارە هەر لە سلێمانییەوە نوێنمان هێنابوو). دیمان هەرجێی ١٠ کەس دەبێتەوە. بڕیاردا بۆ شەو دە کەس بنوون‌و هەر سەعاتە یەکێك لەناو دەرگاکەدا بە پێوە بێت. هەم ئاگادارو هەم ١٠ کەسەکەیتر دەتوانن بێ ئەوەی لنگیان درێژ بکەن. بنوون. نەخشەی خەفەریش دانرا. وا کرابوو هەموو شەو وەك یەك نەبێت. ژوورەکەی ئەودیو بۆگەنێکی زۆری لێهەڵدەستا. چونکە چوونە دەرەوە بۆ ئاودەس لە شەوو ڕۆژێکدا یەکجار بوو. ئەوان گوێیان نەدەدایە هەر لە ژوورەکەدا میزیان دەکرد. یەکێ لەو جاجمانەی لە سلێمانییەوە هێنابوومان کرا بەپەردە لەنێوماندا. بەڵام ئەمە لە ئەسپێ‌و تەختە کالۆسی ڕزگاری نەکردین. لەش بە تەواوی دەخورا. کە باوکمان (بە تایبەتی باوکی من‌و باوکی دوکتۆر کەمال) چووبوونە لای جەمال بابان (وەزیری داد) و ئەو تەلەفوونی کردبوو، ئیتر ڕێگایان دەدان هەموو ڕۆژێ لەودیو پەنجەرەکەوە بمانبینن‌و خواردن بۆ هەمووومان بێنن. داوای دەرمانمان لێکردن. وابزانم کیسەیەك (D.D.T) بوو بۆیانهێنایین، ئەماندا لە لەشمانەوە. پێش چوونە دەرەوە بۆ دەست‌و دەم‌و چاوشتن هێرشێکی خۆدۆزین‌و ئەسپێ کوشتنمان دەکرد. کەمێك باشبوو، لەمەودووا کە دیوانی (نازم حیکمەت)م خوێندەوە دیم هەر بە شیعر دادو بێدادی بووە لەدەست ئەسپێی بەندیخانە، بەڵام باسی تەختە کالۆسیی نەکردووە کە چۆن لەشی دەخوارد.

ڕەحمەتی مستەفای حاجی ئەوڕەحمان، دەنگی زۆر خۆشبوو، گۆرانیی بۆ دەوتین. بە تایبەتی بە ئاوازێکی خۆش شیعرەکانی بێکەس (سەدەی بیستەمە کوردە غیرەتێ)ی دەوت. کە تا ئێستا نەمبیستووە تۆمار کرابێت.

کاك مستەفا زۆر قسە خۆشیش بوو. ڕۆژێك ووتی: مژدە چاری تەختە کالۆسیم دۆزیوەتەوە.

-چۆن..

-ئەمشەو کە خەفەر بووم ئێوە نوستبوون سەیرم دەکردن (چونکە چرا نەدەکوژێنرایەوە)، دیم هەموو تەختە کالۆسییەکان لە لەشی (....)وە دێتە دەرێ. یا داوا لە پۆلیسەکان بکەین مەنجەڵێك ئاوی کوڵاومان بۆ بێنن، لەوێدا ئەو بکوڵێنین ئیتر ڕزگارمان دەبێت. ئەو برادەرەش تووڕە دەبوو، گوێی لە جنێودان نەدەگردەوە. دیاربوو مستەفاش ئەوەی پێخۆشبوو.

*نەورۆزی ١٩٥١*

لەمەوپێش باسی ئاهەنگەکانی نەورۆزم لە وڵاتدا کرد. بەڵام ئەم نەورۆزە جیایە. ئەوەتا لە کونی گرتووخانەیەکی تەسکدا بووین. بە بەرنامە بێت یا بێ بەرنامە پێکەوە دانیشتین‌و کەوتینە باسی نەورۆز. پێش گرتنمان وتارێکم نووسیبوو ناردبووم بۆ ڕۆژنامەی (العالم العربی) بڵاوکرابۆوە. بە خوێندنەوەی ئەوە دەستمان پێکرد. هەموو سەیری یەکیان دەکردو دەیانوت: جوان نووسراوە، کێ نووسیویەتی؟

من‌و لەتیفیش سەیری یەکماندەکرد- ئەو پێش ناردنی دیبووی. بەڵام نە مـن ووتم: مـن نووسیومەو نە ئەو ووتی: وەك ئەمەش (بە تێگەیشتنی ئەوسامان) نهێنیی حیزبی بێت. پاش ئەوە دەستمانکرد بە گۆرانی ووتن.

دەنگی گۆرانی ووتن بەرزبۆوە لای پۆلیسەکان سەیر بوو، پێشتر شتی وایان لە گرتووخانەدا نەبیستبوو. عەریفەکەیان کە ناوی سەعدوون بوو هاتە بەردەمی دەرگاکەو کەوتە جنێودان، نازانم بۆ لەناو هەمووانـدا مـن بۆی هەستام‌و قسە لە من‌و قسە لەو پێم وت: حەیوان.. هەر ئەوەم لە دەم هاتە دەرەوە پـۆلیس دەرگایـان کـردەوەو ڕایانکێشـامە دەرەوەو کەوتنـە لێـدانم. برادەرەکانم‌و دوو هاوڕێ نەقابیەکە لەودیوەوە کەوتنە هاوارو دەرگا ڕاوەشاندن. (موعاونی پۆلیس- گەورەی مەرکەزەکە) لە قاتی دووەم بوو، دەنگەدەنگ هێنایە دەرەوەو بانگیکرد: ئەوە چییە بیهێنن بە پاڵ بردمیانە سەرەوە. لەبەر دەرگاکەدا پرسیی چییە؟ پۆلیسێك وتی: (بیگ- عریف شکوبراته هو یگوله حیوان) واتە: بەگم عەریف چەند گەورەیە ئەو پێی دەڵێ: حیوان.

خوا هەڵناگرێ معاونەکە کە ناوی (حەکیم) بوو بە ڕێزەوە بردمییە ژوورەکەی خۆی‌و پرسیی: گوڕم مەلەسە چییە. میوانێکی ئەفەندیی هەبوو، دیاربوو خوێندەوار بوو. باسی نەورۆزم بۆ کرد کە ئەمە جەژنی ئێمەیە. ئێمە ئەوە نین کە ئەو عەریفە وامان پێ بڵێ- لەو ژوورەدا (باسی ژوورەکەم کرد، لە ڕۆژنامەیەکدا باسی ئەو جەژنەمان خوێندەوە، کەوتینە وتنی سروودی نەورۆز، تا دەرگای ژوورەکە لە گەڵما هاتە دەرەوەو بە عەریفەکەی وت: بە ڕێزەوە با بچێتەوە ژوورەکەو با جەژنی خۆیان بکەن. تومەز ئەوان فەلاقەو داریان بۆ حازر کردبووم. کە هاتمە خوارەوە عەریفەکە دەستیکردە ملم‌و چوومەوە ژوورەوە بۆ خزمەت تەختەکالۆسی.

ئەو گرتووخانەیەی عەبباخانە- کە جارێکیتریش ساڵی ١٩٥٣ دیمەوە شتێکی سەیری هەبوو. شەو درەنگ هەر ئەوەندەمان دەزانی گیراویان دەهێنا، کە زۆریان لە مەیخانەو مەلهاکانی دەوروبەر گیرابوون. لێیاندەدان، فەلاقەیان دەکردن، بەوەی هەردوو قاچیان دەخستنە سەر داری تفەنگێک‌و قایشەکەیان بادەداو بە دار دەکەوتنە فەلاقە، واتا بە دار بە بنی پێدا دانیان. دووایی بۆ ئەوەی بنی پێیان نەئاوسێت بە حەوشەی مەرکەزەکەدا بە زۆر دەبوو ماوەیەک ڕابکا، عەرەب وتەنی: (هەروەڵە) بکات. شەو درەنگ ژوورەکەی تەنیشتمان پڕدەبوو. بەیانی کە هەڵدەستاین کەسی تێدا نەماوە. تومەز بێ فەرمانی گرتن‌و بەردان‌و بردنە لای دادوەر (حاکم)، بەریان دەدان. بەڵام ئەمە بە خۆڕایی نەبوو. شتێ پارەیان لێدەسەندن، ئێمە دەمانووت: کرێی ئوتێلەکەیان لێ دەستێنن.

نزیکی پانزە ڕۆژ لە عەبباخانەماینەوە، بەڵام کە کەریم بەگ‌و باوکم هەوڵی بەربوونیان بۆ دەدایەن. جارێ هەوڵی گواستنەوەمان سەریگرت‌و هەر پانزەمان براینە "گرتوخانەی گشتی- الموقف العام" لە بابولوعەزەم. دەتووت براوینە بەهەشت. چونکە زۆر فراوانتر بوو، قاوشەکانی گەورەو فراوانبوون،

حەوشەیەکی گەورەی هەبوو پیاسەی تێدا دەکرا. خواردنیان بۆ دەهێناین دەدرایە دەست خۆمان، واتە: دەست ئەو ڕێکخستنەی پێش چوونی ئێمە هاوڕێکانمان دروستیانکردبوو. خواردنەکە چاك دەکرا. واتە نیسکی بەیانیان ڕۆنو پیازیان بۆ سووردەکرایەوە. یا دۆشاوی تەماتەی تێدەکرا. خۆمان بە کۆمەڵ چامان لێدەنا.. هتد. لە دەریشەوە خواردنمان بۆ دەهات بە کۆمەڵ دەمانخوارد.

من لێرەدا مێژوو نانووسم، بەڵکو یادداشت دەنووسم. لەبەرئەوە بە قووڵیو فراوانی ناچمە سەر باسی ئەو ئەفسەرە کوردو عیراقییانەی لە سوپای عوسمانیدا بوونو هەندێکیان چوونە حیجاز لای شەریفی مەککەو پاشان چوونە سوریەو لە حکومەتەکەی فەیسەڵدا هاوکار بوونو هەر بە هاتنی فەیسەڵ بۆ عیراق یەکسەر یا بەرە بەرە هاتنەوە. لەناو ئەمانەدا هەندێك ئەفسەری کورد هەبوون. هەندێکیش لەوانە پاشتر هاتنەوەو لە حکومەتی کوردستانی جنوبی (هاوکاری مەلیك مەحموود یا شێخ مەحمود) بوون، پاش ئەوەش چوونە ناو حکومەتی عیراقەوەو هەندێکیان تا پلەی وەزیری یا جێگری سەرۆك وەزیران ڕۆیشتن.

مەبەسم لەم پێشەکییە ئەوە بوو کە ناوی هەندێك لەو کەسانەم لەو یادداشتانەدا دێت. پەنجە بۆ هەندێك لایەن ڕادەکێشم کە دەمهێننەوە سەر باسی یادداشتەکان.

ئەوانە هەموو وەزیرو نائیبی ئەو سەردەمە بوونو بە پێی کارەکەیان بەشداری نەخشە بۆ کێشانو بەجێهێنانی سیاسەتی ئەو کاتە بوون. تیاشیاندا هەیە کە بەشداری تاوانەکانی ئەو ڕژێمە بوونو نموونەش زۆرن. بەڵام هەندێکیان لە دوو لایەنەوە خزمەتی گەورە یا باشیان هەیە، بۆ نموونە: ئەمین زەکی بەگ بە باوکی نووسینی مێژووی کورد دادەنرێت. پاش شەرەفخانی بتلیسی ئەو چەند کۆڵەکەی بڵندی بۆ نوسینی مێژووی کورد دانا. هەروەك لە

خزمەتکردن‌و پارمەتیدانی خەڵکدا نموونە بوو و لە بە هاوینەهەوارکردنی شوێنانی وەك: شەقلاوەو سەلاحەدین (پیرمام)دا دەستی یەکەم یا باڵای هەبوو. خزمەتی تۆفیق وەهبی بۆ زمانی کوردی ئاشکراو دیارەو لە پلەی یەکەمدایە. هەروەك لە باسی سەعید قەزازدا ئەو دوو لایەنە دیارەو دەبێ بۆ ئەویش هەردوو لایەنەکە بە جیا هەڵسەنگێنین.

ئەم درێژەیەم بۆ ئەوە بوو، کە لەو جارەی گرتنماندا باسی "جەمال بابان" بکەم، کە وەزیرو سەردەمێك جێگری سەرۆك وەزیران بوو، ئەو لایەنەی ئەویش‌و هەڵسەنگاندنی دوور لە عاتیفەو خاترانەو بابەتییانەی دەدەمە دەست مێژوو نووسەکانمان. بەڵام بۆ لایەنی دووەم ئەوا ئەویش لەو کەسانە بوو کە بە دەم خەڵکەوە دەچوون‌و لە پارمەتیدان قسووری نەدەکرد.

ئەو جارە وەك وتم: کەریم بەگ‌و باوکم پێکەوە چووبوونە لای‌و باسی ئەوەیان بۆ کردبوو کە ئێمەو کەسانی تر لە گیراوەکان لە دووا پۆلی دوواناوەندین‌و تاقیکردنەوەی بەکالۆریش نزیکە. لەبەرچاوی ئەوان تەلەفوونی هەلگرتبوو بۆ بەهجەت عەتیە (عطیة) بەڕێوەبەری گشتیی ئەمن. لێی پرسیبوو ئەم لاوانەتان بۆ لە سلێمانی گرتووەو بۆ هێناوتانن بۆ بەغدا؟ وەڵامی ئەوە بووبوو کە کەسی تر گیراوەو ئیعترافی لەسەر کردوون. زۆر بە توورەییەوە وتبووی:

-ئیعتیراف‌و میعترافی چی؟ هەموی درۆیە. ئەمانە لاوی کوردن، هەموو ئەم ساڵ خوێندنی ناوەندی تەواو دەکەن، بەرەو پێگەشتن دەچن، ئێوە ناتانەوێ کورد پێبگات. هەتیوێکی سەرسەری دەهێنن، ئیعترافی درۆی پێدەکەن‌و ئەو خەڵکەی پێدەگرن.

ئەم هەڵوێستە وایکرد کە زوو بماندەن بە دادگاو لە پێش تەواوبوونی دادگایی کە مانگی زیاتری کێشا کاك کەمال‌و من بە کەفالەت بەربدەن‌و پاشان بچینەوە بەغدا بۆ ئەو دادگاییە درێژە. کە دادوەر بورهانەدین گەیلانی دادوەری بووو تەواو سەر بە دەستگای ئەمن بوو. یەك یەك ئەو کەسانەیان دەهێنا کە ڕووخابوون.

دادوەر لێی دەپرسین: تۆ شایەتیت لەسەر کێ هەیە. ئەویش ناوەکانی دەووتو یەکە یەکە هەڵدەسێنران و ئەو قسەی خۆی دەکرد.

ئێمە (٨٣) تاوانبار کراو بووین، لەو شوێنانەدا دانیشتبووین کە لە دادگادا بۆ گوێگران دانرابوو.

لەو کەسانەی لەبیرمان و لەناو (٨٣) کەسەکەدا بوون. هاوڕێ کەریم ئەحمەد، شەهید ڕەووف حاجی قادرو کەریمی برای، فاتیح ڕەسوول، جەلال نەجیب (بێتووشی)، عومەر محەمەد ئەمین، محەمەد سەعیدی مەلا عەبباس، جوانەمەرگ حەسن تۆفیق، مستەفا ساڵح کەریم، فەتتاح ڕەشید "بێسارانی"، قادری شاگردی، قادری ڕەشە ناسك، مەجید حەسەن "شەهید"، قریاقۆس خەممۆ، خەلیل عەزیز "بەرگردو"، ئیسماعیل ڕەسووڵ، مستەفای نانەوا "هەولێری"، ڕەووف عەلی ڕەسووڵ، حەسەنی شێخ سەعید شێخ محەمەدی شێخ عەلیی نانەوا، ئەحمەد جەلال تاها، عومەر محەمەد دیلان، عەبدوڵلای شێخ خالیدوعوسمان ئەبووبەکر، خالص جواد.. محەمەد سەعدوڵلا، شێخ ئەنوەر خاڵی (خالص)، زێوەر خەتتاب، کەنعان خەتتاب، مستەفای شێخ عوبەیدوڵلای زێنوێ، محەمەد بەگ (خاوەن چاپخانەی کەرکووك)، ئەحمەد سەعید کۆیی، عەزیز عەبدوڵلا کۆیی، مەحموود تۆفیق عەزیز، حسین حەللاق، جەمیل محەمەد عەلی (مەخمووری) عەلائەدین مەجید خانەقینی، ئەسعەد خدر، حەننا توبیا، جۆرج بۆیە، مەتی فرەنسیس مالیح، عەبدوڵلای ڕەشە خەلیل، ئلیاس حەننا، پەترۆس ماربین، عەبدوڵلا سەید ئەحمەد.

دیارە ئەو پانزە کەسەشی تێدابوو کە لە سلێمانییەوە پێکەوە هێنابوونیان.

ئەوانەی شایەتیان دا "جەرجیس فرەنسیس، ئەندریە فەتتوحی، جان بۆلس، بیلال عەزیز، باهیر عەبدولکەریم بوون.

لە کارە خۆشەکانی ئەو دادگایە.

حەسەنی شێخ سەعیدیان هێنا بۆ شایەتی، چونکە پێشتر ناوی ئێمەی بردبوو. حاکم: لێی پرسی ناوت چییە؟ وتی: نازانم، تەمەنت چەندە: نازانم.. شایەتیت چییە؟ نازانم. حاکم بە تووڕەییەوە وتی: ئەمە ئیفادەی تۆ نییە؟ نازانم.. واتە: تەحقیقات درۆ دەکەن؟

بەڵێ: درۆ دەکەن.

ئەی: دادوەری لێکۆڵینەوە "حاکم تەحقیق" درۆ دەکات؟

-بەڵێ درۆ دەکات.

-سبەینێ بە منیش دەڵێی درۆ دەکات.

-نایخەمە سبەینێ، هەر ئێستا پێت دەڵێم: درۆ دەکات.

حاکم تووڕە بوو، پۆلیسی بانگ کرد دەی جێگەی لەناو گیراوەکاندا بۆ بکەنەوە، هێنایانە ناو ئێمەوەو لە شایەتەوە بوو بە تاوانبارکراو.

حەسەن لەبەرئەوەی حوکمی کۆنی لەسەر بوو، لە سوپاگا (حامیە)ی سلێمانییەوە ڕایکردبوو. لە بەندیخانەی بەغداوە بە بەرگی بەندیخانەی "کانە"وە هێنرابوو. حاکم لە سەرەتادا لێی پرسی: تۆ حەپسیت؟ وتی: ماتشوف بزتی الرسمیة- واتە بەرگی ڕەسمیم نابینی؟ بەرگی ڕەسمی بۆ پیاوە گەورەکانی دەوڵەت بوو. ئەمجارەش دوو ساڵی تری بۆ زیاد کرد.

جارێك باسی زۆر کردارو ڕەفتاری کۆمیدیو ئەمسەرو ئەوسەری حەسەنم بۆ هاوڕێم حسین عارف دەگێڕایەوە. باسی دووا کوشتنی تراژیدیی ئەوم دەکرد- کە بە تاوانی تێکەڵبون لەگەڵ دوژمندا کوژرا- کاك حسین دەیووت: ئەمە بە ڕاستی بۆ قارەمانی چیرۆك دەست دەدا. لە ڕاستیدا ڕۆمانێکی کۆمیدی - تراژیدیی لێدەردەچێ. کام ڕۆماننووس بیەوێ ئامادەی یارمەتیم.

ئەو جاری گرتنە یەکەمجار بوو کاك حسین عارف بناسم، منداڵترین گیراو بوو، لە خانەقینەوە خۆیو عومەری برای هێنرابوون. نازانم لە دادگا لەگەڵمان بوو، یا بە جیا دادگایی کرابوون. هەر لە گیراوەکاندا- کە ئەوانە گیراوی دووا

هێرشی ٤٨-٥١ی بە کۆمەڵبوون بۆ سەر حیزبی شیوعی: دەبێ ناوی حەموود مەلیك ئەلراوی ببەم کە ژیانی "قارەمانانە"ی ئەویش زۆر شتی خۆشی تێدایە، هەر وەك "عەدنان سەید زاهیر ـ ظاهر"ی مەندەلیشمان لەگەڵ بوو.

## قریاقۆس

کە لە گرتووخانەی گشتی بووین، گڵۆپی قاوشەکان بە بەرزی بە بنمیچەکانەوە بوو، بە تەل کیفیان بۆ کرابوو بۆ ئەوەی کەس بە مەبەسی خۆکوشتن دەست بۆ تەلی کارەبا نەبا. برایان کە ئێمە چووین لە کاغەز کیسەیان کردبوو. یەکێك دائەنەوی‌و ئەوی تر دەچووە سەر پشتی بە کیسەکان تەلەکان دادەپۆشران تا تیشکی گڵۆپەکان کەمتر بن. لە پڕ یەکێکیان هێنا ئەوەندە درێژ بوو پێویستی بە کەس نەبوو بچێتە سەر پشتی هەر خۆی کیسەکەی دەخستە شوێنی خۆی. کەواو چاکەتێکی لەبەردا بوو، کڵاوێکی لەسەردا بوو. لە بابەتی مەسیحیەکانی دەوری مووسڵ. بۆی گێڕاینەوە کە لە کەرکووك ئیشی کردووە، (کە گیراوە هێنراوەتە تەحقیقات. لەوێ (ا. ف) ئیعتیراف لەسەر کردووە کە مانگی پەنجا فلسی داوە بە حیزب. کابرایان هێنابووە بەردەمی، کە دیبووی وا ڕووخاوە، ئەم لەو مۆڕ بووبۆوە لێیان پرسیبوو:

-قریاقۆس- انت شیوعی؟ (تۆ شیوعیت)

-نعم انی شیوعی ابن شیوعی (بەڵێ شیوعی کوری شیوعیم،

-لیش صرت شیوعی (بۆ بوویت بە شیوعی؟)

-غیر هذا الکلب ابن الکلب سوانی (چونکە ئەم سەگی کوڕی سەگە کردمی (ئیشارەتی کابرای ڕووخاوی کردبوو).

ئەم قریاقۆسە بەو بەرگانەوە لەگەڵماندا هێنرابووە دادگا، لای دیوارەکەوە دادەنیشت‌و جاروبار دەستی دەخستە سەر گوێی‌و دەینا بە دیوارەکەوەو ڕووی دەکردە دادوەرەکەو دەیگوت:

-استاذ: اني ماسمع زين. (مامۆستا، باش گوێم لێی نییە)

دادوەر خۆی ڕادەگرتو هیچی نەدەوت. کە نۆرەی (ج. ب) هات بۆ شایەتی دان، لەناو ئەو کەسانەدا کە ناوی هێنان بۆ شایەتی لەسەر دان کەریمی حاجی قادر بوو. کەریم بە هێواشی وتی: من ئەم کابرایەم نەدیوە، نەمناسیوە. کاك ڕەووف پێی ووت: جارێ چاوەڕێ بە. نێوان ئەوو قریاقۆس یەك کەس هەبوو. بەڵام بە هێواشی بە کەریمی ووت: تۆ هەقت نییە هەڵەسە. کە دادوەر ناوی دەخوێندەوەو وتی: کەریم حاجی قادر. کەس هەڵنەسا، ئەمجارە بانگی کردەوە. قریاقۆس هەستا. دادوەر لێی پرسی: تۆ کەریمی. ووتی: نەء. ووتی: ئەی بۆ هەستاوی تۆ کێی. ووتی: آنی قریاقوس ابن خمو، ما اخلی کریم یگوم حتی هذا الگواد یجی یشخصه. (واتە: من قریاقۆسی کوڕی خەممۆم، نایەڵم کەریم هەستێ، تا ئەم گەوادە نەیەتو دەست بۆ کەریم درێژ نەکا کە ئەمەیە).

دادوەر تووڕە بوو کەوتە قیزاندنو هەڕەشە بەڵام تازە قریاقۆس قسەی خۆی کردبوو. کابراش کە قسە هاتە سەر کەریم، قسەی گۆڕی، ووتی: من کەریمم نەدیوەو نایناسم. بەڵام لە ڕەووفی برای ئەوم بیستووە، کە کەریمیش لە حیزبدایە (دیارە شتی وا نەبوو). بەڵام هەر ئەمە وایکرد کە قریاقۆس لەسەر مانگی پەنجا فلس دان دوو ساڵ حوکم بدرێت).

هەر لە کاری ئەم دادگایەدا با ئازایەتییەك بگێڕمەوە.

کە (ب) هات بۆ شایەتیو لە ناوەکاندا ناوی کاك "عەزیز عەبدوڵڵای کۆیی" هەبوو. عەزیز هەستاو بە عەرەبییەکی جوان پێی ووت: یانذل، یا حقیر، یا سافل، اني ما اعرفك. واتە: نامەرد، سووكو سەفیل، بێ حورمەت من ناتناسم.

دووایی لە ئێمەی کەم تەمەنیان گەیاند. کە ئەمە هەڵوێستێکی بۆلشویکەکانە بەرامبەر بە خەڵکی ڕووخاو.

کۆمەڵێك پارێزەر بە خۆبەخشی بوون بە وەکیلمانو زۆر شارەزایانەو ئازایانە موناقەشەی شایەتەکانو دادوەریان دەکردو کرداری دەستگای ئەمنیان

ڕیسوا دەکرد. لەو پارێزەرانە سەعدی جەلال، کازم جەعفەر، محەمەد بابانم لەبیرە.

پاش نزیکەی مانگێك لە ڕۆژی ١٩٥١/٦/٤دا بڕیاری دادگا دەرچوو. دیار بوو بڕیارەکان هەر لە "تەحقیقات"ەوە درابوو. بەشێکی زۆر بە دوو ساڵو یەك ساڵ حوکمدرانو هەندێك ئیفراج کرانو بەردران. هەندێك لە ئێمە کە (کاك کەمالو منیشی) تێدابووین. بڕیار درا بە کەفالەتی کەسێك بەردرێین، کە تا ماوەی ساڵێك هیچ شتێك نەکەین، ئەگینا بە پێی ئەو مادەیە پاشان ماوەی ساڵێك بەندی دەخرێتە سەر حوکمی کارە تازەکە. لەبەرئەوە ئێمەشیان لەگەڵ حوکمدراوەکاندا بردە ژووری گرتووخانەکەی دادگاوە.

ئەوانەی بەر ئەم کەفالەتە کەوتبوون کەوتنە خۆیانو هەریەکە یەکێکی لەو خەڵکە زۆرەی لە حەوشەی دادگا چاوەڕێ بوون ڕادەسپارد یا دەیکرد بە کەفیل (باوکی کاك کەمالو باوکم) لە درێژەکێشانی دادگا وەڕس بووبوون گەڕابوونەوە سلێمانی. ئێمەش هەر چاومان دەگێڕا. لەپڕ لەبەر دەرگا شیش شیشەکەی گرتووخانەدا ڕوشدیی ئەحمەد بەگ (شەعید دوکتۆر تۆفیق ڕوشدی) پەیدابوو، کارەکانی ئەو بە پێی میزاج بوو. تێروپڕ جنێوی بە هەردووکمان داو ڕەتی کرد بەرەو حیزبەکەی هەرسێکمان. بەڵام دوایی ووتی: کێتان دەوێ دەهێنێرم ببێ بە کەفیلتان "وەك ڕامانسپارد، سەعاتێکی نەبرد کەریم بەگی زانستی (مامی کاك ڕوشدی) هاتو بوو بە کەفیلی کاك کەمال، مامۆستا عەلائەدین سوجادیش هات بوو بە کەفیلی من، بەردراین.

ئێوارە بەرەو شەمەندەفەر چووین بۆ سبەینێ نیوەڕۆی ٦/٥ گەیشتینەوە سلێمانی. ڕۆژی ٦/٩ تاقیکردنەوەی بەکەلۆری بوو. لەوانەی لە پۆلی پێنجەم بووین. مامۆستا مووسا سەمەد تەنیا کاك کەمالو منی داخلی بەکەلۆری کردبوو.

من یەکسەر بڕیاری خۆم دا. کە بچمە ناو تاقیکردنەوەوە. کاك کەمال لەگەڵم خەریکبوو کە بە ناوی نەخۆشییەوە ئیجازە وەرگرم. بەڵام من بڕیارم

وابوو هەموو ڕۆژێکی پێش تاقیکردنەوە لەو نامیلکانەدا کە پێیان دەووترا "موجەز- کورتە" کە کورتەی دەرسێکی تێدابوو، خۆم ئامادە کەم. ئەگەر ڕۆژێك خراپ بووم ئەوا بیر لەو ئیجازەیە بکەمەوە. ئەوکاتە لە پاش سەرەتایی کوردی خوێندن نەبوو. ڕۆژی یەکەم تاقیکردنەوەی عەرەبی بوو. دەرسی عەرەبی بریتی بوو لە "قەواعید (دەستوور یا ڕێزمان)، ئەدەب، ئینشا )بە زمانی ئەمڕۆ- دارشتن)، ئینجا نصوص- تێکستی ئەدەبی".

قەواعیدەکە هەر خۆم باشبووم. پێشتر لای باوکم چەند کتێبم خوێندبوو. شەرحی سیوطیم لەسەر هەزارە (الفیە)ی ئیبن مالیك خوێندبوو، زۆریشم لە ئەلفیە لەبەر بوو، ئەمەیان هیچ –هەر سەعاتێکی خوێندنەوە دەویست، ئەدەبەکەش هەروا. بۆ (ئینشا)ش هەر خۆم باشبووم. هاوەڵەکانی ئەوسام تا ئێستاش شایەتی دەدەن کە تەنێ لەو دەرسەدا لە هەموویان باشتر بووم. گرانەکە – نصوص-ەکە بوو، چونکە لە تاقیکردنەوەدا پارچەیەك دەستنیشان دەکرا لەو پارچانەی کە خوێندوومانە. ڕۆژی پێش تاقیکردنەوە هەر تەواو ٢٠٠ دێڕم لەبەرکرد و ١٠٠\٢٠ی نمرەکەم دابینکرد. بەڵام سەیر ئەوەیە کە من ئاوساو لەمەو دوواش شیعرم زۆر لەبەرە. کەچی چونکە ئەو شیعرانەم بە بێ ئارەزوو و بۆ تاقیکردنەوە لەبەر کردبوو. هەر لە ژووری تاقیکردنەوە هاتمە دەرەوە هەمووی لەبیرچۆوە. دووەم ڕۆژ –تاقیکردنەوەی ئینگلیزی بوو. خۆم لە ئینگلیزیدا هەر باش نەبووم. بەڵام بە چەند سەعاتێك قەواعیدەکەم خوێندەوە. دوو حیکایەت دەخوێندرا، یەکێکیان.. ڕۆبنسن کرۆزۆ" بوو. بە عەرەبی هەردووکیانم پەیداکردو کۆمەڵێك ووشەی ئینگلیزیشم -ئەوەندەی پەرژام- بە ماناوە لەبەرکرد. ئەوەش دەرباز بوو. دەرسەکانیتریش هەروا. قوتابیەکانی ئەدەبی ئەودەمە لە (ریاضیات- ریازیات)دا کز بوون. بەڵام من ئەو کۆسپەم نەبوو. پۆلی چوارەمم وەك باسم کردووە لە بەشی زانستی (عیلمی) تەواو کردبوو. لەلای باوکم (نامەی حساب-رسالة الحساب)ی بەهائەدینی عامیلیم خوێندبوو، کە هەر حساب نەبوو، بەڵکو جەبرو

مثلثاتیش بوو. سەیر ئەوە بوو لە ریازیاتدا نمرەی باشترم لە دەرسەکانی تر هەبوو. بەو جۆرە چوومە تاقیکردنەوەوە. ئێمە قوتابیی شەو ۲۷ کەسبووین، ۷ کەسمان لێدەرچووو، من دووەم بووم، بەڵام ئەو نمرەیەم نەهێنا کە خەوی چوونە (سۆربۆن)م پێوە دەدی.

باسی "ئیجازە" وەرگرتنم کرد. شتێك هەیە کە دەچێتەوە سەیر یادگارەکانی سلێمانیو لەسەر باری ڕژێمی ئەو کاتەش حساب دەکرێ.

زۆربەی ئەوانەی پزیشکی پەروەردە "مەعاریف" بوون. هەر لە کاتی دەوامدا دوکتۆریان دەکردو پاش نیوەڕۆ "شوێنی نەخۆش بینین- یا عیادە- مطب"ی خۆیان نەبوو. هەر لە ساڵی ۱۹٤٦ەوە دوکتۆرێکی لوبنانی لە سلێمانی دانرابوو. کابرایەکی باریکی درێژ سمێڵێکی قیتی هەبوو، سەری سمێڵی بادابوو بۆ پێشەوە بەهاو تەربیبییەك فێستێکی سووری درێژی لەسەردا بوو، حیکایەت لە بارەی ئەم دوکتۆرەوە زۆرە. بەڵام لێرەدا هەر باسی ئیجازە یا پشوودان دەکەم. پێش تاقیکردنەوە ڕۆژی بە دینارێك پشووی دەدا بە قوتابیان. دوکتۆریان هێنابووە ماڵی "کەریم بەگ". بەو حسابەی کاك کەمال لە بەندیخانە بەر بووەو نەخۆشەو ناتوانێ بچێتە تاقیکردنەوەوە.

پارەی خۆی وەرگرتو ئیجازەی ڕۆژانی تاقیکردنەوەی دایە. ڕوویکردە من ووتی: خۆ تۆش گیرابووی، چۆن نەخۆش نیت؟ ووتم: جارێ باشم. ووتی: ئەگەر هەستت بە شتێك کرد لە هۆڵی تاقیکردنەوەدا خۆت بخە. دێم ئیجازەت دەدەمێ. ئەوەبوو من بە جۆرە تاقیکردنەوەم تەواو بوو. بەڵام کاك کەمال لە دەوری دووەمدا لە یەك دەرسدا بە دوو نمرە کەم مایەوە.

هەرچی دوکتۆرەکەیە –ئەوە بۆ کەرەسەی چیرۆکێك دەست دەدا. تا ساڵی ۱۹٥۱ مایەوە. قوتابییەك لە بەشی ناوخۆی ناوەندی شەو نەخۆش دەکەوێو دەمرێ. قوتابیان دەکەونە هەڵلاو مانگرتن. گوایە دوکتۆر دەرمانی خراپی داوەتێ. تا حکوومەت فریای ئەوە کەوت لە دوکتۆر بپرسێتەوە. ئەو ماڵو

کەلوپەلی پێچابۆوەو گەیشتبۆوە لوبنان. ووتیان: کە لە وەزارەت سەیری دۆسیەکەیان کردبوو، بەڵگەنامەی دوکتۆرییەکەی وەرگرتبووەوە. ئیتر دەیانووت: دوکتۆر نەبووەو سەرتاش بووە. بەڵگەنامەکەی ساختە بووە. گوایە لە لوبنان بینرابوو دوکانی دانابوو.

*بەرەو بەغدا:*

ئەمجارەیان بۆ بەغدا بە ئازادیو بێ کەلەپچە. ئەوسا ئەم "قبووڵی مەرکەزی"یە نەبوو. چەند بەڵگەنامەت بویستایە ئەوەندەیان دەدایتێ. (فۆتۆ کۆپی)ش نەبوو.

ئیتر ئەو شتانەی پێویستبوو بۆ وەرگرتن دەتخستە ناو فایلێکەوەو پێشکەش بەو کۆلێجە یا ئەو کۆلێجانەت دەکرد کە دەتویست تێیدا بخوێنیت.

دۆسیەم پێشکەش بە خانەی بەرزی مامۆستایان کە لە ١٩٥٨دا بوو بە کۆلێجی پەروەردەو بە کۆلێجی بازرگانی کرد. حەزم لە کۆلێجی حقووق (ماف) دەرکد. بەڵام خانەی مامۆستایان- بەشی ناوخۆ (داخلی)ی هەبوو. بە نوستن‌و جل شتن‌و سێ ژەم نانخواردنەوە. کۆلێجی بازرگانیش بەشی ئێوارانی هەبوو. دەتتوانی بە ڕۆژ ئیش بکەیت. لە هەردووکیان وەرگیرام. بازرگانییەکەم پێ باشتر بوو، چونکە دەمویست لەو مووچەیەی وەریدەگرم پارمەتیی باوکیشم بدەم. هەوڵی ئیشم دا. چەند کەسێك پارمەتییان دام. لەوانە کەسێکە کە دەمەوێ ناوی ببەم. قاسم سوهرەوەردی- کە کاتی خۆی لە شەریعە لەگەڵیا بووم قەومیو ئەندامی حیزبی ئیستیقلال بوو زۆر دۆست‌و کوڕی چاك بوو. بردمییە لای فەیسەڵ حەسسون کە سەرنووسەری ڕۆژنامەیەك بوو. ووتی: چەند هەفتەیەکیتر وەرەوە لام. قاسم دڵنیا نەبوو. ووتی: با بچینە (بانقی عەرەبی) لای حاجی نوعمان عانی. لەوێ زۆر ستایشی منی لای حاجی نوعمان کرد. ووتی: سبەینێ وەرەوەو دەست بکە بە ئیش. ئەمەم زۆر لا خۆشبوو. چونکە قوتابیی بازرگانی بوومایەو لە بانق کارم

بکردایە، بۆ هەردوو لام باش بوو. ئێوارە لە چایخانەیەکی ئەعزەمیە لەگەڵ چەند کۆنە هاوەڵێکی شەریعە دانیشتین. ژن برایەکی حاجی نوعمان لەوێ بوو. قاسم سوپاسی حاجیی کرد بۆ ئەو پێشەوازییەی. کەچی کابرا هەر شەو چووبوو لە حاجیی گەیاندبوو کە من کۆمۆنیستم. ئیتر سبەینێ کە چوومەوە، نە سەلامی سەندمەوەو هەر لەناو دەرگاکەدا بووم. ووتی: برۆ.. برۆ.. ئیشی تۆمان لا نییە.

ناچار کەوتمە هەوڵدانیتر. مەلایەك کە ئێستاش ماوە، بردمییە لای هەژاری موکریانی کە لە شەقامی (غازی-کیفاح) ستۆدیۆی ڕەسمگرتنی هەبوو، کە ئیشێکم بۆ پەیدا بکات. من لە ستودیۆکەی مەحموود ئەفەندی کە لەگەڵ کوڕەکەیدا ڕەفیق بووین شتێکم لە کاری فلیم شتنەوەو چاپکردن دەزانی- ووتی: ناسیاوێکم لەوبەر هەیە کاری بە کەسێکی خوێندەوارە- هەم کاتب بێت لای‌و هەم کاری ئەو ووتەنی (عەکاسی)یش بکات. پەیمان وابوو، هەواڵم لای ماموستا بەشیر موشیر بۆ دابنێ. ئیتر وەڵام نەبوو. کە ساڵی ١٩٥٦ لە سوریە لەگەڵ هەژاردا زۆر دۆست بووین ووتی: مەلا تۆی هێنایە لام، تکای لێکردم، بەڵام چرپانیشی بە گوێمدا ووتی: "شیوعی"یە بۆی نەکەیت.. ئیتر ترسام. تا ئێستا نازانم هەژار ڕاست دەکات یا مەلا.

ئیتر بڕیارم لەسەر چوونە خانەی بەرزی ماموستایان (دار المعلمین العالیة) دا. ئەو کاتە هەر کۆلێجەکە خۆی بە پێی لیوا) قوتابی وەردەگرت‌و بە پێی لیوا (پارێزگا) ژمارەی وەرگیراوەکان دەستنیشاندەکرا. ئەوەی بیرمە ئەو ساڵە سلێمانی (کە یەکێك بوو لە چواردە لیواکەی عیراق) چواردە قوتابیی درابوویە، حەوتیان لە بەشی ناوخۆ وەردەگیران، حەوتەکەیتر دەبوو خۆیان بژێنن. بەشی ناوخۆ وەردەگیران، حەوتەکەیتر دەبوو خۆیان بژێنن. بەشی ناوخۆش بریتی بوو لە جێگەی نووستن‌و سێ ژەم خواردن –خواردنێکی باش کە زۆربەمان لە ماڵی خۆماندا نەماندیبوو.

ئێوارە بۆ ڕەوانەکردنی هاوەڵێکم چوومە ئێستگەی شەمەندەفەری بابولموغەزەم کە نزیك کۆلێجی پەروەردە بوو، (دیارە هێشتا وەرنەگیرابووم). لە فارگۆنێکی شەمەندەفەردا چەند کەس دانیشتبوون، تا سەعات نۆ کە کاتی جووڵاندنی شەمەندەفەرەکەیە. هەموو بە قسەوە خەریکبوون. باسیش هەر باسی کۆلێجەکانو مەرجەکانی وەرگرتن بوو.

مامۆستای خوالێخۆشبوو برایم باڵدار لەناو دانیشتووەکاندا بوو. ڕوویکردە منو ووتی:

-تۆ بۆ جێگەی قوتابییەك دەگری. وەرە ڕێگەیەکت پیشاندەدەم یەکسەر لە بەشی ناوخۆ وەردەگیرێیت بێ ئەوەی جێگەی کەسیش بگریتو با چواردەی سلێمانی بۆ ئەوانیتر بێت.

لام سەیر بوو، ووتم: جا چی لەوە باشتر دەبێت، فەرموو وا گوێت لێئەگرم.

پرسیی: تۆ باوکت ئیشی چییە؟

ووتم: مەلایە.

ووتی: کێ هەیە باوکی تۆ نەناسێ. بەڵام ناوونیشانی ئیشەکەی چییە.

ووتم: مودەڕیسە.

-دە باشە. سبەینێ بچۆ لای عەمیدی کولیەکە. بڵێ "ئێوە، کوڕە مامۆستاکان- ابناء المعلمین" بێ سرەو جیا لە قوتابیان یەکسەر وەرئەگرن. منیش "کوڕە مامۆستام" ئەگەر ووتی: باوکی تۆ سەر بە مەعاریف "پەروەردە" نییە. بڵێ: باشە، یەکێك باوکی لە ناوەندیی کشتوکاڵ مامۆستا بێت (ئەو کاتە کۆلێج نەبوو) یا لە کۆلێجی پۆلیس یاسا بڵێتەوە وەریدەگرن، خۆ ئەمانەش سەر بە پەروەردە نین.

بۆ سبەینێ چوومە لای عەمیدەکە دوکتۆر جابیر عومەر بوو زۆر پیاوانەو بە سۆزەوە پێشوازیی لێکردم. هەر بەو جۆرەی مامۆستا باڵدار ووتبووی موناقەشە کەوتە نێوانمانەوە، دووایی ووتی: دە بچۆ لە (ئەوقاف)ەوە

نووسینێکم بۆ بێنە کە باوکت (مدرس)ە و پشتگیرییەکی (مەعاریف)یش بێنە. چوومە بەڕێوەبەریی گشتیی ئەوقاف. پێشتر لەگەڵ باوکم چووبووم دەیناسیم، بە چەند دەقیقەیەك ئەوەی ویستم بۆیان نووسیم. پاشان چوومە لای برادەری کۆنی باوکم (بکر مصطفى السالم) کە تێکۆشەرێکی کۆنو ڕووناکبیرێکی دیار بوو. لەگەڵ باوکمدا لە لوبنان پێکەوە لە نەخۆشخانە بووبوون. هەستا لەگەڵماو چووینە وەزارەتی (مەعاریف). لەوێ لە بەشی زاتیە (خۆیی) لای ئەحمەد زەنبووری کە لەمەودووا یەکمان ناسیو پیاوێکی باشو چەپ بوو. مامۆستا بەکر مەسەلەی تێگەیاندن. سەیری هەندێ دۆسیەی کرد. ووتی: بەڵێ لە سلێمانی تەنیا پێنج مودەڕیسو پێنج مزگەوت هەن، مەعاریف دانی پێیاندا ناوە بۆ ئەوەی فەقێیەکانیان نەگرێن بە سەرباز. یەکێکیان باوکتو مزگەوتەکەی ئەوە. ئیتر دۆم بێو کلاش بۆ خۆی بکا، نامەیەکی هۆنییەوە. یەکسەر چووم هەردوو نامەکەی ئەوقافو مەعاریفم دایە دەست دوکتۆر جابیر عومەر. ووتی: برۆ، هەفت نەبێ.

هەفتەی پێ نەچوو، لە لەوحەی ئیعلانەکانی کۆلێجدا، بە مۆری عەمید — بانگەوازێك بە ناوی منەوە نووسرابوو: (لەناو کوڕە مامۆستاکاندا وەرگیرای).

ئێستاش هەر بە ئەوازشەوە یادی ئەو چوار کەسە بەرێزە دەکەمەوە کە بوونە هۆی وەرگرتنمو دامەزراندنی ئەو پلەیەی ژیانم (باڵدار، مامۆستا بەکر، زەنبووری، د. جابیر عومەر).

لەپاڵ ئەم وەرگرتنەشدا قسەیەکی خۆش هەیە دەگێڕێتەوە.

کاك مستەفا سەعید (مامۆستاو بەڕێوەبەری لەمەودووای قوتابخانەی ناوەندیی هەڵەبجە -بە ناوبانگ بە مودیر- لەگەڵ ئێمەدا دەرچووبوو و پێشکەشی خانەی بەرزی مامۆستایانی کردبوو، کاك مستەفا ئەو ساو ئێستا هەر قسە خۆشبوو. لەو سەردەمەوە دۆستو هاوڕێی من بوو تا ئێستا -برایەتیی شیریشمان هەیە- هێشتا ئەنجامی ئەوان دەرنەچووبوو، وا من بە تەنیا وەرگیرام.

کاك مستەفا بە بەر لەوحەکەدا ئەهاتو ئەچوو و ئەهاتەوە بەردەم بەشی ئیدارەی کۆلێجەکەو جنێوی بە نووری سەعید دەداو دەیووت: باشە حوکمەتەکەی حوکمەتی مەلایە یا حکوومەتی پۆلیس، وا کوڕە مەلا یەکسەر وەردەگیرێ. منیش وەڵامم دەدایەوە:

-باشە باوکی تۆش فەقێ بوو و بۆ مەلایەتی دەیخوێند، ئێستاش هەر مەلا سەعیدی پێدەڵێن. کەچی ئێش ئەوەی ببێ بە مەلا بوو بە پۆلیس منو حکوومەت چی بکەین. ئەکەوتە وەڵام:

ووسبە، حیزبەکەی ئێمەش لە نووری سەعید باشتر نییە، ئەوە نییە لە هەموو بەیاننامەکاندا بەو حکوومەتە دەڵێ (حکوومەتی پۆلیسی) و ناڵێت حکوومەتی "موعەلیمو مەلا"؟.